■ دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی موکریانی
کوردستان ت «٢٢٢٩٩٩٢»

e.mail:mukriani@yahoo.com

■ کتێبی ژمارە: « ٦٧»

■ کتێب: کتێبی نالی

■ نووسینی: رێبوار سیوەیلی

■ بابەت: خوێندنەوەی تێکستی شیعر

■ دەرهێنانی هونەری: ئاوات خضر

■ بەرگ: قاسم قادر

■ تابلۆی بەرگ: پۆڵ کلێ (ئەرشیفی ماڵی شەرەفخانی بەتلیسی)

■ چاپی یەکەم: ٢٠٠١ - کوردستان

■ ژمارەی سپاردن : (٢٦٢)ی ساڵی ٢٠٠١ی دراوەتێ

■ تیراژ: ١٥٠٠ دانە

■ چاپخانەی : وەزارەتی پەروەردە

# ناوەڕۆک

بەدالی

# «هێرمێنۆتیکا»
# لە نێوان نەوەکاندا

ساڵی ١٩٨٦، کە ئەودەم لە رۆژهەڵاتی کوردستان، لە گوندی (گەرماو لە نزیک شاری بانە) ئاوارە بووین، پیاوێکم سەرلەنوێ ناسییەوە کە نۆزدە ساڵ بوو من کوڕی ئەو بووم و ئەویش تەمەنێکی لە چاوەڕوانیی گەڕانەوە بۆ گوندە سووتاوەکەی بەسەر بردبوو.

ئەو پیاوە شەوانە خەوی لێنەدەکەوت و هەمیشە چاوەڕوانیی گەڕانەوە بوو بۆ مەڵبەندی خۆمان، کە هەمووی سەعات و نیوێک لێمانەوە دوور و دەکەوتە ئەمدیو چیای (سوورکێو)ی بناری سیوەیل. ئەو شەوانە، من و ئەو پیاوەیان لە رێگەی خوێندنەوەی دیوانی «نالی»یەوە لێکدی نزیکخستەوە و من لە کەسایەتیی باوکمدا عاشقێکی دڵگەرم و شیعردۆست و لە خوداترس و نیشتیمانپەروەرم ناسییەوە، بەڵام ئەو بە پێچەوانەی زۆربەی عاشق و شیعردۆست و خوداناس و نیشتیمانپەروەرانەوە، خوێندەواریی نەبوو.

غوربەتی ئەم پیاوە بۆ شوێنی لەدایکبوونی خۆی، بۆ باخی نەمامی دەستنێژ و ژێر سێبەری دارگوێز و بەر خوڕەی کانیاوەکانی گوند و پاشان یادی مزگەوت و مەرقەدی پیاوچاکانی ئەوێ، لە خەمێکی قووڵ و گوێڕادێرانی بەردەوامدا بۆ رادیۆکانی جیهان رەنگی دابۆوە، بەونیازەی «خەبەرێکی دڵخۆشکەر» لەبارەی چارەنووسی نەتەوەی ئێمەوە بڵاوبکەنەوە. ئەو خەمە قووڵە، ئەگەر خوێندەواریی رێگر نەبایە، دەبوو جگە لە فرمێسک و پاڕانەوە لە یەزدان و گەلێ جاریش تووڕەیی و هەڵشاخان بەرەو رووی ئاسماندا، شیعری لێ بەرهەم هاتبا. وەلێ کاتێک نەخوێندەواریی رێگری سەرەکیی بوو لەبەردەم دەربڕینەکانی ئەودا، ئەوە پەنابردن بۆ گوێگرتن لە

شیعر و تەماهیکردن لەگەڵ دنیای شاعیراندا، تاقە ڕێگایەک بوو ئەو پیاوە بۆ هێورکردنەوەی ناخی خۆی پەنای بۆ دەبرد. من یەکەمجار گەلێک شیعری (نالی و مەحوی)م ئەوکاتانە بە وردی دەبیست، کە باوکم دوای نوێژکردن گۆشەیەکی بەرماڵەکەی بەلای خۆیدا هەڵدەدایەوە و دەکەوتە دۆعاکردن و موناجات و زەمزەمەکردنی بەیتە شیعرەکانی ئەو دوو کەڵەشاعیرە.

بەڵام هەڵەیەکی گەورەیە ئەگەر وا تێبگەین، هۆی پەنابردنی ئەو پیاوە بۆ دنیای شیعر، هەر تەنیا ئەوەبوو کە دوور بوو لە مەڵبەند و شوێن و جێگاورێگای خۆی. شیعر هەر تەنیا یادگارەکانی ئەوی لە ئاست نیشتیمان و گوند و سروشتی ناوچەکەدا هێور نەدەکردەوە؛ بەڵکو شیعرەکان خۆیان دەبوونە شوێنێ کە ئەو دەیتوانی بەو هاوڕێ و خۆشەویستانەشی بگاتەوە، کە دنیای شیعری (نالی)یان پێ ناساندبوو، دیارە لەپێش هەمووشیانەوە «مەلا فەرەج (شەکیب) و مەلا سەیید بیلالی کوڕی مەلا مووسای شابەدین».

بەو جۆرە، شیعری نالی بۆ باوکم، هەم شوێنێ بوو کە تیایدا تەعبیرێک هەبوو بۆ غوربەت و تەنیایی، هەم هێزێکیشی پێدەبەخشی بۆ بەزیندوویی ڕاگرتنی یادگارەکانی لەگەڵ ئەو دوو زاتەدا، کە زۆربەی شیعرەکانی هەر لەزمان ئەوانەوە، بەتایبەتیش لە زمان (مەلا سەیید بیلال)ەوە گوێ لێببوو. شیعری نالی ئەویان پەلکێشی دوو لا دەکرد: نیشتیمان و مرۆڤ، سروشت و بوون، خاک و فەنتازیا و بیرەوەری.

***

ئێستا کە پاش پتر لە سیازدە ساڵ تێپەڕین بەسەر یەکەم هەوڵدانمدا بۆ بەرهەمهێنانی تێگەیشتنێکی دیکە لەسەر دنیای نالی، بیر لە شیعرەکانی ئەم شاعیرە نەمرە دەکەمەوە، دەبینم ئەم شیعرانە هەمان ڕۆڵیان لە ژیانی مندا بینیوە کە لە ژیانی باوکمدا دیتیان: دیوانی نالی بۆ من لە ساڵانی تاراوگەدا، هەم شوێنێ بوو کە تیایدا تەعبیرم بۆ غوربەت و دووری لە نیشتیمانەوە دەدییەوە، هەم شوێنێکیش بوو کە تیایدا بەیادی ئەو شەوانەی

ڕۆژهەلاتی کوردستانەوە، یادەوەریی پیاوێک، مرۆڤێک، یان ڕۆحێکی مەزن بە زیندوویی دەمایەوە، کە ئیدی مەرگ راپێچی ناو زولمەتی هەمیشەیی قەبری کردبوو. منیش بەهەمان شێوەی باوکم تەنیا و چاوەڕوانکردوو، گوێ قولاخی رادیۆکانی جیهان بووم، تاکو خەبەرێکی دلخۆشکەر لەسەر چارەنووسی ئێمە بلاو بکەنەوە..

بەمجۆرەش ئەم کتێبەی دەیخوێنیتەوە ئەنجامی پەیوەندیی نێوان چەند مرۆڤە بە دنیای شاعیرێکەوە، کە هەم ئەو مرۆڤانە و هەم شاعیرەکەش بەچەندین فرسەخی زەمەنی لە یەکترییەوە دوورن، بەبێ ئەوەی ئەو شیعرانە نرخی خۆیان بۆ دنیای ئەو مرۆڤانە دۆڕاندبێ. لێرەوە شیعری نالی بۆتە شوێنی پێکەوەبوونێکی «شوێن/کات»بەزێن و چەندین نەوەی پێکەوە بەستۆتەوە، کە هەریەکەیان بەجۆرێ دنیای شیعری شاعیرەکەمان دەدوێنن و گفتوگۆی لەگەلدا ساز دەکەن.

بەلای هاوڕێکانی باوکمەوە، نالی مسولمانێکی ئیماندارو زمانشیرین بووە، کە جگە لە شیعر، شارەزایەکی وردی یەکێک بووە لە دەرسە بنەڕەتییەکانی هەر فەقێ و مەلایەکی ئەو سەردەمە، واتە دەرسی بەلاغەی عەرەبی (بەلگەشیان بۆ ئەمە قەسیدەکەیەتی لەوەسفی پێغەمبەر و ڕێگاوبانی حەج و سەرجەمی شیعرە دینییەکانی دیکەیدا و راستیشیان کردووە.) ئەوان نالییان لەو شوێنگە پەروەردەییەوە بینیوە کە سیستەمی خوێندنی حوجرە و فەقێیەتی پێی بەخشیون. بەلای باوکمەوە، نالی ئەو شاعیرە نیشتیمانپەروەرە هەستناسکە بوو، کە تەعبیری لە غوربەتی ناو ناخی ئەم دەکرد و ناچار کرابوو نیشتیمان و زێدی خۆی «شارەزوور و سلێمانی» بەجێ بهێلێت (بەلگەشی قەسیدەکەیەتی بۆ «سالم»ی هاوڕێی و ئەو شیعرانەی کە تیایاندا باسی شکۆداریی بابانییەکان دەکا و لەمەشدا جوانی پێکابوو). باوکم لە شوێنگەی خۆیەوە، وەک ئاوارەکراو و گوند سووتاوێک، تەماهی لەگەلّ غوربەت و ئاوارەیی نالیدا دەکرد و لە زمانی ئەودا هەستیاریی خۆی بەیان دەکرد. ئەوەتا منیش لەم کتێبەدا دەمەوێت

بەشێوەیەکی دیکە (نالی) بهێنمە زمان و لە دەقەکانیدا بۆ وەڵامی ئەو پرسیارانە دەگەڕێم کە پرسیاری ئێستای ئێمەن و بەڵگەکانیشم لەم کتێبەدا خستوونەتە روو کە ئەوەتا لەبەردەستایە.

***

لەنێوان ئەم سێ نەوەیە و ئەو سێ جۆر جەختکردنەوەیە لەسەر گرنگیی شیعری نالی، شتێکی هاوبەش هەیە کە «دەقی شیعرەکان» خۆیانن. شیعرەکان سنووری بازنەی چالاکبوونی ئێمەیان پێکهێنانەوە و دەکرێ جۆری چالاکییەکەی ئێمەش بە «لێکدانەوە و تەئویلکردن: یان بە هێرمینۆتیک»ی شیعرەکان ناوبەرین. واتە ئێمە هەموومان لەناو بازنەی هێرمینۆتیکای دەقی شیعریی شاعیرێکی مێژووییدا دەسووڕێینەوە و بەپێی هەلومەرج و ئاسۆی تێڕوانین و سەرقاڵبوونی خۆمان بە جیهانەوە، ئەو دەقانە دەهێنینە قسە و گفتوگۆیان لەگەڵ ساز دەکەین و بەو جۆرەش تێکەڵیان دەکەین بە دنیای خۆمان.

کەواتە خاڵێکی هاوبەش کە باسەکانی ئەم کتێبە پێکەوە گرێدەدات، بریتییە لە: **هەوڵدانێکی هێرمینۆتیکی بۆ بەدەنگهێنانی هەندێک لە دەقەکانی نالی و خۆشکردنی زەمینەیەکە بۆ پەیوەندی بەستن لەگەڵ گوتاری ناو ئەو دەقانەدا بەبێ خۆبەستنەوە بە «کات»ەوە.** بۆیە دەمەوێت لێرە بەدواوە کەمێ لەبارەی بەکارهێنانی مانای چەمکی(هێرمینۆتیک)، وەک ئەوەی لەم کتێبەدا بەکار هاتووە؛ روونکردنەوەی پێویست بدەم بەدەستەوە.

* * *

وشەی هێرمینۆتیک(یان: تەئویل) لە چاوگی «hermeneuin»ی گریکییەوە هاتووە، کە مانای تیۆری، یان هونەری تێگەیشتن و لێکدانەوە دەگەیەنێت و ئامانجی ئەم تیۆرییەش بریتییە لە ئیشکردن لەمانای تێکستێکدا بەمەبەستی هێنانە سەر زمانی خۆمان، رۆشنکردنەوەی

ماناکانی و شیکردنەوەی بەشێوەیەک کە ئیمکانی تێگەیشتنیمان هەبێت. لە بنەڕەتدا ئەم تیۆرییە لە کاتی ئیشکردندا لەسەر تێکستە کلاسیکییەکانی یۆنان و رۆم، بەمەبەستی هێنانەدیی «تێگەیشتنێکی *راستەقینە*» لەو تێکستانە، بەکارهاتووە. هەڵبەت ئێستاش هەر دەتوانین هێرمینۆتیک وەک «هونەری تێگەیشتن لە تێکستەکان» پێناسە بکەین. بەڵام لە کۆتایی سەدەی نۆزدە و بەدرێژایی سەدەی رابردوو، هێرمینۆتیک بووە ئاراستەیەکی تایبەتیی فەلسەفی و خاوەن میتۆدی سەربەخۆی خۆی.

**خاڵی یەکەم:** لە هەر کارێکی هێرمینۆتیکیانەدا، لێوردبوونەوە و پرسیارکردنێکی رەخنەییە لە شتێکی بەرجەستە، دیاردەیەکی بەرچاو، رەفتارێکی جەستەیی، یان دەقێکی دیار و ئاشکرای ئەوتۆ، کە بتوانین بە روونی بیخوێنینەوە و پەیوەندیی پێوە ببەستین. **من ناتوانم تەئویلی شتێک بکەم کە نەتوانم لە رێگەی هەستەکانمەوە شوناسی بکەم.** لەو حاڵەتەدا، یا باوەڕ (ئیمان)ی پێدەهێنم، یاخود تەئویلی دەکەم و بە پرسیار و گومانەوە رووبەرووی دەبمەوە: ئیماندارێکی یەهوودی، مەسیحی و مسوڵمان، دوای خوێندنەوەی تەورات و ئینجیل و قورئان، تەئویلی بوونی خودا ناکەن، بەڵکو یەکسەر باوەڕی پێدەهێنن و پێویستیان بە هیچ لێکدانەوەیەکی دیکە نییە لەو بارەیەوە؛ چونکە بوونی یەزدان لە لای ئەوان بوونێک نییە شوێنی پرسیارکردن بێت، بەڵکو بوونێکە یەقین هەڵگرە و مرۆڤیش پرسیار لە شتێک ناکات کە یەقینی هەبێت لە حەقیقەتی بوونی ئەو شتە. کەواتە تەئویلکردن بە پێچەوانەی باوەڕهێنانەوە، پرۆسەیەکە لەرێگەی هەست و تواناکانمانەوە لە پێناوی شوناسکردنی شتێک، دیاردەیەک یاخود دەقێکدا جێبەجێی دەکەین و روونکردنەوەکانمان (واتە: پرۆسەی تەئویلکردنەکەمان) بەهۆی خستنەرووی بەڵگە شیکاری و هەندێجار سەلمێنراوی پێویستەوە، دیاریی دەکەین. بەم پێیەش هێرمینۆتیک پرۆسەیەکی لێکدانەوەی فەلسەفی و عەقڵانییە و ناکرێت لەگەڵ دەرکی شهوودی و میتافیزیکییانەدا بۆ جیهان، تێکەڵی بکەین.

**خاڵی دووەم:** ئەوەیە لەم کتێبەدا وەک «مرۆڤێکی مێژوویی» مامەڵە لەگەڵ شاعیرەکەماندا کراوە و بەوجۆرەش نالی کەسێکی تایبەتی ناو قۆناغێکی تایبەتی کۆمەڵگای ئێمە بووە، کە بیروڕا و لێکدانەوەکانی خۆی لە چوارچێوەیەکی شیعریدا بەرجەستە کردوون. نالی نە فریشتەیەک بووە و نە قارەمانێکی ئەفسانەیی، بەڵکو مرۆڤێکی کوردی هەستیار بووە بەهەموو ئەو توانایانەی مرۆڤێکی کوردی هەستیار لەو قۆناغەی کۆمەڵگادا خاوەنیان بووە و توانیویەتی بەپێی ئیمکانییەتەکانی زمانی ئێمە خۆی دەرببڕێت. نالی وەک هەر مرۆڤێکی دیکەی زیندوو خاوەنی تێگەیشتنێک بووە و بە تێگەیشتنێکی تایبەت و حوکمی پێشینەشەوە رووبەرووی دیاردەکان بۆتەوە. واتە ئەو کەسێک بووە بە تێگەیشتنێکەوە لەبارەی ئەو دەوروبەرەوە ژیاوە، کە خۆی تێدا بینیوەتەوە و خاوەنی «جیهانبینی»یەک بووە. واتە ئەو مرۆڤێکی کراوەبووە لە ئاست جیهانێکی بەرجەستە و واقیعیدا. ئەم قسەیە پێمان دەڵێت: مرۆڤ هیچ کاتێ بێ مەرج و لێکدانەوە لە دنیادا ناژی، هەمیشە تێگەیشتنێکی پێشینەی لەسەر شتەکان هەیە و حوکمی پێشینەی بەسەردا داون. بەبێ ئەو حوکمە پێشینەییانە ناتوانین لە شت و دیاردە تازەکان، یاخود بۆ نموونە لە دەقە ئەدەبییە کۆنەکان تێبگەین. کەواتە هەرچەندە باسەکانی ئەم کتێبە بەوجۆرە بێنە پێشچاو، کە بیانەوێ لە کەسایەتیی نالی بلیمەتێکی (بانمرۆیی/فوق انسانی) و پەیامبەرئاسا دروستبکەن، ئەوە هێشتا تەئویلی ئێمە، بریتییە لە تەئویلکردنی کۆمەڵێ دەقی شیعری، کە زادەی توانا و هەستیاریی مرۆڤێکی کۆنکرێتی و مێژوویین. بەم مانایە لەم کتێبەدا «هێرمێنۆتیک» واتە ئەو جۆرە لێکدانەوەیەی کە کاراکتەری مرۆڤانە دەبەخشێتەوە بە شاعیرەکەمان، ئاسۆی لێکدانەوەکانی ئاشکرا دەکات و رووتی دەکاتەوە لە هەموو خەسڵەتێکی ئەفسانەیی و بان مرۆیی و پیرۆزمەند.

**خاڵی سێهەم:** ئەوەیە بگوترێ: لە بەرهەمی هەر مرۆڤێکی مێژوویيدا، ئاستێکی لێکدانەوە و تێگەیشتن و دواجار دەربڕین ئامادەیە، کە مۆرکی فیکری، ئەدەبی، فەلسەفی و ئێستاتیکی و ئایینیی سەردەم و ژینگەی خۆیانیان هەڵگرتووە. بۆیە هەر تەئویلکردنێک بۆ ئەو بەرهەمانە کە ڕۆڵی فیکر و ئەدەب و فەلسەفە و جوانی و ئایین بەکەم بگرێت و بیەوێت شاعیر دابڕ بکات لەو سیاقە مێژوویيەی کە تیایدا پەروەردە بووە، سیمایەکی تاکڕەهەند و ئەنجامگیرییەکی ئاراستەکراومان پێشکەش دەکات، کە دەیەوێ خەسڵەتێکی ئینسانی لەو شاعیرە بستێنێتەوە. لێرەشەوە سنوورێک هەیە لە نێوان «تەئویلی کراوە» و «تەئویلی داخراو»دا: یەکەمیان خەسڵەتێکی نەمر و زیندوو دەبەخشێتە ئاسۆی دەق و دووەمیشیان خەسڵەتێکی ئایدیۆلۆژیی دەداتێ. یەکەمیان ڕێخۆشکەری دەکا بۆ ئەوەی دەق خۆی بێتە زمان و لە هەر زەمەنێکدا بە ئازادی قسەی خۆی بکات؛ دووەمیشیان دەق ناچار دەکا بەپێی هەلومەرج و بەرژەوەندییەکانی هەنووکە، ئەو قسانە بکات کە خزمەتی ئایدیۆلۆژیایەکی دیاریکراو دەکەن، جا ئەو ئایدیۆلۆژیایە ئەدەبی، فەلسەفی، ئێستاتیکی یاخود ئایینی بێت. کەواتە هەر تەئویلێک کە بیەوێ لەسەر ئاستی شیعرەکانەوە، تەنیا وەک «ناسیۆنالیستێک»، وەک «مسووڵمانێک» یان وەکو «یاخییەک» نالیمان پێ بناسێنێ، تەئویلێکی داخراوە و دەیەوێت خەسڵەتی مرۆڤێکی هەستیار لەم شاعیرە وەربگرێتەوە، کە مرۆڤێکی کراوە بووە بەرووی جیهاندا و دنیای لە فرەڕەهەندیدا ئەزموون کردووە. وەلێ بە پێچەوانەوە، هەر تەئویلێک کە بیەوێت شیعرییەتی بەرهەمەکانی نالی و تایبەتمەندیی ڕەنگاورەنگی ئەو بەرهەمانە وەک بەرهەمی ئیبداعی بخوێنێتەوە، تەئویلێکی کراوەیە و بەدوورە لە بەئایدیۆلۆژیکردنی شیعر. تەئویلی کراوە، واتە خۆئامادەکردن بۆ وازهێنان لە حوکمە پێشینەکانمان و قەبووڵکردنی تێگەیشتنی پاڵێوراوتر و نوێتر لەسەریان.

**خاڵی چوارەم:** وەختێک نەمانەوێت تەئویلێکی داخراو بۆ دەق بکەین، ئەوە زیاد لە ڕێگایەک و زیاد لە میتۆدێکمان هەیە بۆ چوونەناو جیهانی ئەو دەقەوە. هێرمینۆتیک، واتە گرتنی زیاد لە ڕێگایەک بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانی دەق و لەم ڕێگەیەشەوە بۆ «بەردەوامی»بەخشین بە ژیانی ئەو دەقە. لێرەدا زەمەنی بەرهەمهاتنی دەق و زەمەنی خوێندنەوەی دەق تێکەڵ بەیەکتر دەبن و ئاسۆی ڕوانینیان بەرەو ڕووی یەکدی دەبنەوە. هانس جۆرج گادامێر ئەمە بە «یەکانگیربوونەوەی ئاسۆکان» ناو دەبات، چونکە بەوەی ئاسۆی تێڕوانین و حوکمەکانی من ڕووبەڕووی ئاسۆ و حوکمەکانی دەقێکی دێرینە ببنەوە، بۆم دەردەکەوێ کە لێکدانەوەکانی من سنووردارن و ناچار دەبم بیر لە گۆڕینیان بکەمەوە و پرسیاری نوێ بهەژێنم. بەم پێیەش «دووری» و «کۆنیی» زەمەنی سەرهەڵدانی دەق و «تازەیی» و «نزیکیی» زەمەنی خوێندنەوەکەی نابنە پارسەنگ بۆ بایەخپێدان و کەمبوونەوەی گرنگییەکەی. لە هەموو دەقێکی «دوور» و «کۆن»دا، هێندە بایەخ و گرنگیی هەیە، کە ئەوە بێنێت «تازە بەتازە» و لەم «نزیکەوە» بەدەنگی بهێنین و «ئێستایەکی هاوبەش»ی لەگەڵدا دروستبکەین تاکو شتێک دروست ببێت کە ناوی «بەردەوامی»یە.

**بەمانایەکی دیکە:** لەم کتێبەدا بەوجۆرە بیر لە دەقی ناڵی کراوەتەوە، کە پێوستییەکن، ئێمە ئێستا و هەنووکە لە ڕابردووەوە وەریاندەگرین بۆ بەردەوامیی خۆمان لە ئایندەدا. بۆ ئەوەی ئەم ڕۆڵە بە دەق ببەخشین، دەبێت بە شێوەیەکی کراوە بیخوێنینەوە و تەئویلی بکەین و سوود لە هەموو، یان بەشێکی زۆری ئەو ئیمکانییەتە ڕەخنەیی و مەعریفییانە وەربگرین کە لە ئامانجەکانی دەق نزیکمان دەخەنەوە، زۆرترین قسە بە دەق دەکەن و ئاسۆی بیرکردنەوەی ئێمەش بەرفراوان دەکەن. پۆڵ ڕیکۆر لەم بارەیەوە دەڵێت: ئامانجی هەر تەئویلێک زاڵبوونە بەسەر ئەو دووری و مەودایەدا کە لەنێوان ئەو قۆناغە کەلتوورییە جیاوازانەدا هەن، کە دەق و لێکدەرەوەی دەق لێوەی سەریان هەڵداوە. تەئویلکەر بەهۆی سەرکەوتن بەسەر ئەم مەودایەدا، واتە بە

خۆخستنە رۆژگاری دەقەوە، دەتوانێت مانای دەق بکاتە هی خۆی. واتە ئەو غەریبەیەک ئاشنا دەکات و دەیکاتە بەشێ لە خۆی. کەواتە ئەوەی لێکدەرەوە لە رارەوی تێگەیشتنی ئەوانیترەوە بۆی دەگەڕێت، بریتییە لە تێگەیشتنێکی زیاتر لە خودی خۆی. بەم پێیەش: هەر تەئویلێک، بەشێوەیەکی راشکاو یان شاراوە، بریتییە لە تێگەیشتن لە خود لە رێگەی تێگەیشتن لە «ئەوانیتر»ەوە.

کەواتە **خاڵی پێنجەم**: ئەوەیە کە بگوترێ: هەر بەتەنیا دەق قسان ناکات، بەڵکو ئێمەش لە بواری دەقەکانەوە دێینە قسەکردن: ئێمە لە ئاسۆی بیر و سنوورەکانی هزری خۆمانەوە تەئویلی دەقەکان دەکەین و بە رووناکایی تێڕوانینەکانی خۆمان رووناکیان دەکەینەوە. ئەوە هەر تەنیا رووناکایی دەق نییە هزر و خەیاڵی ئێمە رۆشن دەکاتەوە، بەڵکو ئەوە رووناکایی ناو خەیاڵ و ئەندێشەکانی ئێمەیشە کە بەسەر تاریکاییەکانی دەقدا دەڕژێت و پەخش دەبێتەوە. چەندە دەقەکان هی داهێنەرەکانیانن، ئەوەندەش هی خوێنەرەکانیان، بۆیە هەر خوێندنەوەیەکی کراوە بۆ دەق، بەرهەمهێنانی دەقێکی کراوەیشە و پرۆسەیەکی دیموکراتییانەی ئیشکردنی مەعریفی و ئێستاتیکیی رەخنەییە لە بواری ئەدەب و رۆشنبیریدا.

لێرەشەوە، بێمانایە لەبواری رەخنەی ئەدەبی و تەئویلکردنی شیعریدا ئیدیعای«خوێندنەوەی بابەتییانە»بکەین. چەمکی «خوێندنەوەی بابەتییانە» ئەو چەمکە خەڵەتێنەرەیە کە لەبواری لێکۆڵینەوە ئەکادیمییەکانی ئێمەدا لەبەر دوو هۆی سەرەکی زۆر دووبارە دەکرێتەوە: یەکەم: بۆ شاردنەوەی قسەی لێکۆڵەرەوە و راکردن لەهەر بەرپرسیارییەک لەئاست دەقی ئەدەبییدا، بۆ ئەوەی دواجار پێمان بڵێت: «ئەوەی لە لێکۆڵینەوەکەدا هاتووە قسەی شاعیر خۆیەتی و ئەم دەخلی نەبووە و *بابەتییانە* لێیکۆڵیوەتەوە». دووەم لەپێناوی شاردنەوەو داپۆشینی ئەو راستییەی کە دەریدەخات، لە واقیعدا لێکۆڵەرەوەکەمان هیچ قسەیەکی *لەسەر* ئەدەب و *ماددەی لێکۆڵینەوەکەی*

*نییە و نایەوێت لە ئەنجامی رووبەڕووبوونەوەی لەگەڵ ئاسۆی دەقێکدا دەست لە حوکمە پێشینەکانی هەڵبگرێت و تێگەیشتنێکی نوێ بەرهەم بهێنێت.* لێکۆڵینەوەی زۆر لەسەر ژیانی شاعیرانمان و کردنی ئەمە بە «دەرسێکی ئەکادیمی» لە کۆلێژدا بۆ وردوخاشکردنی زەوقی ئەدەبیی قوتابییانی ئێمە، خۆی لە خۆیدا راکردنە لە هەر جۆرە رووبەڕووبوونەوەیەکی جیدیی لەگەڵ دەقی شیعرماندا و خۆبەستنەوەیەکی وشکە بە حوکمی پێشینەوە لەسەر یەک تێگەیشتن بۆ ئەدەب. هەروەها دەرهێنانی ئەکادیمیانەی «گوڵ لە شیعری نالی»دا و لێکدانەوەی تەعبیری «کانییەکی روون» لە شیعری گۆراندا بەوەی کە «لە کوردستان دەریا نییە بۆیە گۆران وشەی کانیی بەکارهێناوە»، کۆمیدیایەکە مەگەر تەنیا لە زانکۆکانی کوردستاندا ناوی «لێکۆڵینەوەی ئەکادیمی» و «بابەتییانە» و «زانستی»ی لێبنرێت. بۆیە هێرمینۆتیکا و هەر تەئویلێکی جیدیی بۆ بەرهەمی ئەدەبی، لەهەمان کاتدا کە رووبەڕووبوونەوەیەکی شەخسییە لەگەڵ دەقدا، هێندەش زیاتر خۆ دروستکردنێکی شەخسییە لە رێگەی دەقەوە. لەو کاتەوە کە دەقێک تەئویل دەکەین، وەکو کەسێکی زیندوو دێینە قسە و ئەوەی دەیڵێین لێکدانەوەی تاکەکەسیی ئێمەیە چونکە ئێمە لە زماندا تەئویل دەکەین و زمانیش ئێمەین.

**خاڵی شەشەم:** لە ئیشکردنی هێرمینۆتیکییانەدا، بریتییە لە روناککردنەوەی سەرجەمی دەقێک بەهۆی «بەشە پێکهێنەرەکانییەوە» و رۆشنایی خستنەسەر بەشە پێکهێنەرەکانی دەقێک بەهۆی «سەرجەم»ی دەقەکەوە: کاری من لەم بەرهەمەدا ئەوە نەبووە، لە پێناوی تێگەیشتن لە شیعرێکی نالی، تەنیا خۆم ببەستم بە لێکدانەوەی مانای تاکە وشەیەک، یان دێڕێک یاخود هێمایەک بە جیا جیا؛ چونکە ئەمە ناچاریدەکردم «فەرهەنگی وشە» بۆ شیعری نالی ساز بکەم. بە پێچەوانەشەوە، ئیدیعای ئەوەناکەم بەبێ تێگەیشتن لە بەشە پێکهێنەرەکانی هەر قەسیدەیەک بتوانین

لە کۆی قەسیدەکە تێبگەین. بۆیە دەبێت دان بەوەدا بنێم، کە بۆ تێگەیشتن لە بەشە پێکهێنەرەکانی شیعری نالی، گەلێک منەتباری لێکدانەوە ورد و پڕ حەوسەڵەکانی مامۆستایانی «مودەڕیس»م، بەڵام بۆ بەرهەمهێنانی مانای گشتیی دەقی نالی، ڕێگایەکی تەواو جیاوازم گرتۆتە بەر و ویستوومە بەشێوەیەکی دیکە گفتوگۆ لەگەڵ دەقەکاندا بکەم. لەم کارەدا سوودم لە هێرمینۆتیکای فەلسەفی، وەک هەڵبژاردنێکی شەخسی لە زماندا وەرگرتووە، بەجۆرێ کە لەیەک کاتدا زمان ببێتە رووناککەرەوەی دەقێکی کۆن و لەهەمان کاتیشدا رووناکایی ئیمکانییەتە رۆحی، کەلتووری، جوانناسی و فیکری و رەخنەییەکانی خۆیشم پەرچ بکاتەوە. مەبەستم نەبووە لە رێگەی هەندێ لێکدانەوەی فەلسەفی و فیکرییەوە، کەسایەتیی فەیلەسووف و بیریارێک لە نالی دابتاشم، بەڵکو ویستوومە فیکر و لێکدانەوەی فەلسەفی بخەمە خزمەت بەدەنگهاتنی شاعیرێکەوە لەسەردەمی ئێستاماندا. بێگومان ئەمەش پێچەوانەی ئەو مامەڵەیەیە کە مێژووی ئەدەب لەگەڵ نالی و شیعرەکانیدا کردوویەتی و تەنیا وەکو بەشێک لە رابردوو ئاوڕی لێداونەتەوە.

**خالی حەوتەم:** هێرمینۆتیکای فەلسەفی، چ وەکو تیۆری و چ وەک هونەری تێگەیشتن لە دەق، پرۆسەیەکی جیاوازی قەبووڵکەرە، پێشبینیی مەرگی لێکدانەوەکان و بەتاڵبوونەوەی تەئویلی نوەکان دەکات، بەڵام مانای دەق بە کراوەیی دەهێڵێتەوە: هاوڕێکانی باوکم نالییان بە زمانشیرین ناو بردبوو و لەبەر رۆشنایی پرنسیپە بەلاغییەکانی حوجرە و سیستەمی خوێندنی مەلایەتیدا ماناکانیان لێکدابوونەوە. باوکم لەگەڵ ئەو ئیمانە قووڵەشیدا بە دین و تەفسیری ئایینی، متمانەی بە تەئویلی هاوڕێکانی بۆ دەقی نالی نەبوو. هێشتا نەیتوانی خۆی لە تەئویلێکی شەخسی رزگار بکات و بارودۆخی ئاوارەیی و دڵشکانی خۆی تێکەڵ بە لێکدانەوەکانی نەکات، چونکە ئەو لە شوێنگە و لە ئاسۆی تێگەیشتنی خۆیەوە تێکەڵ بە شیعرەکان

دەبوو، ئەو نەیدەتوانی «بابەتییانە» بیر بکاتەوە. دڵنیاشم ئەم لێکدانەوانەی لێرەدا من بۆ شیعری نالیم کردوون، لەلایەن کەسانێک و لە ئاسۆی قۆناغێکی دیکەی فەرهەنگییەوە، نیشانەی پرسیاریان دەچێتە سەر و سەلماندن و بەڵگەکانیان پووچ دەکرێنەوە و کەسێکی دیکە دێت بەجۆرێکی جیاواز «نالی» دەدوێنێ. بەڵام ئەوەی بە نەگۆڕی دەمێنێتەوە، بریتییە لە خاڵی هاوبەشی نێوان هەمووومان: واتە «دەقی شیعرەکانی نالی»، ئەو دەقانەی بە تێپەڕینی زەمەن و گۆڕانی ئاسۆ فەرهەنگی و مێژووییەکان بەردەوام بیرمان دەخەنەوە، کە شتێک هەیە بەناوی «دەقی کراوە» و «ئازادیی تەئویلکردن» وەک ئیمکانێک بۆ ژیانێکی ئازاد و ئازادییەکی هەمیشەیی لە ڕێگەی وازهێنانی بەردەوام لە حوکمە پێشینەکان و لە پێناوی کرانەوە لە ئاست جیهانی دەوروبەرمان و بۆ تێگەیشتنی تازەتر لە خۆمان. ڕەنگە هەر ئەمەش بێت پاڵنەری سەرەکیی نووسینی بابەتەکانی ئەم کتێبە، چونکە شیعری کراوە دەعوەتێکی هەمیشەییە بۆ خۆناسین و دەربازبوون لە سنوورەکانی ڕەقهەڵاتن، بەو جۆرەش دەعوەتە بۆ ڕزگاربوون و ڕێگایەکە بۆ گەیشتن بە ئازادی لە بیرکردنەوەدا کە بەردی بناخەی ژیانێکی ئازادانەیە.

* * *

سەبارەت بە چاپ و بڵاوکردنەوەی ئەم باسانە لەیەک بەرگدا منەتباری گەلێ کەسم، کە بەشێوەی جۆراوجۆر ئەرکیان کێشاوە، سوپاسی هەموویان دەکەم و نموونەیان زۆر بێت..

**ر. س**

**٢٠٠١/ هەولێر**

سەرچاوەکانی ئەم بەراییە:


- Jesper G & Martin M. : Hermeneutik. En antologi om forståelse. Gyldendal, København: 1999.

- Poul Lubcke (red.): Vor tids filosofi II. Politikens Forlag, København: 1988.

- Hans Fink: Menneske, Samfund, Natur. Gyldendal, København: 1993.

- بابک احمدی، م. مهاجر، م. نبوی: هرمنوتیک مدرن، گزینهء جستارها، مرکز، تهران: ١٣٧٧.

# هەندێ ڕوونکردنەوەی پێویست

**یەکەم:** ئەم باسە بە نێوی (چەمکی میتۆلۆژیا و جیهانبینیی شیعریی مەلا خدری نالی)یەوە پێشکەش دەکرێ. ئەمەش بەو مانایەی دەمانەوێت ڕەگەزی میتۆلۆژیا لەجیهانبینیی شیعری نالی- دا بکەینە تەنگوچەڵەمەی لێکۆڵینەوەکەمان، تا بتوانین هەندێ پرسیار ئاراستەی لایەنە جیاوازەکانی شیعری نالی بکەین.

مخابن، مەبەستمان وەڵامدانەوەی پرسیارەکان نییە، هێندەی مەبەستە چۆن پرسیارەکان دابڕێژین. دیارە وەدیارخستنی لایەنی «میتۆلۆژی» لە جیهانبینیی شیعری نالیدا، ناچارمان دەکات هەڵوێستەیەک لە ئاست چەمکی میتۆلۆژیادا بکەین، کە ڕەنگە بەلای هەندێ کەسەوە کارێکی زیادە بێت. ئەمەش تارادەیەک دروستە، چونکە لە زمانی کوریدا بە میتۆلۆژیا دەگوترێ ئەفسانە. ئەفسانەش «خورافیات و پڕوپوچی و درۆ و بیروڕای گشتی چاخە دێرینەکانی ناعەقلانیەتی بیری مرۆڤ»مان دێنێتەوە یاد! بێگومان ئەمەش بۆ خۆی پێویستی بە توێژینەوەی گرنگ هەیە تاکو ڕەهەندی هەر یەکێک لەو زاراوانە بە ڕوونی و لەسەر بنەمایەکی زانستی ئاشکرا بکات.

پەیوەندیی چەمکی میتۆلۆژیا بە باسەکەی ئێمەوە، لەوەدا نییە بەرپەرچی ئەو بیروڕایانە بدەینەوە، یاخود زیادەیەکیان بخەینە سەر، بەڵکو پەیوەندییەکە لەئاستی بە تەنگوچەڵەمەکردنی بینینی نالی لە چوارچێوەیەکی میتۆلۆژیدا خۆی دەنوێنێ. دیارە بۆ ئەو مەبەستەش بەر لە هەموو شتێک ناچارین پێناسەی میتۆلۆژیا بکەین.

**دووەم:** مەبەستمان لە چەمکی میتۆلۆژیا زیاتر کۆسمۆسی بوونی (الکونیه) ئەم چەمکەیە، نەک میتۆلۆژیای کورد. وەرگرتنی ئەم چەمکە بەو شێوە فراوانە بواری ئەوەمان دەداتێ تاکو لە ئەزەلییەتی جیهانبینی و نائاگایی بەکۆمەڵی مرۆڤی کورد تێبگەین کە نالی بە جوانترین و ئاشکراترین شێوە دەربڕیەتی و دەکرێ بە کۆی بیرەوەرییە دێرینەکانمان ناوی بەرین، ئەو بیرەوەرییانەی زانستی «ئەسڵ و فەسڵ»مان پێکدەهێنن و پەیوەندیان بە رووداوە ئەزەلی و ئەفسانەییەکانەوە، لە ئاستێکی پیرۆزدا دەپارێزن.

**سێیەم:** بە مەبەستی ئاشکراکردنی زەمینەی نائاگایی بەکۆمەڵی کورد (کۆنەستی کورد)، کە نالی لە شیعردا دەریبڕیوەتەوە و هەروەها لەپێناوی ئاشکراکردنی هەندێ لایەنی بیری کۆسمۆسی کورد -دا، کە بەشێوەیەکی رەمزی خۆیان دەنوێنن، بەشی دووەمی ئەم باسە بۆ لێدوان لە رەگەزە میتۆلۆژییەکانی بنەماڵەی (بابان)و بەمیتۆلۆژیکردنی دروستبوونی شاری (سلێمانی) تەرخان دەکەین. بنەماڵەی بابان وەک ئاکامێکی شارستانیەتی کورد، رۆڵێکی گرنگ لە ناخودئاگای مرۆڤی کورددا دەگێڕێت و ئەمەش لە هەندێ میتۆلۆژی و داستانی کوردیدا بە روونی دەبینرێ.
هەروەها دروستبوونی شاری سلێمانی وەکو پێویستییەکی مانەوەی بنەماڵەی نێوبراو لە ساڵی ١٧٨٤داو هەوڵی مرۆڤی کورد بۆ بە میتۆلۆژیکردنی ئەم پرۆسەیە و دابڕکردنی لە «سەردمی، یاخود زەمەنی مێژوویی» گرنگیی تایبەتیان هەیە لە ئاست جیهانبینی (نالی)دا.

**چوارەم:** ئێمە بۆ ئەوەی لەدنیای بەرینی شیعر و ئەندێشەی نالیدا سەرگەردان نەبین، تەنیا قەسیدەی (قوربانی تۆزی رێگەتم ئەی بادی خۆش مروور...) دەکەینە بڕبڕە پشتی باسەکەمان. ئەم هەڵبژاردنەش هۆی تایبەتی و گشتیی خۆی هەیە، کە پاشان دەستنیشانیان دەکەین، بەڵام بە

مەبەستیشەوە بەم کارە هەڵدەستین، تا سەرنجی خوێنەری کورد بەشێوەیەکی دی بۆ ناوەڕۆکی قەسیدەکەی (نالی) رابکێشین. هیوادارم مەبەستمان پێکابێت.

**پێنجەم:** لەم باسەدا زۆر جار هەندێ رستە و چەمکی هاومانا دووبارە دەبنەوە، ئەم کارەمان بە ئاگاییەوە کردووە و مەبەستمان لەم دووبارە کردنەوانە زیاتر گرنگیی ئەو چەمکانەیە لە باسەکەدا. هەروەها مەبەستمان نەبووە لەسەرجەمی باسەکەدا خاڵێکی هاوبەش بدۆزینەوەو ئەنجام و بەرهەمێک بۆ ئەو خاڵە لەبەرچاو بگرین. بە پێچەوانەوە هەوڵی ئەوەمان داوە لە گۆشەنیگای جیاوازەوە سەرنجمان ئاراستەی لایەنەکانی ئەندێشەی نالی بکەین، دڵنیاشین لەوەی تێبینی و شیکردنەوەکان پێویستیان بەدەوڵەمەندکردنی زیاتر هەیە.

# دەقی قەسیدە تاراوگەییەکەی نالی

(١)

قوربانی تۆزی ڕێگەتم ئەی بادی خۆش مروور!
ئەی پەیکی شارەزا بە هەموو شاری (شارەزوور)!
ئەی لوطفەکەت خەفییو هەوا خواه و هەمدەمە!
وەی سروەکەت بەشارەتی سەر گۆشەیی حوضوور!
ئەی هەم میزاجی ئەشکی تەڕ و گەرمی عاشقان:
طۆفانی دیدەوو شەرەری قەلبی وەک تەنوور!
گاهێ دەبی بە ڕەوح و دەکەی باوەشێنی دڵ
گاهێ دەبی بە دەم دەدەمێنی دەمی غوروور
مەحوی قەبووڵی خاطری عاطر شەمیمتە
گەردی شیمال و گێژی جەنووب و کزەی دەبوور

(٢)

سووتا ڕەواقی خانەیی صەبرم، دڵ و دەرون
نەیماوە غەیری گۆشەیی ذیکرێکی یا صەبوور
هەم هەم عەنانی ئاهم و، هەم هەم ریکابی ئەشک
ڕەحمێ بەم ئاه و ئەشکە بکە، هەستە بێ قوصوور
وەک ئاهەکەم دەوان بە هەتا خاکی کۆیی یار
وەک ئەشکەکەم ڕەوان بە هەتا ئاوی (شیوەسوور)
بەو ئاوە خۆت بشۆ لە کودووراتی سەرزەمین
شاد بن بە وەصلی یەکدی: کە تۆی طاهیر، ئەو طەهوور

(٣)

ئەمجا مەوستە تا دەگەییە عەینی (سەرچنار)

ئـاوێـکـە پـڕ لـە نـار و چـنـار و گـــــــوڵ و چـنـوور
چەشـمـێکە مـیـثلی خـۆر کـە لە صـەد جێ، بە ڕۆشنی
فـــەورانی، نووری صـــافـــە لەسـەر بەردی وەک بلوور
یا عـــەکـــسی ئاســـمـــانە لە ئـاوێنەدا کــــەوا
ئەســـتـــێـــرەکـــانی ڕابکشـــێن وەک شـــەهابی نـوور
یا چەشـــمـــەســـاری خـــاطری پڕ فـــەیضی عـــاریفـــە
یەنبـــــووعی نـووره دابڕژێنـێ لە کـــــێـــــوی طوور
دەم وت دو چاوی خـۆمـە ئەگـەر (بەکـرەجۆ)یی ئەشک
نەبوایە تیـــژ و بێ ثەمـــەر و گـــەرم و ســـوێر و ســـوور

(٤)

داخڵ نەبی بە عــەنبـەری ســـارایی (خـــاک و خـــۆڵ)
هەتا نەکـــەی بە خـــاکی (ســـولەیمانی)یا عـــوبوور
یەعنی ڕیاضی ڕەوضـــە کـــە تێـــدا بە چەند دەمێ
مـوشکێن دەبێ بە کـاکـۆڵی غـیلمـان و زوڵفی حـوور
خـــاکی مـــیـــزاجی عـــەنبـــەر و، داری ڕەواجی عـــوود
بەردی خـــەراجی گـــەوهەر و، جـــۆباری عـــەینی نـوور
شـــامی هەمـــوو نەهار و، فـــوصـــوولی هەمـــوو بەهار
تۆزی هەمـــوو عـــەبیـــر و، بوخـــاری هەمـــوو بوخـــوور
شـــارێکە عـــەدل و گـــەرمـــە، لە جـــێگێکە خـــۆش و نەرم
بۆ دەفـــــعی چاوەزاره دەڵێـن شـــــاری شـــــارەزوور
ئەهلێـکی وای هەیە کـــــە هەمـــــو ئەهلی دانشن
هەم نـاظیـــمی عـــوقـــودن و هەم نـاظیـــری ئومـــور
ســـەیرێ بکە لە بەرد و لە داری مــــەحـــەڵلەکــــان
دەورێ بدە بە پرسش و تەفـــتـــیش و خـــوار و ژوور
داخـــۆ دەروونی شـــەق نەبووه (پردی ســـەرشـــەقـــام)؟!

پیـر و فـوتاده تەن نەبووە (داری پیـرمـە سـوور) ؟!
ئێستـەش بە بەرگ و بارە عـەلەم داری (شێخ هەباس) ،
یا بێ نەواوو بەرگـە گـەڕاوە بە شـەخسـی عـوور؟!
ئایا بە جـەمع و دائیـرەیە دەوری (کـانـی با) ،
یاخـۆ بووە بە تەفـریقـەیی شـۆڕش و نوشـوور؟!
(سەیوان) نەظیری گونبەدی کەیوانە سەبز و صاف،
یاخـۆ بووە بە دائیـرەیی ئەنجـومـی قـوبوور؟!
ئێسـتـەش مـەکـانی ئاسکەیە (کـانیی ئاسکان) ،
یاخـۆ بووە بە مـەلعـەبەیی گـورگ و لوورەلوور؟!
ئێستـەش سوروشکی عیشقی هەیە (شیوی ئاودار) ،
یاخـۆ بووە بە صـۆفـیـیی وشکی لە حـەق بەدوور؟!
داخـۆ دەروونی صـافـە، گـوڕەی مـاوە (تانجـەرۆ) ،
یاخـۆ ئەسـیـری خـاکـە بە لێـڵی دەکـا عـوبوور؟!

(٥)

سـەیرێکی خـۆش لە چیـمـەنی ناو (خـانەقـا) بکە
ئایا ڕەبیـعی ئاهـووە، یا چایری سـتـوور؟!
سـەبزە لە دەوری گـوڵ تەڕە وەک خـەططی روویی یار
یا پوشی وشک و زوورە وەکـو ڕیشی (کاکـە سـوور) ؟
قـەلبی مـونەوورە لە حـەبیـبـانی نازەنین،
یاوەک سـەقـەر پڕە لە ڕەقـیـبـانی لەندەهوور؟
دەس بەندیانە دێن و دەچن سـەرو و نارەوەن،
یا حـەڵقـەیانە صـۆفـیـیی مل خـوار و مـەندەبوور؟
مـەیلێ بکە لە سـەبزە درەخـتـانی مـەدرەسـە:
ئەوراقـیـان مـوقـەددیمەیی شـینە یا نە سـوور؟
حـەوزی پڕی کـە نائیـبی دیدەی منە لەوێ،

لێـلاوی دانەهاتووە وەک سـەیلی (شـیـوەسـوور) ؟
ئێستەش کەناری حەوشەکە جێی باز و کەوشەکە،
یاریی تیـایە، یا بووەتە مەعرەضی نوفـوور؟
چاوێ بخـە لە سـەبزەوو سـێـرابی دائیـرە
جێ جـیلوەگـاهی چاوەکـەمـە نەرمـە یا نە زوور؟
توخوا فـەضایی دەشتی فـەقـێکان ئەمێسـتەکـەش
مـەحشـەر میـشـالە یا بووەتە (چۆڵی سەلم و توور) ؟

(٦)

واصـیـل بکە عـەبیـری سـەلامم بە حـوجـرەکـەم
چیی مـاوە چیی نەمـاوە، لە هەیوان و تاق و ژوور؟
ئەو غـاری یارە ئێسـتـە پڕ ئەغـیـارە، یا نە خـۆ
هەر غـاری یارە، یا بووەتە غـاری مـار و مـوور؟

(٧)

زارم وەکـو هیـلال و نەحـیـفم وەکـو خـەیاڵ!
ئایا دەکـەومـە زار و بە دڵدا دەکـەم خـوطوور؟!
لەم شـەرحی دەردی غـوربەتە، لەم سـۆزی هیـجـرەتە
دڵ ڕەنگە بێ بە ئاو و بە چاوا بکا عـوبوور!

(٨)

ئایا مـەقـامی ڕوخـصـەتە لەم بەینە بێـمـەوە،
یا مەصڵەحەت تەوەققوفە تا یەومی نەفخی صوور؟
حـاڵی بکە بە خـوفـیـە: کـە ئەی یاری سـەنگ دڵ
«نالی» لە شـەوقی تۆیە دەنێـرێ سـەلامی دوور...

## بەشی یەکەم:

# چەمکی میتۆلۆژیا

تا سەدەی نۆزدەیەم و سەرەتای ئەم سەدەیە لێکۆڵەرەوەکان لە باسکردنی میتۆلۆژیادا شێلگیر نەبوون و ئەم زاراوەیەیان بە مەبەستی جیاواز بە کاردەهێنا. لە گشت ئەو بەکارهێنانانەشدا روخسارێکی نێگەتیڤانە دەبینرا کە میتۆلۆژیای لە بابەتی «خەیاڵپڵاو» و «رووداوی هەڵبەستراو» نزیک دەخستەوە. بەڵام لە سەرەتای ئەم سەدەیەوە، چەمکی میتۆلۆژیا، وەکو سەرچاوەیەکی بە نرخ بۆ ناسینەوەو هەڵسەنگاندنی «بیر و رەفتاری مرۆڤی کۆن» سەرنجی لێدرا، بە هەمان دید و بۆچوونەوە شیکردنەوەی لەسەر ئەنجام درا، کە لێکدانەوەی هزر و تێگەیشتن لە ئاوەزی مرۆڤی کۆن خوازیاری بوو.

راستە لە سەدەی بیستەمدا چەمکی میتۆلۆژیا برەوی جارانی خۆی سەندەوەو لەبواری شیکردنەوەی کۆمەڵایەتی، ئاینی، دەروونشیکاری و رەفتار و ئاکاری مرۆڤدا، رێگەی بۆ لێکۆڵەرەوان تەخت کرد، تا ئەنجام و هەڵهێنانی قووڵ لەسەر مرۆڤ و شارستانییەتە جیاوازەکان بەدەست بهێنن، بەڵام بەدەگمەن رێدەکەوێت دوو باسکار یاخود دوو رێبازی شیکردنەوە لە سەر یەک پێناسە بۆ هەمان چەمک رێکبکەون. ئەم رێکنەکەوتنەش فراوانی و دەوڵەمەندیی ئەو جیهانە ئاشکرا دەکات کە بینینی میتۆلۆژی دەیگرێتە خۆی.

«ماکس مۆللەر»، میتۆلۆژیا بەو هێزە دادەنێت کە زمان لە هەر یەکێک لە قەڵەمڕەوەکانی چالاکیی زەیندا، دەیخاتە خزمەتی بیری مرۆڤەوەو دەگاتە ئەو ئەنجامەی کە بڵێت، ئەگەرچی میتۆلۆژیا لەسەردەمی دێرینی بیری مرۆڤدا زیاتر رەواجی هەبووە، بەڵام هەرگیز لەناو ناچێت و لەناو نەچووە.. بەڵام ئێمە توانای دەرک پێکردنیمان نییەو لەبەرامبەر پرشنگی حەقیقەتی رەهادا

خۆمان پێ راناگیرێت(١). ئێرنست کاسیرەریش باسی جادووی وشە دەکات و لەبواری زماندا لە چەمکی میتۆلۆژیا دەکۆڵێتەوەو دەگاتە ئاکامێکی ئەوتۆ کە وشە وەکو هێزێکی میتۆلۆژی تەماشا بکات و بەسەرچاوەی وجوودی لە قەڵەم بدات.(٢)

کەسانی وەکو «مالینۆفسکی و رافاییل پیتازۆنی»ش، هەر یەکەیان روونکردنەوەی زانستییانەیان لەسەر میتۆلۆژیا پێشکەش کردووە. بەڵام لەنیوەی یەکەمی سەدەی بیستەمدا، ئایینناسی رۆمانیی بە نێوبانگ مێرچا، یان مێرسیا ئێلیادە (Mircea Eliade) بەدانانی پێناسەیەکی بنەمایی و هەمەلایەنی بۆ چەمکی میتۆلۆژیاو کارکردەکانی و سامۆئیل هنری هووک(S.H.Hoock) بە دابەشکردن و خانەکردنی هەمان چەمکی نێوبراو، توانییان میتۆلۆژیا لە مانا گشتی و باوەکەی رزگار بکەن و لەبواری شیکردنەوەی زانستە مرۆڤایەتی و کۆمەڵایەتییەکاندا برەوی پێ بدەن(٣)

بەر لەوەی ئێمە خۆمان پابەندی پێناسەکەی ئێلیادەو خانەکردنەکەی هێنری هوک بکەین، پێویستە رۆڵی دەروونناس و رۆحانیی بەناوبانگ (کارل گۆستاف یۆنگ) لە یاد نەکەین کە لەبواری دەروونناسیدا میتۆلۆژیای وەکو زەمینەیەکی لەبار بۆ ناسینەوەی هێما و سێمبولەکانی مرۆڤ بەکارهێنا و کردییە دەروازەیەک بۆ چوونە ناو نهێنییەکانی ناخی بەشەرەوە، کە ئەمەش بەتایبەتی لە کتێبە گرنگەکەیدا بەناوی «مرۆڤ و سێمبولەکانی» رەنگی دایەوە.

شایانی باسە، لەدوای ئەم سێ کەسەی ناومان بردن زۆربەی پێناسەکانی دی بۆ چەمکی میتۆلۆژیا، یان دووبارەکردنەوەن یاخود پێناسەی دەستی دووەمن و بە رەنگی دیکە رازێنراونەتەوە. مێرسیا ئێلیادە لەژێر ناونیشانی (هەوڵدانێک بۆ پێناسەی میتۆلۆژیا)دا، دەڵێت: «میتۆلۆژیا مێژوویەکی پیرۆزمان بۆ دەگێڕێتەوە، باس لە رووداوێک دەکات لەسەرەتای کات (زمن)ەوە روویدابێت، بەڵام گێڕانەوەی مێژووی پیرۆز واتە ئاشکراکردنی نهێنی، چونکە کەسایەتییە میتۆلۆژییەکان ئادەمیزاد نین، بەڵکو خوداوەند و

پاڵەوانانی ژیارن. بەم پێیەش بێت، میتۆلۆژیا بریتییە لە مێژووی ئەو ڕووداوانەی «کاتی خۆی» لەو سەردەمەدا ڕوویانداوە. گوتەی میتۆلۆژیاش، واتە ئاشکراکردنی ئەسڵ و فەسڵ» (٤) لەم پێناسە چڕەوە ئەوەمان دەستگیر دەبێت کە میتۆلۆژیا ناوە بۆ ئەو ڕووداوانەی لە سەرەتای بوونەوە ڕوویانداوە، کەسایەتیی ئەم ڕووداوانەیش خوداوەندان و ئەو پاڵەوانانەن کە نهێنی و سیرڕی پرۆسەی دروستبوون -خلق- یان لەلایە. ئێلیادە، لەسەرچاوەیەکی دیکەشدا کە چوار ساڵ دوای پێناسەکەی لەمەوبەرەوە نووسیویەتی، دەڵێت: «میتۆلۆژیا بەیانکەری کرداری دروستبوونە، ئەوەمان بۆ باس دەکات چۆن شتێک دروستبووەو وجوودی پەیدا کردووە. باسی پلەی کەماڵی ئەو ڕووداوانە دەکات کە بەڕاستی ڕوویانداوە» (٥). ئەم پێناسەیە دوو خاڵی ڕۆشنتری تێدا بەدی دەکرێت: یەکەم، پلەی کەماڵی ئەو ڕووداوانە، دووەم: پلەی کەماڵی ئەو ڕووداوانەی بەراستی ڕوویانداوە.

لەم ڕوانگەیەوە بێت، میتۆلۆژیا بریتییە لە سەرگوزەشتەو مێژووی ئەو ڕووداوە پیرۆزانەی لە پلەی کەماڵدا ڕوویان داوە. جا لەبەر ئەوەی خواوەندان و پاڵەوانەکانیش دەوری گرنگیان لەم ڕووداوانەدا هەبووە، ئەوا بێ هیچ گومانێک ئەم ڕووداوانە ڕاستن و نکوڵییان لێ ناکرێ.

لەلای (برۆنیسیلا مالینۆفسکی)ش، میتۆلۆژیا بریتییە لەو حەقیقەتە زیندووەی لەسەرەتای کاتەوە هەبووە و لەپاشانیشدا چارەنووسی جیهان و مرۆڤایەتیی خستۆتە ژێر کاریگەریی خۆیەوە (٦). ئەوجا بۆ ئەوەی لە (سەرەتای کات)ی مالینۆفسکی و (مێژووی پیرۆز)ی ئێلیادە بگەین، پێویستە بگەڕێینەوە بۆ رافاییل پیتازۆنی، کە دەڵێت: «میتۆلۆژیا ئەفسانە نییە داستانێکی واقیعییە کە بەهۆی ناوەرۆکەکەیەوە لە ڕووداوە ڕاستەقینەکان دەدوێ. واتە سەرەتای ڕووداوە ئەزەلییەکانی وەکی: سەرەتای دروستبوونی کەون، هاتنە ئارای ئادەمیزاد، ژیان و مردن، پەیدا بوونی جۆری زیندوەرو ڕووەک، سەرەتای ڕاو، کشتوکاڵ و ئاگر، ئایین و بۆنە پیرۆزەکان... بە کورتییەکەی سەرەتای هەموو ئەو ڕووداوە دێرینانەی لە

کاتی پیرۆزدا روویان داوە و بوونەتە بنەماو پایەی ژیانی ئەوڕۆکە» (٧).

ئەگەر بەپێی ئەم پێناسانەی سەرێ بێت، ئەوە بۆمان هەیە بڵێین: لە روانگەو جیهانبینیی مرۆڤی دیندارەوە ئەو شتەی پایەی رەگەزی گشت دیاردەو بووەکان دیاری دەکات، لە سەرەتای «کات»ەوە روویداوەو ئەم سەرەتایەش سەرەتایەکی پیرۆزە، چونکە خواوەندان و هێزە میتافیزیکییەکان رۆڵی سەرەکییان تێدا گێڕاوە. مرۆڤیش، بۆ ئەوەی هەردەم پەیوەندیی خۆی بەو (کات)ەوە بپارێزێت، ئەوا لە سەریەتی ئەو رووداوە پیرۆزانە بەهۆی بۆنە و ئاهەنگە جۆراوجۆرەکانەوە دووبارەو نوێ بکاتەوە تاکو رەسەنێتی رەگەزی خۆی بپارێزێت. لێرەیشەوە چەمکی «بیرەوەریی ئەزەلی» وەکی بیرەوەریی بە کۆمەڵی هەر نەتەوەیەک، یاخود «سەرجەمی مرۆڤایەتی» سەرهەڵدەدات و لایەنی کۆسمۆسی، واتە گەردوونییەتی(Cosmos) میتۆلۆژیا لە ناخودئاگای بەکۆمەڵی گەلاندا دەردەکەوێت.

«کارل یۆنگ» بە وردی لەم لایەنە دەکۆڵێتەوەو دەگاتە ئەو ئاکامەی بڵێت، بەشێکی ناخودئاگای مرۆڤ بریتییە لە «مەخزەنی ئەسرار» و بەشێوەیەکی چڕ رابردووی ئەفسانەیی مرۆڤی تێدا سەقامگیر بووە. هەر ئەم رابردووە ئەفسانەییشە کە جەوهەری دەروونی مرۆڤ پێکدەهێنێت.

## (کات)ی پیرۆز لە میتۆلۆژیادا

ئەگەرچی لە پاشاندا بە شێوەیەکی دوورودرێژتر لە مەسەلەی (کات)ی پیرۆز لەلای نالی، دەدوێین، بەڵام چاکترە لێرەدا بەشێوەیەکی گشتی هێما بۆ ئەو خاڵە بکەین کە جەخت لەسەر ئەزەلییەتی زەمەن دەکات و ئەمەیش لە ئاهەنگ و بۆنە ئایینی و کۆمەڵایەتییەکاندا رەنگ دەداتەوە. دووبارە بوونەوەی هەر رووداوێک کە لە سەردەمی پیرۆزدا رووی دابێت، پەیوەندیی بەو ئەزەلییەتەوە هەیە کە چارەنووسی بەرەی ئادەمیزاد لە چوارچێوە میتۆلۆژییەکەیدا دەستنیشان دەکات.

هەروەکو لە پاشاندا دێینەوە سەری، دووبارەکردنەوەی رووداوە سەرەتاییە

پیرۆزەکان تەنیا هەر راهاتنێکی عادەتی نییە، بەڵکو ئەم کردەوانە هەوڵدانی مرۆڤن بەنیازی بەشداریکردن لە پرۆسەی (دروستکردن/خلق)دا. ئەم بەشداریکردنەیش لەسەر بنەمای خۆدۆزینەوە لە زەمەنی ئەزەلیدا و ئەزەلییەت بەخشین بە زەمەنی مێژوویی، خۆی دەنوێنێ. هەر کاتێک مرۆڤ توانی لە رێگەی پەیوەندی بەستن و بەشداریکردنەوە لە پرۆسەی (دروستکردن)دا هاوبەشی خۆی پێشان بدات، ئەوە مانای وایە لە کات و سەردەمی مێژوویی خۆی رزگار دەکات و لە ناو شەپۆلی تیشکی (ئیشراق)دا دەبووژێتەوە. بەم پێیەش زەمینەی دووبارە لە دایکبوونەوەی گەردوون(Cosmos)دەڕەخسێ. بە کورتییەکەی تراژیدیای سەردەمی مێژوویی مرۆڤ، بە کۆمیدیا و کەرنەڤالی تیشکی ئەبەدییەت کۆتایی پێدێت. (٨) لە ناوەرۆکی زۆربەی ئەو جەژنانەی لە رەوتی ساڵێکدا خۆیان دووبارە دەکەنەوە، دەلالەتی ئەم لە دایکبوونەوەیە بەدی دەکرێ. جەژنی نەورۆز، لە نێوەرۆکی میتۆلۆژییانەی خۆیدا ئەم قسەیە بە روونی دەسەلمێنێ. (٩)

خاڵێکی گرنگ لێرەدا ئەوەیە، کە سەردەم (کات)ی میتۆلۆژی لە فەرهەنگی ئایینەکانی جیهاندا روخساری جیاواز بە خۆیەوە دەگرێت. بەڵام ئامانجی هەموو ئەو فەرهەنگانە هەمیشە یەک ئامانجە، ئەویش بریتییە لە «خۆدەربازکردن لەسەردەمی نیسبی و خۆبەستنەوە بەسەردەمی پیرۆزی ئەبەدییەوە» (١٠) دیارە لێدوان لەو روخسارە جیاوازانەی (کات) لەناو کولتوورە جیاوازەکانی بەشەرییەتدا، توانایەکی زێدەتری لەم هەوڵدانە سەرەتاییەی ئێمە گەرەکە، بۆیە تەنیا لە ئاست چەند نموونەیەکدا هەڵوێستە دەکەین کە زیاتر خزمەتی ئەو ئامانجە دەکەن، کە بۆ لێکۆڵینەوە لە جیهانبینیی نالی، لەبەرچاومان گرتووە.

لە ئایینەکانی هیندستاندا، کات سەرەتاو کۆتایی هەیە، بەڵام هەموو کۆتایی هاتنێک سەرەتایە بۆ زانەوەو دووبارە بوونەوەیەکی دی، واتە هەموو مەرگێک زیندووبوونەوەیەکی لەدوایەو هەر لەدایکبوونەوەیەکیش

دووبارەبوونەوەی پرۆسەی خەڵقکردنەوەیە. لەلای ئایینزای شیعە (کات)ی پیرۆز سەردەمی هاتنی حەزرەتی (مەهدی)یەو بە گشتیش ئایینی ئیسلام باس لە«رۆژی حەشر» دەکات. هەر دووبارە لە دایکبوونەوەیەکیش شێوەی بازنەییبوونی (کات) مان بۆ دەنەخشێنێ. واتە سووڕانەوەیەکی دەورانییە کە رەگەزی هەموو بووەکان دەباتەوە سەر بنەچەی خۆیان و بواری لەدایک بوونەوەیان بۆ دابین دەکا. تەنیا لە ئایینی مەسیحی دایە کە سەردەمی میتۆلۆژی شێوەی بازنەیی و دەوەرانی خۆی دەگۆڕێت و لەسەر ئاستێکی ئاسۆیی، کە (سەرەتا، ناوەڕاست و کۆتایی) هەیە، گوزەر دەکات. ئەمەیش لەبەر ئەوەی خودا لەسەردەم و کاتی مێژوویيدا فەرمانەکانی خۆی ناردنە خوارێ. بەم پێیەش سەرەتای کات بریتییە لە رۆژی لەدایکبوونی (مەسیح) لە چوارچێوەی سەردەمی مێژووییدا.

(قەدیس ئاگۆستین)ی فەیلەسووف و خواناسی مەزن، شانازی بە مێژوویی بوونی (کات)ی مەسیحییەوە دەکات و دەڵێت: «بەڕاستی مەسیح یەکجار و بۆ هەمیشە لەپێناوی گوناهەکانماندا مرد» (١١)

ئەم قسەیەی ئاگۆستین هێما بۆ ئەو شەبەقە دەکات کە دەکەوێتە بازنەی (کات)ەوەو بە «مێژووپەرستیی ئایینی مەسیحی و مەرگی میتۆلۆژیا کۆتایی پێدێت» (١٢)

ئیدی لێرەوە، چەمک و کارکردی بیرەوەریی ئەزەلی پیرۆزیی خۆی لەدەست دەدات و لەشێوەی بازنەیی خۆیەوە دەگۆڕێ بۆ خەتێکی راست، کە پڕە لە رووداوی مێژوویی. ئەو رووداوانەی لە رۆژ و کاتی زانراودا روویان داوەو کارەکتەرەکانیشیان نە خواوەندەکانن و نە پاڵەوانەکانی ژیاری مرۆڤ! ئەم گۆڕانکارییە لە شارستانییەتی خۆرئاوادا بە «مەرگی خواکان» ناوی دەبرێ و نیهیلیزم و زەمەنی پووچی و سەرگەردانی لە دەستکەوتەکانی ئەم گۆڕانکارییەن.

## (شوێن)ی پیرۆز لە میتۆلۆژیادا

ئەگەرچی زیاتر مەبەستمە لە ئەنجامی قسەکانمەوە لەسەر جیهانبینیی نالی، لەمەڕ پیرۆزیی شوێن (قدسیة المکان)ی میتۆلۆژیاوە بدوێم و لەروانگەی جیاوازەوە سەنجی ئاراستە بکەم، بەڵام بەو هۆیەوە کە (شوێن و کات) لە فەزای میتۆلۆژیدا، نرخ بەیەکتری دەبەخشن، بەپێویست دەزانرێت هێما بۆ چەند خاڵێکی گرنگ بکرێت. دەبێ هەر لە سەرەتایشەوە ئەوە بگوترێ، لێدوان لەم بارەیەوە بەپێی ئەو میتۆدە فیکرییەی بۆ شیکردنەوە بەکاردەبرێت، دەگۆڕێ و لە ئاستێکی شیکردنەوەدا بەند نابێت. ئەوەی لە باسەکەی ئێمەدا گرنگە، سیمبولی بوونی (شوێن)ەو رەنگدانەوەی ئەم سیمبولانەیە لە ژیانی مرۆڤدا. لەکاتی باسکردنی (شار= مدینة) لە جیهانبینیی شیعریی نالی-دا زیاتر خۆمان بەم لایەنەوە دەبەستینەوە.

لە روانگەی مرۆڤێکەوە، کە ئەم جیهانە بە نموونەی جیهانێکی مەزنتر بزانێت و هەموو بووە رۆحی و ماددییەکانی ئەم جیهانەیش نموونەی رۆح و ماددییاتی ئەو جیهانەبن، ئەوە هیچ شتێک سەربەخۆ (مستقل) و سروشتی (طبیعی) نییە. بەڵکو لە بازنەی پیرۆزی جیهانی مەزندا سروشتێکی گەورەتر و پیرۆزتر هەیە، کە هەموو دیاردەو شتەکانی ئەم جیهانە بە رەچەڵەک دەچنەوە سەر ئەو. بە پێچەوانەی (کات)ەوە، کە تەنێ لە رێی دووبارە دروستکردنەوەی نێو ئاهەنگ و جەژنەکاندا، رەهەندی پیرۆزی بە خۆیەوە دەگرێت، تەماشا دەکەین (شوێن) هەردەم رەهەندی پیرۆزیی (قدسیە)ی خۆی پاراستووە. بەبێ دوودڵی دەتوانرێ بگوترێت: شوێن لە میتۆلۆژیادا، مرۆڤ خۆیەتی...واتە شوێن و مرۆڤ لە پەیوەندییەکی ریشەیی و بنەماییدان و لێکدی هەڵاوردنیان مەحاڵە:

لە لایەکەوە، مرۆڤ خۆی جیهانی بچووکە(العالم الصغیر) و نموونەی جیهانە گەورەکەیە. لەلایەکی دیکەشەوە، ئەم مرۆڤە بەردەوام لە زانەوە و پەیوەندی بەستن لەگەڵ جیهانی گەورەدایە و بەهۆی دەورانی ئاهەنگ و بۆنەکانەوە دەیەوێت خۆی بە بازنەی سەردەمی پیرۆزەوە گرێ بدات و

ئامادەبوونی ئەم سەردەم و کاتەیش لەوێدا پیشان بدات.

ئەم پرۆسەی گەڕانەوەو دروستکردنەوەیە، پلەی پیرۆزی بۆ جوگرافیای جەستەی مرۆڤ دابین دەکات و ڕێگەی توانەوەو گەڕانەوەی بۆ سەر ڕەگوڕیشە پیرۆزەکانی بۆ تەخت دەکات. بیری سۆفیزمی ئیسلامی ئەمە بە «توانەوە لە خوادا» ناو دەبات، چونکە خودا ڕیشەی ئەزەلیی گشت بوویەکە. غەزەلەکانی مەولانای ڕۆمی و عەتار و حەللاج و گەلێکی دی نموونەی بەرزی ئەم ڕەنگدانەوەیەن.

کەواتە گەر بمانەوێت ڕۆشنایی ئاراستەی جوگرافیای میتۆلۆژیا بکەین، پێویستە ئەم کارە بە پشتیوانی و بەراوردکردنی جەستەی مرۆڤ و جەستەی سروشت لە ئاست یەکدیدا، ئەنجام بدەین(١٣). هارمۆنیای نێوان جەستەی مرۆڤ و جەستەی سروشت لە فەزای میتۆلۆژیادا، نەک هەر تەنیا بەڵگەی پیرۆزی و نموونەیی جیهانی بچووک دەدات بە دەستەوە، بەڵکو نرخ و پلەی ئەم جیهانەیش لە ئاست جیهانە گەورەکەدا ئاشکرا دەکات. لێرەدایە کە مرۆڤ دەبێتە خاوەنی جۆرێک (ناوەندێتیی پیرۆز) لە چەقی گەردووندا. ئەم ناوەندێتییەش بە هۆی (ماندالا) یاخود (بازنەی گەردوون) کە مرۆڤ دەکەوێتە ناوەڕاستیەوە، لە زۆربەی ئایینەکانی جیهاندا ڕەنگی داوەتەوە. لە ئایینی مەسیحیدا، ئەم بازنەیە سێمبولی پلەی (کەماڵ)ی مەسیح دەردەخات و لەشێوەی تاجی نووریندا بەسەر سەری عیسا و حیوارییەکانەوە دەبینرێت. هەمان بازنە لە ئایینی ئیسلامیشدا خۆی لە تەواف بەدەوری کابە (کعبە)دا بەدیاردەخات. (١٤)

## بەشی دووەم:

# رەگەزی میتۆلۆژیی بنەماڵەی (بابان) و
# بە میتۆلۆژیکردنی دروستبوونی شاری سلێمانی

هەر بەپێی ئەو بنەمایانەی میتۆلۆژیای گەردوونی، کە لە بەشی پێشوودا لێیان دواین، دەمانەوێت لێرە بەدواوە چەند سەرنجێک لەمەڕ سێمبولیزمی بنەماڵەی بابان و دروستبوونی شاری سلێمانییەوە، بخەینە پێش چاو. ئەوەی لەم باسەدا بەلای منەوە گرنگە لایەنە مێژووییەکەی ئەم بنەماڵەیە نییە، مەبەستی گرنگم ئەوەیە ئاشکرای بکەم، کە چۆن مێژوویش هەندێ رەمزی میتۆلۆژی لە خۆی گرتوون. دیارە وەڕووخستنی بابەتێکی ئەوتۆو خوێندنەوەیەکی لەم جۆرە، توانایەکی گەلێک زیاتری گەرەکە، لەوەی من پێی هەستاوم، بەڵام پێویستی ئەو ئاکامانەی کە دەمەوێت لەبەشی سێیەمی لێکۆڵینەوەکەدا، لەجیهانبینیی شیعریی نالی وەدەستیان بهێنم ناچاریان کردم ئەم لایەنە لەبیر نەکەم.

مامۆستا عەلائەددین سەجادی، لە «مێژووی ئەدەبی کوردی»یەکەیدا، لە زمان «مستەر ریچ»ـەوە داستانی بنەماڵەی (بابان)مان بە شێوەیەک بۆدەگێڕێتەوە کە: «ئەفسانەیەکی دەوری تروادە»مان بێتەوە بیر(١):

**{لە ئاوایی (دارشمانە)دا دوو برا هەبوون: خدر و فەقێ ئەحمەد لە دەست عەشیرەتی بڵباس بە تەنگ هاتبوون. فەقێ ئەحمەد بڕیاریدا سەری خۆی هەڵگرێ و نەیەتەوە بە خاکی دارشمانەدا تا بە جۆرێ نەبێ کە (بتوانێ) تۆڵەی خۆی لەم بڵباسانە بکاتەوە. لێ(ی) داو رۆیشت بۆ ئەستەمبوڵ، شای ئەستەمبوڵ لەگەڵ فەرەنگەکانا لە جەنگا بوو، ئەمیش چوو خۆی کرد بە**

**سەرباز و چوو بۆ جەنگەکە. ئەو دەورە یەکی یەکی دەبووایە بچوونایە مەیدان و شەڕ بەشیر و تیر دەکرا. سوارێکی فەرەنگی لە مەیدانەکە پێنج ڕۆژ مابووەوە، گەلێ کارەساتی گێڕا بوو: هەرکە دەچووە مەیدانی دەیکوشت، فەقێ ئەحمەدیش پاڕایەوە لە پادشا کە بینێرێتە مەیدان، پادشا ناو و شوێن و جێگەی پرسی بۆ ئەوەی ئەگەر سەرکەوت خەڵاتی بکا، ئینجا ئەسپ و تەدارەکێکی چاکی دایەو چووە مەیدان لەگەڵ فەرەنگییەکەدا کەوتنە جەنگەوە لە پاش چەند سەرێک (فەقێ ئەحمەد)فەرەنگییەکەی دایە عەرزا و چۆکی دادایە سەر سنگی (تا) بیکوژێ. ئەویش وتی مەمکوژە بەکەڵکت دێم و مێردت پێ دەکەم. ڕووبەنەکەی لە ڕوومەتی لادا. فەقێ ئەحمەد سەیری کرد ئەمە ئافرەتێکی شۆخ و شەنگە وا ئەم چەند ڕۆژە ئەم کارەساتەی گێڕاوە!...}.**

لە درێژەی ئەم میتۆ- داستانەدا بۆمان ئاشکرا دەبێت، کە فەقێ ئەحمەد، ئافرەتە ئازاکە واتە (کەیغان) خاتوون مارە دەکات و دوو کوڕیان دەبێ بەناوی (بابا سلێمان و بوداغ کیغان)، کە پاشان (بابا سلێمان) دەبێتە بناوانی بنەماڵەی بابان(٢)

میتۆ-داستانەکە گەلێک زانیاریی دیکەیشمان دەدات بە دەستەوە، کە دەتوانین بۆ شیکردنەوەی بنەما میتۆلۆژییەکەی بنەماڵەی بابان سوودیان لێوەربگرین.: ڕۆژێک فەقێ ئەحمەد لە ماڵ نابێت، بلّباسەکان فرسەت لەمە دەهێنن و هێرش دەبەن، بەڵام (کەیغان) خاتوون هەڵمەتیان بۆ دەباو دەیانشکێنێ. دوای ئەم کارەساتەش بریار دەدات سەری خۆی هەڵگرێ و بگەڕێتەوە بۆ وڵاتی خۆی. کاتێک فەقێ ئەحمەد دەگەڕێتەوەو بە کۆچی کەیغان دەزانێت، ئارامیی لەبەر دەبڕێ و ڕەدووی دەکەوێ، بەڵام کەیغان خاتون ملی گەڕانەوە نادات و فەقێ ئەحمەد بێ هۆمێد دەبێ....

لەپاش ماوەیەک، فەقێ ئەحمەد، دیسانەوە یادی کەیغان دەکەوێتەوە سەری و تا وڵاتی فەرنگستان بە شوێنیان دەڕوات!:

**{چووە شارێکی گەورە، سەیری کرد دەنگی دەهۆڵ و زوڕنا و ئاهەنگی**

**زەماوەند لەم شارەدا گوێی ئاسمانی کەڕ کردووە. سەری سڕماو نەیزانی روو بکاتە کوێ؟ هەروا جڵەوی ئەسپەکەی بەرەڵا کردو خۆی دا بەدەست قەزاو قەدەرەوە، ئەسپ هەر ڕۆیشت تا لەبەر ماڵی پیرێژنێکا وەستایەوە. ئەویش بوو بە میوانی پیرێژنەکە. لەپاش بەینێ لێی پرسی ئەم شایی و ئاهەنگە چییە؟. پیرێژنیش وتی: کچی پادشای ئەم شارە وەختی خۆی چووبوو بۆ جەنگی مسوڵمانەکان و بە دیل گیراو چەند ساڵێک مابووەوە. ئێستە وا تازە هاتۆتەوەو مارەکراوە لە کوڕێکی ئامۆزای، ئەم زەماوەندە بۆ ئەوانە!. فەقێ ئەحمەد دڵی داخورپاو گەلێ لە پیرێژنەکە پاڕایەوە، بەڵکو ئیشێکی وا بکا بیخاتە ناو ئەم شاییەوە. پیرێژن بڕیاری دایە، بەڵام بەو شەرتە دەبێ جلی ژنانە لەبەر کا ئەگینا ناتوانێ (لەگەڵ خۆی) بۆ شاییەکەی ببات. ئەمیش (فەقێ ئەحمەد) دەستێ جلی ژنانەی لەبەرکرد و لەگەڵ پیرێژن بەڕێکەوتن و چوونە ناو شاییەکەوەو چوو لە نزیک شوێنی بووک و زاوا وەستا}.**

ئەم میتۆ-داستانە، هەر چۆنێک بێت و زادەی هەر قۆناغێکی بیری مرۆڤی کورد بێت، نرخی رەچەڵەکی بنەماڵەی باباغان لە بیرەوەریی بەکۆمەڵی نەتەوەی کورددا بۆ ئاشکرا دەکات. گەر لە پێکهاتووە میتۆلۆژییەکانی ورد وەبین، تەماشا دەکەین زمان، زمانێکی گەردوونییەو پاڵەوانەکان سەر بە هەر رەگەزێکیش بن، بە هەمان زمان قسان دەکەن. فەزایەکی بێسنوور لە داستانەکەدا دەبینرێ و پاڵەوانەکان هەستی نامۆ بوون بە (شوێن) لەبیر کردنەوەیاندا بەدی ناکرێت و شوێنگۆڕکێی قارەمانەکان شتێکی ئاساییە. ئافرەتێکی وەک کەیغان خاتوون ئازایانە شەڕ دەکات ئەمەش بەڵگەیە بۆ بەهێزیی رەگەزی (نێرینەیی، ذکوریە) لە کەسایەتیدا. بە پێچەوانەیشەوە، فەقێ ئەحمەد لایەنی (مێینەیی/انثوی) لاوازە. بەمجۆرەش هەردووکیان لەدوای پرۆسەیەکی ئاڵوگۆڕ دەبنە تەواوکەری کەسایەتیی یەکدی و هەردوو ڕەگەزی نێرانە و مێیانەی کاراکتەرەکان هارمۆنیەتی خۆیان لەیەک جەستەدا دەدۆزنەوە. مەرجی (کەیغان) ئەوەیە،

گەر فەقێ ئەحمەد دەست لە کوشتنی هەڵگرێ ئەوا ئەم شووی پێدەکات. دەست هەڵگرتنی فەقێ ئەحمەدیش لەکوشتنی کەیغان خاتوون، لە هەمان کاتدا وەستانەوەیە لە دژی لایەنی (نێرینەیی) خۆی. هەروەکو چۆن ملکەچکردنی نێرێتی کەیغانیش، گەڕانەوەیە بۆ دۆخی سروشتی کەسایەتیی ئافرەتانە. ئەگەر ئەم دوو پاڵەوانە بەر لەهەموو شتێک دەگەڕێنەوە سەر دۆخی سروشتیی خۆیان، ئەوا زەمینەی داستانەکەیش بە پیت دەبێت و بەرهەم وەبەردەهێنێ. واتە پرۆسەی خەڵقکردن و لەدایکبوونەوە بەئەنجام دەگات.

لەم میتۆ-داستانەدا لایەنی خۆماڵیبوون زۆر کزە. هەندێ ناوی وەک (دارشمانە)، (بلباس)، (فەقێ ئەحمەد)و هەندێکی دی کە بەڵگەن بۆ بەخۆماڵیکردنی بابەتەکە بەشێوەیەکی مێژوویی، لەلایەن بیرەوەریی نەتەوەییمانەوە بە مەبەستی پیرۆزی بەخشین و دۆزینەوەو دروستکردنی ئەسڵ و فەسڵ بۆ بنەماڵەی بابان لە چوارچێوەی پیرۆزی میتی- دا، ئیدی سەراپای رەمزەکانی، رەمزی گەردوونین.

لەبەشی یەکەمدا هێمامان بۆ ئەوە کرد، کە لە بیرکردنەوەی مرۆڤی دینداردا، هەرگیز شت و بووەکان سروشتی نین و پەردەیەک دایپۆشیون. پێویستە مرۆڤ ئەو پەردەیە لابدات تاکو بگاتە جەوهەر و سنووری نێوان کاتی مێژوویی و کاتی ئەبەدی و پیرۆز ببرێت. ئەم پرۆسەیەش جۆرێک دۆزینەوەیە (اکتشاف) کە مرۆڤ دەتوانێت لە رێگەیەوە شوێن و رۆڵی خۆی لە جیهانی پیرۆزی ئەبەدییەت- دا دیاری بکات.

لادانی رووبەنەکەی کەیغان، نەک هەر تەنیا کەشفی راستییەک پیشان دەدات، بەڵکو لە پرۆسەی دروستکردنەوەیشدا بەشدار دەبێت(٣). ملدانی فەقێ ئەحمەد بۆ لەبەرکردنی جلوبەرگی ئافرەتان وەکو رەمزێک، سنووری دڕندایەتیی مێژوو = (پیرێژنەکە) دەبڕێ و لەپێناوی گەیشتنەوە بە کەیغان و حەقیقەت پێ بەخشینی (بوونی کەیغان) لە خودێتیی خۆیدا، هەموو رێگایەک دەگرێتە بەر تاکو بتوانێت درێژە بە ژیانی خۆی لە بۆتەیەکی

پیرۆزدا، بدات.

ئەڵبەتە دەکرێ چەند لایەنێکی دیکەی ئەم میتۆ-داستانە لەبەر رۆشنایی رەمزە میتۆلۆژییەکاندا شی بکرێنەوە، (وەکو جلەو شلکردن بۆ ئەسپەکە)، بەڵام ئیدی لە باسەکەمان دەچینە دەرێ، بۆیە ئەم قسانە بە تێبینییەک لەمەڕ بونیادی ئەندێشە و جیهانبینیی میتۆ-داستانەکە، کۆتایی پێدەهێنم تاوەکو بەم کارە شتێک لەسەر قۆناغی بیرکەرەوەی سازێنەری ئەم بابەتە بدەین بەدەستەوە.

ئێمە لایەنی زاڵی کەسایەتیی کەیغانمان بە نێرینەییەکەی ناوبرد و گوتیشمان لایەنی مێینەیی لە کەسایەتیی فەقێ ئەحمەددا زۆر لاوازە. بۆ ئەوەی هەر دوو کەسایەتییەکەیش بچنەوە دۆخی سروشتیی خۆیان، پێویستە بە ئاڵوگۆڕێکدا رەت بن. بەڵام ئەوەی جێگەی سەرنجە، کۆتایی و بەرهەمی ئەم ئاڵوگۆڕییە بریتییە لە ئاکامێکی نێرانە. واتە لە دایکبوونی (بابا سلێمان و بوداغ کەیغان). بەم پێیەش دەتوانین بڵێین بنەمای بیرکەرەوەی میتۆ-داستانەکە، بنەمایەکی (نێرخواز)ە، چونکە رەمزە میتۆلۆژییەکان ملکەچکراون بچنە ژێر رکێفی بیری دەسەڵاتدارەوە. دیارە لێرەشدا مەبەست لە دەسەڵاتی سیستەمی باوک سالاری و یاساکانێتی.

لە فەرهەنگی ئایینی یەهوودیدا، باسی ئافرەتێک هاتووە بە ناوی لیلیت(Lillith) گوایە ئەمە یەکەم ئافرەتە خوا دروستی کردبێ لە پێش ئادەمەوە، بەڵام بەو هۆیەوە کە ناتوانێ بە تەواوی ملکەچی ئادەم بێ و لاقرتێ لە بڕیارەکانی دەکا، خوا لەلای چەپی ئادەم (حەوا) دەخوڵقێنێ و بەمجۆرە سزای لیلیت دەدات. مەسەلەی زاڵبوونی بیری پیاو رەچەڵەکێکی میتۆلۆژیی هەیەو ئەم میتۆ داستانە کوردییەش هەر لەگەڵ ئەو رەچەڵەکەدا پەیوەندیدارە.

ئێستا با بێینە سەر مەسەلەیەکی دی: واتە بە میتۆلۆژیکردنی دروستبوونی شاری سلێمانی و ناو بۆ دۆزینەوەکەی..

ئەو زەینییەتە بیرکەرەوەیەی رەگەزی بنەماڵەی بابانی بردەوە سەر (بابا

سلێمان) کە ئەویش زادەی پرۆسەی ئاڵوگۆڕی کەسایەتیی دوو پاڵەوان بوو، دیارە دەبێ پرۆسەی دروستبوون و ناولێنانی شاری سلێمانیش، وەک پێتەختی بنەماڵەی بابان و یادگاری ئەو شارستانیەتە، بخاتە ژێر جۆرە سیمبولسازی و پیرۆزییەکەوە.

ئەڵبەتە بە پێی سەرچاوەو بەڵگەنامەی مێژوویی، دروستبوونی شاری سلێمانی دەگەڕێتەوە بۆ دوو هۆی سەرەکی لە ناوەوەی سیستەمی بابان -دا. هۆی یەکەمیان لە دەرەوەی بنەماڵەکە سەرچاوە هەڵدەگرێ و پەیوەندیی بە: «دووری، بندەستی و نزیکی، کەم ئاوی و شاخاوی» بوونی پێتەختی پێشووی بابان، واتە قەڵاچوالانەوە هەیە، کە ئەم هۆیانەش رێگر بوون لەبەردەم: «گەشەسەندن، سەربەخۆیی بوون، فراوانبوونی قەڵەمڕەوو چالاکی» دەوڵەتی باباندا.

هۆی دووەم، پەیوەندیی بە ئاستی رۆشنبیری و پلەی گەشەسەندنی کەسایەتیی کوردەوە هەیە لەو قۆناغەدا. لە لایەکەوە گواستنەوەی پێتەخت، شکاندنی سوننەتەو عەوداڵ بوونە بە دووی رەوتی سەردەمدا، رەتکردنەوەی مەندیی ژیانە لەپێناوی بزاوتن و چالاکیدا، کە ئەم سەر بزێوی و چالاکییەش لەژێر دەسەڵاتی پاشاکانی ئێران و لەناوچەیەکی وەکو قەڵاچوالاندا مەیسەر نەدەبوو. لەلایەکی دیکەیشەوە چاوکراوەیی سەرکردەکانی بابان، کە نەیاندەویست لە میللەتانی دراوسێ کەمتر حسێبیان بۆ بکرێ، خۆی هاندەرێکی باش بوو تا پێتەخت گواستنەوەکە سەرکەوتن بەدەست بهێنێت. (٤)

بە کورتییەکەی: لەم قۆناغەدا خەونەکانی مرۆڤی کورد بوارێکی بەرفراوانتریان گەرەک بوو تا بێنە دی، کە ئەمەش لە پێتەختی کۆندا مەیسەر نەدەبوو. رەنگە یەکێک لەو بەڵگانەی ئەم بۆچوونە توندوتۆڵ دەکەن، ئەو چارەنووسە بێت کە قەڵاچوالان لە بیرەوەریی کورددا تووشی هات: مەبەستم لەبیر چوونەوەیەتی!

سەبارەت بە ناولێنانی پێتەختی تازە چەند ریوایەتێک لەبەر دەستدان،

بەڵام ئەوەیان کە هێما بۆ دۆزینەوەی ئەموستیلە، لە بناخەی شاردا دەکات و ئەم ئەمووستیلەیەش نێوی (سلمان)ی لەسەر هەڵکەندراوە، زیاتر بەلای ئێمەوە شوێنی سەرنجە... ئەگەر بێت و لەجیهانبینیی سێمبولیزمی میتۆلۆژیاوە، لە ئەموستیلە دۆزراوەکە بکۆڵینەوە، دوو رەگەزی میتۆلۆژیی بەهێزمان چنگ دەکەون کە زادەی بیری مرۆڤی کوردن لەو سەردەمەدا، جا ئەم رەگەزانە لەسەرەتای دروستبوونی شارەوە زەینی کوردیان بزواندبێ و خولقابن، یاخود لەوەدوا، ئەمەیان زۆر گرنگ نییە. گرنگی لەوەدایە ئاشکرا بێت کە چۆن بیرەوەریی نەتەوەیی کورد پیرۆزی بە دروستبوونی شاری سلێمانی، لەسەر ئاستی (ئایینی-میتۆلۆژی) بەخشیوە بۆ ئەوەی لەسەردەم و روخسارە مێژووییەکەی پاک بکاتەوەو بەرگێکی (پیرۆز)ی بە بەردا بکات. پەیوەندیی ناوی (سلێمان) بە ناولێنانی شاری سلێمانییەوە (بە مەرجێک بروامان بە ناوەرۆکی میتافیزیایی ناوەکە، وەکو هێماکردنێک بۆ ناوی حەزرەتی سلێمان پێغەمبەر(٥) لەبیرکردنەوەی ئەو قۆناغەدا هەبێت)، ئەوە شێوەی بازنەیی ئەموستیلەکە، ئیستیعارەیە بۆ پلەی کەماڵی پرۆسەی دروستبوونی شار، کە ئەمەش (ماندالا) یاخود بازنەی گەردوونیمان بەبیر دەهێنێتەوە. سەیر لەوەدایە هەمان بابەت لە قەسیدەکەی نالیشدا دووبارە دەبێتەوە کە پاشان لێیدەدوێم.

ئەم دوو سەرنجە ئەگەر لەگەڵ لۆژیکی مێژوویی و بەڵگەنامەیشدا تەبا نەبن، گرنگییەکی ئەوتۆی نابێ، چونکە مەبەستمان هەر ئەوەندە بوو تیشکێک ئاراستەی بیرکردنەوەی میتۆلۆژییانەی مرۆڤی کورد بکەین و سێمبولیزمی ئەو بیرکردنەوەیە پێشان بدەین، تاکو بتوانین لەجیهانبینیی شیعریی نالیدا، کە پێشتر بە کۆی بیرەوەرییە نەتەوەییەکانمان و دەربڕی نائاگایی بە کۆمەڵی میللەتی کوردمان ناوبرد، سوودیان لێ وەربگرین.

## بەشی سێهەم:

# جیهانبینی شیعریی نالی

### پێشدەستی:

بەر لەوەی بچمە نێو بڕبڕە پشتی باسەکەوە، حەز دەکەم چەند خاڵێک بخەمە ڕوو.

یەکەم: لەسەرجەمی ئەم باسەدا، قەسیدە دوورو درێژەکەی نالی: (قوربانی تۆزی ڕێگەتم، ئەی بادی خۆش مروور)، دەکەینە بەڵگەی قسەکانمان. جارێ ئەم دەقە شیعرییە بۆ خۆی یەکێکە لە شاکارەکانی (تێکڕای شیعری سەرانسەری ڕۆژهەڵات...)(۱) و لە ئەدەبی کلاسیکیی کوردیشدا نموونەیەکی بێ هاوتایە.

دووەم: باسی شاری سلێمانی دەکات لە دوای رووخانی شارستانیەتی بابانەکان، کە ئەم شارستانیەتەش وەکو یۆتۆپیای نائاگایی مرۆڤی کورد خۆی دەنوێنێت.

سێیەم: هەروەها نموونەیەکی دەوڵەمەندی تێکستی شیعرییە کە خوێندنەوەی بەردەوامی جیاواز هەڵدەگرێت و سەرچاوەیەکی بە نرخە بۆ دۆزینەوەی هەندێ لایەنی بنەمایی ئەو دەمەی کۆمەڵی کوردەواری و تەنانەت دروستکردنەوەی نەخشەی شاری سلێمانی(۹) لەدوای ئەمانەیش، قەسیدەکە لە غوربەتدا نووسراوە، هەتا کوردیش چ لە هەندەران و چ لە نیشتمانیدا (غوربەتی)بێت، بێ هیچ گومانێک ئەم قەسیدەی نالیشە (قوربەت)ی دەبێت و یەکێک دەبێت لەو قەسیدانەی خۆراکی رۆحی بە مرۆڤی ئێمە دەبەخشێت.

هەر وەکو لە بەشی یەکەمی ئەم باسەدا هێما بۆ ئەوە کرا، دەمانەوێ دووبارەی بکەینەوە کە شاعیرێکی وەکو نالی رۆحی بیرەوەرییە

ئەزەلییەکانمانە و دووبارەبوونەوەی بازنەیی سەردەمی پیرۆزە. تراژیدیای دووبارەوە بووی عەشقی ئینسانی کوردە بە نیشتمانەکەیەوە و یاد و ئەمەکی ئەم مرۆڤەمان لە ئاست سەردەمی پیرۆزی سەرەتادا بۆ ئاشکرا دەکات. نالی، لەم شاکارەدا نەک هەر پەی بە رەمزی بازنەی زەمەن دەبات و هەندێ پرسیاری ئەزەلی دەهەژێنێ، بەڵکو لە رێگەی پرسیارەکانیشییەوە بەردەوام هەوڵی خەڵقکردنەوەی رابردووی پاک و سەردەمی سەرەتای وجوود دەدات!

پرسیارەکانی، جارێک لە نرخی مێژوویی شاری سلێمانی یا خود (چەقی کەون لەلای نالی) نزیکمان دەخەنەوە، جارێکیش نرخی سەردەمی پیرۆز، بەرجەستە دەکەن. بەئاشکرا دیارە، نالی دەیەوێت لە رێی بەشیعر دروستکردنەوەی شاری سلێمانییەوە، پەی بە (ماندالا)ی بوون بەرێت و شوێنی شیاوی خۆی لەوێدا دەستنیشان بکات. ئایا نالی لەم پرۆسەیەدا سەرکەوتن بەدەست دەهێنێت؟ ئایا دەتوانێ سەرەتای زەمەنی پیرۆز بەدەست بهێنێتەوە؟ یان رەوتی کارەساتەکان بە لایەکی دیکەدا دەشکێنەوە؟ ئایا (نالی) بە کام پلەی زمانی شیعر دەدوێ؟ دەکرێ خرۆشی نالی بە دوان و ئاخاوتنێکی ئاسایی ناو بەرین، یاخود ئەم ئاخاوتنە تەقینەوەی زمانی شیعرە و خولڤاندنی گوتار(خطاب)ێکە لە پێناوی لە دایکبوونەوەدا؟ ئایا مەبەستی نالی، لە ئامادەیی دەربڕین لە فەزای شارداو دروستکردن و لێکدانەوەی پارچە هەڵوەشاوەکانی بیرەوەری، پێشبینی کردنی مەرگێک نییە کە نالی بەچاوی دڵ بینیویەتی؟

ئەی خودا، تۆ بڵێی ئەم قەلەندەری زبردەستە ویستبێتی بڵێ: بە یادکردنەوەی شاری سلێمانی و دروستکردنەوەی لە شیعردا، بەری رێ لە مەرگ دەگرم؟ ئەگەر نالی نەیتوانی لەم بەردەمی مەرگ گرتنەدا سەرکەوتوو بێت، ئەی بۆچی ئێمە هەتا ئێستاش بەخوێندنەوەی نالییەوە سەرگەرمین؟ هیچ دوور نییە ئێمەش بەهۆی یادکردنەوەو دووبارە خوێندنەوەی نالییەوە، مەبەستمان بێت بەشداری لە پرۆسەی خەڵقکردنەوەی سەردەمی پیرۆزماندا بکەین و ئەبەدییەتی ئەفسانەییمان بەدەست بهێنینەوە؟

## قەڵەمڕەوی خەیاڵی نالی

**(قوربانی تۆزی ڕێگەتم ئەی بادی خۆش مروور)**

فەرهەنگی «معین» دەڵێت: قوربان، واتە نزیکبوونەوە، شتێک بەهۆیەوە مرۆڤ لەخودا نزیک ببێتەوە، ئەوەی لەڕێی خوادا قوربانی بکرێت. (٣)

نالی دەڵێت: قوربانی تۆزی ڕێگەتم.. لێرەدا شاعیر قوربانی ئەسڵی قوربانی بۆکراو نابێ، بەڵکو قوربانی تۆزی ڕێگەیەتی، قوربانی تۆزی ڕێگەی با. بەم کارەش (با) لە جێی خودێ، یان ئەوەی قوربانییەکەی بۆ دەدرێ، داندراوە!

نەک هەر ئەوە، نالی ئەگەر یەکسەر قوربانی (تۆز)ی ڕێگەی با دەبێ، واتە بۆ (با) لە قوربانییش گەورەتر شک دەبا! ئەگەر ئەم دڵفراوانییە شاعیرانەیە نەبایە، دەیتوانی ڕاستەوخۆ بڵێ: قوربانتم، قوربانتم ئەی.... سەیر لەوەدایە نالی گوتوویەتی (تۆزی ڕێگەت)! تۆز لەباوە هەڵناستێ، بەڵکو تۆزهەستان ئەنجامی جووڵەی (با) ئاشکرا دەکات. پاشان بۆچی دەڵێ تۆزی ڕێگەت؟ (با) ڕێگەی نییە. بای باشوور و بای باکوور دەگوترێ. واتە ئاراستەی (با) هەیە نەک ڕێگە. نیوەی دووەمی شیعرەکە وەڵامی پرسیارەکانمان دەداتەوە:

**(ئەی پەیکی شارەزا بەهەموو شاری سارەزوور)**

کەواتە ڕووی قسەی نالی لە (با)ی سروشت نییە. سیفەتی پەیکی شارەزا دەستکردی خەیاڵە شیعرییەکەیەتی و پێ بەخشینی سروشتێکی دیکەیە بە توخمی (با). ئەم کارەی نالی ئەگەرچی زادەی خەیاڵە، بەڵام هەر دەشچێتەوە خزمەت خەیاڵەکە خۆی، تا بە شارەزووری بگەیەنێتەوە. نالی زەمینەی تۆز هەستانەکەیش ناو دەبات: واتە قوربانی تۆزی خاکی شارەزوور دەبێ کە لە ئەنجامی جووڵەی باوە بەرز دەبێتەوە. ئەگەر ڕۆڵی خەیاڵ لەم دێڕەدا وەدەرنرابا، نالیش جگە لەوەی کە بڵێت (بەقوربانی شارەزوور بم) هیچی دیکەی بۆ نەدەهات!

لە دێڕی یەکەمی ئەم قەسیدەیەوە، نالی ستراتیژی بیرەکەی دادەڕێژێ. ئەو لاریی لە سیفەتە سروشتییەکانی (با) نییە، بەڵام ناشیەوێ لێمان بشارێتەوە کە بای خەیاڵە شیعرییەکەی لە (با)ی سروشت جیاوازە. پرسینەوە و هەست و سۆزەکانی نالی، گەرم و گوڕن، بای سروشتیش ناتوانێ ئەم گەرم و گوڕییە بەرێتەوە بۆ نیشتمانی نالی....

نالی، لەهەمان دێڕی یەکەمەوە، راناوی تاکە کەس بەکار دەبا: (قوربانی تۆزی رێگەتم)، واتە (من) قوربانی تۆزی رێگەتم: نالی. کەواتە قەسیدەکە لە (نالی) خۆیەوە دەست پێدەکات، پاشان بزووتنەوەیەکی خەیاڵیی (با) دەخاتە جووڵە، ئەوجا شوێنی مەبەستی بزووتنەوەکە، یا خود ئەو شوێنەی خەیاڵ (با)ی تێدا چالاک دەکات، بەرجەستە دەبێ: (نیشتمان) و پاشانیش هەموو پەیوەندییەکان لە (نالی)دا بەرجەستە دەبن. گەر بێت و نەخشەی ئەم پەیوەندییانە بکێشین، ئەوا بازنەیەکی پێکەوە گرێدراوی لەم جۆرەمان دەست دەکەوێت:

ئەم بزووتنەوە بازنەییە، هەر تەنیا لە پێناوی دروستکردنەوەی نیشتماندا نییە، بەڵکو هەژاندنی پرسیاریشە لە ئاست ئەو (بوون)ەی نالی-ی بەنیشتمانەوە بەستۆتەوە. سەیر نییە کە نالی لە دوا دوای قەسیدەکەدا ئەم مەسەلەیە بەروونی باس دەکات: دەڵێ ئایا ئەم بوونە خەیاڵییەی من

نرخێکی ئەوتۆی هەیە و بایی ئەوەندەم کە باسم بکرێت؟

(زارم وەکو هیلال و نەحیفم وەکوو خەیاڵ
ئایا دەکەومە سەر زار و بە دڵدا دەکەم خوطوور)؟

یان راستەوخۆ رووبەڕووی زەمەنی ئەبەدیمان دەکاتەوەو دەڵێت ئەگەر خەڵقکردنەوەکە، ئەگەر لەدایک بوونەوەو گەڕانەوەکەیش وەکو بوونە خەیاڵییەکە وا بێت، ئیدی چ پێویستە لە (کات)ی دونیایی و نیسبی بدوێین؟

نالی ئامانجی گەڕانەوەیە، بەڵام ئەگەر ئەمە مەیسەر نابێت و نامومکینە، ئیدی (کات)ی دونیایی کۆتایی پێهاتووە. چاکتر وایە رەتکردنەوەی ئەم سەردەمەش بە خۆبەستنەوەمان بە (یەومی نەفخی صوور)ەوە پیشان بدەین:

(ئایا مەقامی روخصەتە لەم بەینە بێمەوە
یا مەصلەحەت تەوەققوفە تا (یەومی نەفخی صوور)!

* * *

لای گاستۆن باشلار، چوار توخمەکان: (ئاو، ئاگر، خاک، هەوا)، لە ویژدانی مرۆڤدا رەنگدانەوەی قووڵ و بەمانایان هەیە. لەلای شاعیریش، خەیاڵ دەورێکی گرنگ، لەئاشکراکردنی ئەم رەنگدانەوەیەدا دەگێڕێ. پێویستە شاعیر، وێنە و کەرەستە شیعرەکانی لەگەڵ تایبەتمەندیی رەگەزێکدا بگونجێنێ بۆ ئەوەی بتوانێت، بەردەوامیی، یەکگرتوویی و مانەوەی خەیاڵە شاعیرانەکەی دەستەبەر بکات.

لەم روانگەیەوە، خەیاڵی نالی لە قەڵەمڕەوی (با)دا بەرەو مەبەستێکی دیاریکراو دەبزوێت. مەبەستی ئاشکرای نالی، گەڕانەوەیەکی خەیاڵییە بۆ وڵاتی سلێمانی و دەورپشتی: لەئاسمانی خەیاڵەوە، بەرەو گۆڕەپانی بیرەوەرییەکانی دەفڕێ. لەمەنزڵی هەر یادێکا، بە گومانەوە «هەڵوێستەیەک و دوو پرسیار دەکات» دواجاریش بەرەو هەیوانی خانەقا و کونجی حوجرەکەی

دەکشێ. واتە دەگەڕێتەوە بۆلای خۆی و خولگەی بیرەوەرییەکانی.

کۆششی نالی لەم پرس و جۆبەدا، بە مەبەستی وەدەستهێنانی وەڵامێکە تا بتوانێت پێناسەی خۆی پێ بکات. پێناسەی خۆی وەکو مرۆیەکی دوورە وڵاتی و ئاوارە. ئەو لە رابردوویەکی پیـــرۆز دەدوێت. دەیەوێت بە ڕابردوو بردنە ژێر پرسیارەوە، وەسفی ئێستا (حاضر)ی خۆی بکات. بەڵام ئایا مرۆڤی ئاوارە دەتوانێت بە نقومبوونی نۆستالیژییانە لە رابردوودا، ڕێگەی (سووتانی رەواقی خانەی صەبر) بگرێت؟ سەیر لەوەدایە، نالی وەڵامی ئەم پرسیارەش دەداتەوە و هەر لەسەرەتاوە تێکشکانی پرۆژەکەی پێدەزانێت:

قوربانی تۆزی ڕێگەتم، ئەی «باد»ی خۆش مروور

(با) توخمێکی نەدیدەیە. هەوا بەهۆی رەنگەوە دەستنیشان ناکرێت، بەڵکو هەستی پێدەکرێ، ئەویش لە ئەنجامی بەرکەوتنی بە تەنە ماددییەکانی دیکەوە. کەچی نالی گەرەکیەتی بەهۆی ئەم توخمە نادیارەوە، وێنەی خەیاڵە شیعرییەکەمان بۆ رەسم بکات و رەنگی یادگارەکانی لە زەینماندا حەقیقەت پێ ببەخشێت!

ئایا ئەمە بێهوودەیی و عەبەس نییە؟ ئایا دژایەتی ناخاتە نێوان ئامانجە شیعرییەکەی و کەرەستە شیعرییەکانییەوە؟ لەدایکبوونەوەکەی نالی، گەڕانەوەکەی، سازدانەوە شیعرییەکەی، تەنانەت لە خایاڵیشدا روونادات، ئەمەش چارەنووسی شاعیرو مرۆڤی ئاوارەیە.

بزووتنەوەی خەیاڵە شیعرییەکەی نالی، بزووتنەوەیەکی دەورانییە، شێوەیەکی بازنەیی پێکەوە بەستراوی هەیە. خاڵی سەرەتای ئەم بزووتنەوەیە لە (نالی- ئێستا-ی غوربەتی)یەوە دەست پێدەکات: (واتە ساتەوەختی نووسینی شیعرەکە). ئەوجا لە خەیاڵدا بەهۆی (با)وە بزووتنەوەیەک دێتە دی، کە ئەرکی ئەم بزووتنەوەیە گێڕانەوەی (نالی)یە بۆ ئەو زەمینەیەی لە دایکبوونەوەکەی تێدا مەیسەر دەبێت، واتە بۆ (نیشتمان).

بەڵام بەو هۆیەوە کە جەستەی نالی، لەبیرەوەریدا، لەگەڵ جەستەی نیشتمانەکەی تێکەڵ بووە، ئەوا هەموو گەڕانەوەیەکی نالی بۆ نیشتمان

گەڕانەوەیشە بۆ لای خودێتیی خۆی... هەموو پرسیارێک لە قەڵەمڕەوی جەستەی نیشتمان، پرسیاریشە لە جوگرافیای بوون (وجود)ی خود. لێرەوە گەڕانەوەی نالی، گەڕانەوەیە بۆ جەوهەر، بە مەبەستی گەڵاڵەکردنی پێناسەیەک، یان بە دەستهێنانی نرخێک بۆ بوون. هەر بۆیەشە کاتێک لەم پرۆژەیەدا هەست بە تێکشکان دەکات، گومانیش لە بوونی خۆی پەیدا دەکات:

(زارم وەکو هیلال و نەحیفم وەکوو خەیاڵ
ئایا دەکەومە سەر زار و بە دڵدا دەکەم خوطوور؟)

* * *

یەکێک لە گرنگترینی ئەو وێنانەی خەیاڵی قەڵەمڕەوی (با) دروستیان دەکا، فڕینە. هەوا ئازادییە و ئازادیش فڕینە. هەناسە دان ئازادییە، واتە لێرەدا پێویستیمان بە باڵ نییە، چونکە «فڕینەکە، فڕینێکی خەیاڵی-یە» (٤) یا خود ئازادییەکە، ئازادییەکی شاعیرانەیە.

نالی دەیەوێ بفڕێ، دەیەوێ لەخۆی بێتە دەر و هەناسە بدات، ئەمەش بەمانای ئەوەیە: ئەو ئازاد نییە. دووریی لە نیشتمان ئازادی بۆ مرۆڤ فەراهەم ناکات. شوێنی بەدیهاتنی ئازادی، شوێنی زانەوە و سکپڕبوونەوەی خەیاڵە. ئەو شوێنەی هارمۆنیای تەبایی رۆحی تاک لەگەڵ رۆحی کۆمەڵدا چێ دەکات. لێرەدا مەبەست لە ئازادی، بڕیاری سەر کاغەز، یان بەیانێکی (ئەنجومەنی سەرکردایەتیی شۆڕش)نییە، بەڵکو مەبەست لە ئازادیی مەعنەوی و رۆحییە.

نالی-ی دووره ولاتان، نالی-ی عەوداڵی سەردەمی پیرۆز و لە تاو زێد و نیشتمان هەراسان بوو، نالی-ی مسوڵمان و بڕوادار، بە ئاشکرا ژیان و سەردەمی (دووریی)لە زادگایەوە رەتدەکاتەوە، رۆحی مەزنی نالی لە پەرێزی ئازادیی ولاتی غوربەتدا ئارام ناگرێت:

«وەک ئاهەکەم وان بە هەتا خاکی کۆیی یار»
«وەک ئەشکەکەم رەوان بە هەتا ئاوی شیوەسوور»
«ئەمجا مەوەستە تا دەگەییە عەینی سەرچنار...»
«داخڵ نەبی بە عەنبەری سارایی خاک و خۆڵ».
«هەتا نەکەی بەخاکی سولەیمانیا عوبوور...»
«مەیلێ بکە لە سەبزە درەختانی مەدرەسە...»
«چاوێ بخە لە سەبزە و و سێرابی دائیرە...»

ئەگەر ئەم هەولانەی نالی و ئەم عەودالبوونەی بەدوای گەیشتنەوە بە زێد و نیشتماندا، رەنگدانەوەی چەمکی بیرەوەرییە ئەزەلییەکانمان نەبێت، ئەی داخۆ ناوی بنێین چی؟! ئایا مسوڵمان بوونی نالی و بڕواو خۆشەویستییەکەی بۆ پێغەمبەر، ئیستیعارەیەک نییە، کە نالی دەیەوێت بە هۆیەوە خۆشەویستیی نیشتمانەکەیان بۆ بسەلمێنێ؟ باشە ئەگەر ناسنامەی نالی لە مسوڵمانییەتەکەیدا بچووک بکەینەوە، نەدەبوو (قورب)ی نالی لە (مەککە)و (مەدینە)وە گرێی زۆر تەنگ و چەڵەمەی بۆ کردباوە و ئارامیی بۆ رۆحی ماندووی دابین کردبا؟ ئایا نزیکیی نالی لە مەزارگەی گەورەترین کەسایەتیی ئیسلامەوە(حەزرەتی محمد) بایی زۆرشت نەبوو بۆی: یاخود (بوعد)ی نالی لە ولات و ئاگری دووریی لە سلێمانییەوە ناچاری دەکەن هەزار (قورب) بکاتە قوربانی (بوعد)ێک!؟ جێگەی سەرنج و سەر سوورمانە کە نالی بە درێژایی ئەم قەسیدەیەی نێوی خودا و پێغەمبەر بە لێوانیدا نایەت، تۆ بڵێی ئەوەی لە یاد چووبێت کە رۆژگارێک بەم جۆرە باسی (حەوشی حەرەمی مەککە)ی کردووە؟

«شوتوربانا! ئەمە پەرژینی باغی رەوضەیە، یاخود
عەرار و عەرعەرو بانی خیابانی بیابانە...
چ رەوضە؟ رەوضەیی جەننەت! چ جەننەت؟ جەننەتی قوربەت!
چ قوربەت؟ قوربەتی راحەت! چ راحەت؟ راحەتی جانە» (٥)

## چەقی گەردوون؛ پیرۆزترین شوێن

ئەم قەڵەمڕەوی خەیاڵە شیعرییە لە درێژەی قەسیدەکەدا، ئاراستەی (شوێن)ی مەبەست دەکرێت. شوێنی مەبەستی بیرەوەرییەکانی نالیش وڵاتی سلێمانی و دەوروبەریەتی، یاخود جەستەی تواوەی خۆیەتی لەناو جەستەی نیشتماندا.

بە لای نالییەوە، وڵاتی سلێمانی پیرۆزترین شوێنی ئەم گەردوونەیە و ماندالای کەماڵی مرۆڤایەتییە. لە بیرو جیهانبینیی ئەودا وڵاتی سلێمانی هەمان پلەی پیرۆزی و هەمان نرخی هەیە، کە زەمینە میتۆلۆژییەکان هەیانە. سیمبولیزمی شوێن (رمزية المكان) لە بیری زۆربەی گەلانی جیهاندا گرنگیی تایبەتی خۆی هەیە. زۆر شارستانییەت پێمان دەڵێن، هەندێ چیا، هەندێ شوێن دەکەونە ناوەڕاستی گەردوونەوە و سەراپای جیهان لەوێوە دەست بەدروستبوون دەکات: بەلای هیندییەکانەوە چیای (البرز) یان (هەرەبەرزایەتی)و لە ئایینی زەردەشتیشدا وڵاتی ئێران بە گشتی دەکەوێتە ناوەڕاستی گەردوونەوە(٦). هەمان شیکردنەوە پێمان دەڵێت، شارو پەرستگا پیرۆزەکانیش، دەکەونە دڵی گەردوونەوە، ئەمەش ناچارمان دەکات هەڵوێستەیەک بکەین.

ئەو پێناسانەی، چڕیی دانیشتوان (كثافة السكان)، دامەزراوی ئابووری و پیشەسازی، خەتی شەمەندەفەر و تەلەفۆن و دەزگا مەدەنییەکان دەکەنە بنەمای لێکۆڵینەوە لە (شار)، کەمتر پەیوەندییان بە باسەکەی ئێمەوە هەیە(٧)، چونکە هەر وەکو روونمکردۆتەوە، من زیاتر خۆم بە سیمبولیزمی هەندێ دیاردەوە دەبەستمەوە کە نرخێکی پیرۆزیان بە لای مرۆڤی بڕوادارەوە هەبێ. کاتێک دەگوترێ، شوێن بەلای ئەم مرۆڤەوە پیرۆزە (مقدس)، واتە ئەو شوێنە رەهەندێکی مەعنەویی هەیە. نالی، کاتێک باسی شاری (سلێمانی)دەکات، باسی «پێشکەوتن» و «دواکەوتن»ی ئەوێ

ناکات...بەڵکو لە پەیوەندیی لەگەڵ کۆمەڵێک حاڵەتی دەروونیدا باسی دەکات کە خودی ئەم حاڵەتە دەروونییانە فەزای شیعریی نالییان پێکهێناوە. ئەو هارمۆنیایەی ڕۆحی تاک لەگەڵ ڕۆحی کۆمەڵدا تەبا دەکات، شوێنی لێخوردبوونەوەی نالییە نەک مێژووی سەرهەڵدانی شاری سلێمانی! نالی لە ڕوانگەی (ریاضی رەوض و جۆباری عەینی نوورو عەدل و دانشەوە) بە وڵاتی سلێمانی هەڵدەڵێ و ئەشکی (پرسشی تەفتیشی خوارو ژوور)ی بۆ هەڵدەرێژێ...

* * *

لە یۆنانی کۆندا شار دەورێکی گرنگی هەبوو، نەک هەر لە ڕووی ڕێکخستنی کۆمەڵایەتییەوە، بەڵکو لە ڕووی مەعنەوی و ڕۆحیشەوە. لەو ڕۆژگارەدا، هاووڵاتیان هەر وەکو چۆن گوێیان بۆ فەرمانی دەوڵەت ڕادەگرت و نومایشی قوربانیدان و سزادانیان بە چاوی خۆیان دەدی، ئاوهایش گوێ قوڵاخی دەنگ و باسی ئەدەبی بوون: قەسیدە شیعرییەکانی هۆمیرۆس سەرەتا لە نێو ژووری کۆشکدا دەکرانە گۆرانی و ڕێی ئەوەیان نەبوو بە ناو خەڵکدا بڵاو ببنەوەو ڕوخساری قەسیدەی میللیی نێو ئاهەنگ و جەژنە گشتییەکان بە خۆوە بگرن. بەڵام دروستبوونی شار، ئەم دەقەی شکاند و ئەدەب بووە ڕۆشنبیریی گشت و ڕێگەی گۆڕەپانەکانی شاری گرت. بەم پێیەش، شار ئەرکێکی ڕۆحانیی کەوتە سەرشان تا ئارامگایەکی پڕ ئاسایش بۆ مرۆڤ دابین بکات.

فرانسوا شوای دەنووسێ: «کۆبوونەوەی مرۆڤ لە چوارچێوەی گوند و شارۆچکەکاندا، هەستکردن و دەربڕی هەوێنی ئەو ئارامییەیە کە مرۆڤ خودێتیی خۆی تێدا گەشەپێدەدات و لە ئاست سروشتدا (جیهانی دەرەوەی مرۆڤ) شانازیی پێوە دەکات» (٨)

جەغدکردنەوەی نالی لەسەر دروستکردنەوەی شوێنە لەدەست چووەکەی بەهێزی شیعر، جگەلەوەی ئاگاداربوونی شاعیرمان لەسەر ڕۆڵی

شارستانییانەی شار بۆ ئاشکرا دەکات و بەم پێیەش نالی دەبێتە یەکەم ڕۆشنبیری کورد ئەم مەسەلەیەی هەژاندبێ. لەهەمان کاتیشدا لەو «ئارامی»یەی فرانسوا شوای بە زەمینەی گەشەسەندنی خودێتیی مرۆڤی دادەنێ، دڵنیامان دەکاتەوە. نالی تەنیا بە باسکردنی شار و نەخشە کێشانەوەکەی رازی نابێت بەڵکو پێویستیی بە چوونە ناوەوەیش هەیە. ئەوەش سەفەرێکە بەرەو ناخ، بەرەو سەرەتای بێگەرد، بەمەبەستی دۆزینەوەی خود! مامۆستای مەزن، مەلا عەبدولکەریمی مودەریس دەفەرموێ:

**«نالی لەم پارچە شیعرە پڕ سۆزەیدا تا دێ میگناتیزی هەستی زیاتر بە شوێنێکی تایبەتییەوە گیر ئەبێ، وەک دیان «شارەزوور» و «شیوە سوور» و «سەرچنار» و ئەنجا خوارو ژووری سولەیمانی و پاشان سەیرانگاکانی دەورو پشتی و رووبارەکانی، هیچ کامێ لە هەستی بیر و یادی خۆی بێ بەش نەکرد. بەڵام بنیادەم هەر چەند بازنەی خۆشەویستیشی بە دەرەتان و گوشاد بێ و کەسان و جێ و شوێنێکی زۆر بگرێتەوە، شتێک یا کەسێک هەیە لە هەر شتێک یا لە هەر کەسێکی زیاتر هەڵاوێرێ و جێگای لای سەرووی لە دڵیا بۆ ئەو تەرخان کردبێ. ئەگەر ئەو جێگایە بەش بە حاڵی نالی لە جیهانا کوردستان و لە کوردستانا سولەیمانی بووبێ، کەوایشە، لە سولەیمانیشا خانەقای مەولانایە و وەک پاشتر دەر ئەکەوێ، لە خانەقایشدا بەتایبەتی ژوورەکەی خۆیەتی»** (٩)

ئەم سەفەرە {لە (من)ی نالی غوربەتییەوە} بەرەو شوێنێک دەست پێ دەکا کە {(من)ی نادیار-(غیاب)ی نالی} تێدا جێ ماوە! سەرەتا دەیەوێت غاییب بوونی خۆی لە شارو دووری لەو سەردەمەوە بسڕێتەوەو ئامادە بوونی خۆی بە(باسکردنی ئەوێ) پیشان بدات. واتە ئێمە دوو نالیمان هەیە، یەکێکیان ئەوەیە کە لە ئێستای قەسیدەکەدا بە راناوی کەسی یەکەمی قسەکەر دەدوێت و ئەم کەسەش مرۆڤێکی تاراوگەکراوە، واتە لە نیشتیمانی خۆیەوە دوورە و تاقە هۆی پەیوەندیکردنیشی بەو نیشتیمانەوە لە رێگەی زمانەوەیە. لێرەوە لەناو زمانە شیعرییەکەی نالیدا (من)ێکی دیکە

دروستـدەبێت کـە لە رابردوودایە و ئەو رابردووەش بە نیسبـەت ئێستـای تاراوگەیی شاعیرەکەمانەوە، رابردوویێکی غائیبە:

پرۆسەی گەڕانەوە
نالی:(٢) ⟵ نالی:(١)

(من- رابردوو- غایب) ⟵.......... (من- ئێستا- غوربەت)

کەواتە: کێشەی نالی، کێشەی دوولەتبوونی (خود)ی ئینسانێکە، کە تەنیا بە گرێدانەوەی (ئێستا) و (ئەو کاتە)،(ئێرە)و (ئەوێ) مانا بە بوونی خۆی دەبەخشێ. ئەم پرۆژەیەش کۆمەڵێک پرسیاری گومان لێکراو دەوریان داوە کە باز هەڵدان بەسەر سەردەمی مێژووییدا، مەحاڵ دەکەن و مرۆڤ بە کوێرەڕێی وەڵامدانەوە دەگەیەنن. نالیش بە گومانێکی شاعیرانەوە دەچڕێ:

« زارم وەکو هێلال و نەحیفم وەکو خەیاڵ.
ئایا دەکەومە سەر زار و بە دڵدا دەکەم خطوور
لەم شەرحی دەردی غوربەتە، لەم سۆزی هیجرەتە
دڵ رەنگە بێ بە ئاو و بە چاوا بکا عوبوور»

ئەم بەیتانە، ئەگەرچی دەربڕی بە کوێرەڕێ گەیشتنی رۆحی نالین، بەڵام لە هەمان کاتیشدا دەربڕی بە کوێرەڕێ گەیشتنی بیرەوەرییەکانی مرۆڤی کوردن. ئەو مرۆڤـەی نزیک بە دوو سـەدەیە لە دووڕیانـی(کـەوتنە سـەرزار و بە دڵدا خوطوور) کردندا هەمان پرسیاری نالی دووبارە دەکاتەوە:

ئایا مەقامی ڕوخصەتە لەم بەینە بێمەوە
یا مەصلەحەت تەوەققوفە تا یەومی نەفخی صوور؟

** ** **

سـەردەمی پیـرۆز بەلای نالیـیـەوە، کـاتی بە(بەرگ و باری داری شـێخ

هەباس، بە جەمع و دائیرەیی دەوری کانیبا و دەروونصافی و گورەی تانجەرۆ) بوو، کە دەیویست بەهۆی تقووسی شیعرییەوە باز بدات بەسەر کاتی مێژووییدا و ماناو نرخێ بۆ بوونی خۆی، لە سەردەمێکی دیکەدا بە دەست بهێنێتەوە. سەردەمێک کە (من)ی نالی دەردی دوولەتبوونی نەدەناسی، سەردەمی پاکی و بێگەردیی بیرەوەرییەکان... سەردەمێک کە تیایدا نالی نەک هەر گومانی لە بوونی خۆی نەدەکرد، بەڵکو تەواو بڕوای بەنرخی ئینسانیی خۆی پتەو بوو.

نالی دەیەویست بەهۆی دووبارەکردنەوەی پەیوەندییەکان، شوێنێکیش دەستنیشان بکات کە بەلای خۆیەوە پیرۆزترین شوێن بوو، شارێک کە تیایدا نالی بۆ بەشێکی گرنگی وجوودی خۆی دەگەڕێ و بەهۆی هێزی خەیاڵەوە دەیەوێ پرۆسەی لە دایکبوونی خۆی دووبارە بکاتەوە، وڵاتێک، کە گۆڕەپانی کەڵەکە بوونی ئەزموونی نالییەکانە لەسەر بوون. ئاوێنەی جەستەی نالییەو بەشێکە لەو. لێرەشەوە نالی و نیشتمان، نیشتمان و نالی دوو هاوکێشەن رەمزی ماندالای (خود)ی مرۆڤی کورد پێکدەهێنن. پەی بردن بە نهێنیی ئەم رەمزی ماندالایە، دۆزینەوەی نرخێکە بۆ ژیان.. بۆ بەردەوامی.. بە دەستهێنانی ئازادیی رۆحی و مەعنەوییە..

ئایا خوێندنەوەی بەردەوامی نالی و پەی بردن بە رازی جیهانبینییە شیعرییەکەی، چ یاریدەیەکمان دەدات لە خوێندنەوەی رازی(بوون)ی (خود)ی ئینسانی کورد و ئاسۆی بیرکردنەوەیدا؟ ئایا دووبارە خوێندنەوەی نالی و پەنا بردن بۆ پەیامەکەی، ئیمکانی لە دایکبوونەوەیەکی دیمان بۆ دەرەخسێنێ؟ مەبەستم ئەو پرۆژەیەیە کە نالی تیایدا بە کوێرەڕێگە گەیشت: پرۆژەی گەڕانەوە، پرۆژەی سازدانەوەی نیشتمان و شوێنێ کە رۆح و جەستە تیایدا بە هاوسەنگی و هارمۆنیای خۆیان دەگەن؟!

## بەشی چوارەم:

# دەستنیشانکردنی پەیوەندییەکان

### پەیوەندیی یەکەم:

### دەرەوە/ ناوەوە، یان: پیری/ لاوی:

لەم بەشەدا تیشکی سەرنج دەخەینە سەر ئەو پەیوەندییەی نالی لە نێوان جەستە و هێڵی درامیی شیعرەکەدا دروستیکردووە. مەبەستمانە بزانین پەیوەندیی نێوان جیهانی دەرەوەی جەستەی نالی چۆن لە قەسیدەکەدا رەنگی داوەتەوە و شاعیریش، بە چ شێوەیەک لە رێگەی باسکردنی ئەو رەنگدانەوەیەوە وێنەی شەپۆلی ئەندیشەی سەردەمەکەیمان بۆ دەکێشێ. گرنگە بتوانین لە جیهانبینیی نالیدا ئەو هۆیانە بدۆزینەوە کە لە ئەنجامدا بڕیارەکەی خۆی لە سەریانەوە پتەو دەکا.

ماموستا عەلائەددین سەجادی دەڵێ: «نالی لە ١٨٣٠ دا ئەچێ بۆ حەج و سولەیمانی بەجێ دێڵێ» (١) پاش ئەوەی دەگەڕێتەوە بۆ شام، چەند ساڵێکیش لەو مەڵبەندەیا بە سەر دەبا، ئەوجا لە ١٨٣٤ قەسیدەکەی دەنووسێ.. بەم پێیە ئەگەر بێت و ساڵی ١٧٩٧ یش بە ساڵی لە دایک بوونی نالی لە قەڵەم بدرێ، ئەوە لە تەمەنی ٣٨ ساڵیدا قەسیدەکە لە دایبک بووە. بەڵام ئەو بونیادەی قەسیدەکەی لەسەر بەندە چ لەرووی کەرەستەی شیعری و چ لەرووی کامڵبوونی ئەزموون و بۆچوونە شیعرییەکانییەوە ئەو رایە دەوڵەمەند دەکەن کە لە لاپەڕەی(٤١)ی دیوانی نالیدا دەڵێ: «نالی ئەم نامەیەی یا دوابەدوای شکانی ئەحمەد پاشا و بانگکردنی بۆ ئەستەمووڵ ناردووە، کە ئەکاتە ساڵی ١٨٤٧ی زایینی، یا پاش ئێجگاری دەس لەکار کێشانەوەی عەبدوڵڵا پاشای برای و نەمانی دوا

دەستەلاتی بنەماڵەی بابان، واتە ساڵی ١٨٥١ زایین کە ئەکاتە ساڵی ١٢٦٨ کۆچی» (٢) کەوابێ ئەگەر ساڵی ١٨٤٧یش وەکو ناوەڕاستی رایەکەی مامۆستا سەجادی و ساڵی ١٨٥١ وەربگیرێ، کە نالی قەسیدەکەی تیا نووسیبێ، ئەوە بەم پێیە دەبێت لە تەمەنی نزیکەی ٥٠ ساڵیدا بووبێت.

ئەم رایە بەلای ئێمەوە زێتر جێگەی سەرنجەو بەڵگەش بۆی لە سەراپای قەسیدەکەدا هەیە کە لەمەو دووا دەیانخەینە بەردەست. ئەو تەوژمە فکرییەی مرۆڤی کوردی دوای دەوڵەتی بابان تیا ژیاوەو بە روونیش لە وەلامەکەی سالم- دا دەبینرێ(٣)، رووناکایی بەردەم دیدەی نالیش لێڵ دەکات و ئیدی ئەزموونی تەمەن و واقیعی رووداو دەبنە دوو زەمینە کە نالی بە هۆی ئەویانەوە حەسرەت بۆ ئەمیان دەکێشێ و لە ئەنجامی حەسرەتکێشانیشی بۆ سەردەمی لاوی و تافی جوانی، سروشتی تەڕوبڕو بزەهێنەری نیشتمانەکەشی بەسەر دەکاتەوە. لە بەشی رابردووی باسەکەدا گوترا کێشەی نالی، کێشەی دوولەتبوونی «خود» و ناوەوەی ئینسانێکە، کە بەتەنیا گرێدانەوەی ئێستا (سەردەمی نووسینی قەسیدەکە) بەو سەردەمەی دیکەوە یا خود بە گرێدانەوەی (ئێرە) و (ئەوێ) مانا بە بوونی خۆی دەبەخشێ. ئاکامی ئەو پرۆژەیەشمان وەها لێکدایەوە کە نالی بەهۆی رەگەزی خەیاڵە شیعرییەکەیەوە، دەوری رابردوو دەداتەوەو ئەمەش پرسیاری لا دروست دەکات. لە ئەنجامی پرسیشەوە گومانی لادروست دەبێ، پاشانیش بە قۆناخی کوژانەوەو کوێرەڕێ دەگات و هەموو وەلامەکانیش لە دووڕیانی چاوەڕوانی (تا یەومی نەفخی صوور) دا رادەگرێ!

بەلام ئێستا دەمانەوێت ئەم مەسەلەی تێکشکان و کوژانەوەیە بە لایەنی فیزیکیی جەستەی نالییەوە گرێ بدەین و بزانین داخۆ نالی چۆن مامەڵەی شیعریی لەگەڵ ئەم لایەنەدا دەکات؟ چۆن جارێک سلێمانی و دەوروبەری دەکاتە ئاوێنەی سەردەمی گەنجێتی و جارێکیش لە ئەنجامی پرسیارکردنی لە وێرانەیی ولاتی سلێمانی، باسی وێرانەیی و پیرییەکەیمان بۆ دەکات؟

با لەو خاڵەوە دەستپێبکەین کە چۆن شاعیرەکەمان هەندێ سیفەتی

ناسک و هەڵبژاردەی بۆ پاڵەوانە خەیاڵییەکەی، واتە بۆ (با) قایل دەبێ و دەیرازێنێتەوە؟ ئەوەتا نالی لە دێڕی یەکەمەوە تا دوا بەیتی بەشی یەکەمی قەسیدەکەی باسی (خۆش مروور)ی، (لوطفی خەفی)، (سروەی بەشارەت) (هەم میزاجی) و گاهێ بە(ڕەوح) بوونی (با) دەکات و ئەنجامیش بەم جۆرە دەشکێتەوە:

مەحوی قەبووڵی خاطری عاطر شەمیمتە،

گەردی شیمال و گێژی جەنووب و کزەی دەبوور.

(با) لەم بەیتە شیعرییانەدا و بە پێی ئەم بەکارهێنانە چڕو دەوڵەمەندە، هەندێ ئەرک و فەرمان و پێڕەوابینینی دەچێتە سەر شان، کە ئەم ئەرک و فەرمان و پێڕەوابینینانە زیاتر پەیوەندییە دەروونییەکانی نالیمان بۆ ئاشکرا دەکەن، وەک ئەوەی مەبەست لێیان هەر باسکردنی (با) بێت، ڕاستە (با) وەکو کارەکتەرێکی بزووتنەوەی خەیاڵە شیعرەکەی نالی، لە سەراسەری قەسیدەکەدا ڕۆڵی خۆی هەیەو تەنانەت لە دوا بەیتیشدا (سەلامی دوور)ی هەر بە ئەودا بۆ (یاری سەنگ دڵ) دەنێردرێتەوە؛ بەڵام ئەمە بەشێکی ئەو داخوازی و فەرمانانەن و دیوێکی ئەو چالاکییەیە کە شاعیر بە ڕەگەزە هەڵبژێردراوەکەی رادەبینێ. دیوی دووەمی ئەو چالاکییەو ئەو دەورکردنەوەیە بریتییە لەوەی نالی خۆی بیری لێ دەکاتەوەو دەیەوێت ببێت. شتێکی ئەوتۆیە لە دەرەوەی بازنەی ریالیستی شوێنی نالی، بەڵکو تەنیا بەهۆی خەیاڵ لێکردنەوەیەوە دەکرێ دەستێکی کاتی، (بە پێی درێژی و کورتیی خەیاڵ لێکردنەوەکە) بەسەردا بگیرێت. هەر ئەم خەیاڵە بەهێزەیشە کە ئەرکی شیعری نالی-ی کردۆتە بەخشین و عەتا، نەک وەرگرتن و دەست پانکردنەوە: ئەوەی کە نالی دەکاتە کائینێکی لێواولێو لە وجود و ژیاندۆست و لە مشەخۆری بە سەر سروشتەوە رزگاری دەکات؛ خەیاڵە قووڵەکانیەتی لەو شتانەی کە دەبێت هەبن، یان لەو شتانەی لەدەست چوون و دەبێ خوڵق بکرێنەوە، نەک ئەوانەی کە هەن.

نالی بە باسکردن و پێبەخشینی ئەو خرۆشی بزووتنەوەیە بە ڕەگەزی (با)

ناڕاستەوخۆ سەردەمی خرۆش و هەڕەتی گەنجێتیی خۆیشیمان بە بیردەهێنێتەوە. ئەو وەسفی بەهارییانەی با دەکات، هەر وەکو چۆن هەموو وەسفکردنێکی گەنجی و تافی خوێن گەرمیش، بەهارین. ئەو شوێنانەی پرۆژەکتەری خەیاڵی نالییان بەر دەکەوێ، تەڕو بڕو شێدارن و بۆنی زیندوویی و پێکەنینان لێ دێ، بەڵام چونکە وەسفکردن و خەیاڵکردنەوەکەی لەو دیوی رندووی هەرەسی زستانی پیرییەوەن، تەماشا دەکەین ئەو شوێنەی پرسیارەکانی لێوە دەکرێن، وشک و برینگە و خەزانە. بەشی دووەمی قەسیدەکە بە هەواڵ دەسپێدەکات:

«سووتا . . .»

نالی سووتانی پیربوون و خەزانی عومر دەکاتە دەنگ و وەک زەمینە جەستەییەکەی خۆی پرۆژەکتەری ئاڕاستە دەکات. مرۆڤی خەستە و لاواز ناتوانێ هەتا سەر بە بیرکردنەوە لەتافی لاویەتیی خۆی، ماندوویی پیرێتییەکەی لەبیر خۆی بباتەوە. بەڵکو واقیعی (ئێستاش) دەبێتە بەشێکی گرنگی سەرجەمی پەیوەندییەکان و دابڕانێکی ریالیستییانە لەگەڵ (هەرێمی خەیاڵدا) دروست دەکات. تەماشای ئەو هەوڵە خۆ بەدەستەوەدان ئامێزەی بکەین، کە چۆن دابڕانەکەی پێدروست کردووە: لەم بەیتەدا وەک ئەوەی نالی بە (با) بڵێت: ئیدی با بەس بێ، ناتوانم هەر لەسەر وەسفی تۆ بڕۆم، هەدادانم لە بەر بڕا.. ئیدی ئاوا بە دیارمەوە دامەنیشە بەنیازی گوێگرتن لە وەسفی خۆت چونکە:

سووتا.. رەواقی خانەیی صەبرم، دڵ و دەروون
نەیماوە غەیری گۆشەیی ذیکرێکی یا صەبوور
هەم هەم عەنانی ئاهم و، هەم هەم ریکابی ئەشک
رەحمێ بەم ئاه و ئەشکە بکە هەستە بێ قوصوور.

* * *

جێگەی سەرسوڕمان نییە نالی لە دە جار زیاتر بەشێوەیەکی راستەوخۆ، یان ناڕاستەوخۆ باسی ئاوی کردووە: (ئاوی شیوە سوور، عەینی سەرچنار،

بەکرەجۆ، پردی سەرشەقام، کانیبا، کانێسکان، شیوەی ئاودار، تانجەڕۆ، حەوزی خانەقا..) ئایا بە بێئەوەی خۆمان بە شیکردنەوەی دەلالەتەکانی ئاو لەم بەکارهێنانانەدا خەریک بکەین، ناتوانین جەغد لەسەر توونییەتیی سەردەمی پیریی شاعیر بۆ تاقگەی جوانییەکەی بکەین؟ ئایا گەرماو کەم ئاویی وڵاتی «شام»ی ئەو سەردەمە لەم دێڕانەدا کاریگەرییان بەسەر قەسیدەکەوە جێ نەهێشتووە؟ بێگومان ئەم قۆناغەی ژیانی شاعیر قۆناغی تێپەڕبوون و دەست چزانە بە قۆناغێکی دیکەدا. قۆناغێکە ناوەڕاستی نێوان دوو دژە: (پیری) و (لاوی). هەر بۆیەشە لە پرسەکانیشدا جارێک دەمانگێڕێتەوە بۆ سەردەمی لاویی شوێنەکان و (گەنجێتیی خۆیشی)، جارێکیش گومانی وێرانەیی و تێکشکان و پیرییانمان دەخاتە دڵەوە، بەڵام سەیر لەوەدایە تا کۆتایی نیوەی یەکەمی بەشی چوارەمی قەسیدەکە نالی بەو چاوەوە تەماشای بیرەوەرییەکانی دەکات کە گەنجێتیی خۆی تیایاندا دیارە. زمانی بیرهێنانەوە و وەسفەکانی زمانێکە باس لەو شتانە دەکات کە(هەن)، نەک ئەو شتانەی گومان لە بوونیان پەیدا بووە. نالی دەفەرموێ:

ئاوێکە....

شارێکە...

ئەهلێکی وای هەیە...

ئەم دەربڕینانە دڵنیابوونمان لە گوێدا دەزرنگێننەوە، دڵنیابوونێکی پشت بە بیرەوەری و خەیاڵ بەستوو، بەڵام ئەو دەمەی، ئەوچرکە ساتەی خرۆشی بیرکردنەوە بە شاعیر دەبڕێ و چاویلکەی گەنجێتیی لێدەستێنێتەوەو قەڵەمی پیریی دەداتە دەست، ئیدی دەربڕینەکانی نالیش، زمانە جەغدکەرو بڕوا بە خۆ بووەکەی دەکەوێتە لەرزۆکێ و بە گومانەوە دێتە گۆ:

«داخۆ، دەروونی شەق نەبووە»

«یاخۆ...»

لە ناوەڕاستی بەشی چوارەمەوە، هەموو نیوەی یەکەمی بەیتێک شاییە و نیوەی دووەمی هەمان بەیت شینە. ئەو شاییە شایی سەردەمێکە کە نالی

تیایدا گەنج بوو. ئەم شینەش، شکستی پیریی دروستی کردووە. ئەو شایيە وێنەی خۆشی و ئارامی و تەبایی سەردەمێکمان بۆ دەکێشێ، کە جوانی و خرۆشی تەمەنی شاعیریشی تێدا براوەتە سەر. ئەم شینەش شینی شاعیرێکی حەسرەت دیدەی پەککەوتەیە بۆ ئەو سەردەمەو ئەو جوانییە.

هەر وەکو پێشتریش هێمای ئەوەمان کرد، نالی لە شێوەی بازنەیەکدا جیهانبینییەکەی بە مەبەستی گەیشتنەوەو خۆ دیتنەوە دادەرێژێ و هەتا دێت بازنەکە بە رووی خۆیدا دادەخات، تا ئیدی خۆی دەبێتە مەرکەزی ئەو جیهان و نیشتمان و شوێنەی کە پێشتر بەهۆی ئیستیعارەوە سۆراغی دەکردو دەیویست مانای بۆ بدۆزێتەوە(٤). بەمجۆرەش شێوەی بازنەکە بچووک و بچووکتر دەبێتەوە، حوجرەکەی یەکێکە لەو شوێنانەی کە زێتر سەرنج رادەکێشێ و ژوورەکەشی دوا شێوەی ئەم بازنەی جیهانبینیی نالییەیە. نالی کاتێک سەر دەکات بە ژوورەکەیەدا، وەک ئەوە وایە لە جەستەی خۆی بروانێ. راستە لێرەدا بەخۆی دەگاتەوە، بەلاّم بە وێرانەیی خۆی و بەهیچ جۆرێکیش بواری هاتنە دەرەوەی نییە. جەستەیەک بۆتە (غاری مارو موور)، هەروەکو چۆن حوجرەکەشی خالّییە لە(یارو ئەغیار). سەیر نییە کاتێ نالی حوجرەکەی خالّی لە یارو ئەغیار دەبینێ، لە باسکردنی بیرەوەرییەکانیشی دەوەستێ.. بیرەوەری لەگەلّ کێ؟ ئایا دەردی غوربەت و لێکدانەوە پڕ عەزابەکان، کە وەکو مارو موور لە جەستەی نالیدا لانەیان کردووە، بواری مانەوەی بیرەوەرییەکان دەدەن؟ ئایا ئەزموونی دوورە ولاّتی رێگە دەدات مرۆڤ لە نێوان (رابردوو) و (ئێستا)دا تەرازووی رۆح بە یەکسانی رابگرێت، یاخود (ئێستای غوربەتی) هێندە قورسە کە هیچ کێشێکی رابردوو هاوتای ناکات؟

ئەم هەولّەی نالی لە جیهانی (دەرەوەی کوردستانەوە) بەرەو (ناخی بیرەوەرییەکان) و، لە سەردەمی (پیری)یەوە بەرەو (گەنجێتی) و لە (ئێستای غوربەتییەوە) بەرەو (رابردووی لە دەست چوو) میتۆدی پرۆژەی گەڕانەوەکەی پێکدەهێنێت:

## جیهانی خەیاڵە شیعرییەکە (کوردستان)

بەڵام کاتێک نالی لەم پرۆژەیەدا شکست دەهێنێت و ناتوانێت خۆی لە ناوەڕاستی بازنەی وجوودە پیرۆزەکەدا بەرجەستە بکات و باز بەسەر زەمەنی مێژوویيدا هەڵدات، چ پێشنیاز و ڕێگایەک هەڵدەبژێرێ؟ ئایا ئەم پێشنیازە چ پاشکۆیەکی فەرهەنگی و چ ڕابردوویەکی زەینیی پشتیوانە؟ بۆچی نالی چارەنووسی وجوودی خۆی دەبەستێتەوە بە سەردەمی زێڕینی بابانییەکانەوە و

ئەگەر نەتوانێت ئەو سەردەمە بەدەست بهێنێتەوە، یاخود ئەگەر ئەو سەردەمە گۆڕابێ (کە بێگومان هەر وایشە) بۆچی بە (ڕۆژی نەفخی صوور) مان دەسپێرێ؟

## پەیوەندیی دووەم:
## دەسەڵات - چارەنووس

نالی لە قەسیدەکەیدا بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ باسی (دەسەڵات)ی نەکردووە بەڵام لەو دەمەدا کە دەگاتە ئەوەی مەسەلەی (مەصلەحەت تەوەقفوفە تا یەومی نەفخی صوور) بهێنێتە پێشێ، تەماشا دەکەین دەسەڵات دەوری خۆی بە جوانی بینیوە، بە جۆرێ کە نالی وەکو بوویێکی دەسەڵاتخواز (سلطوي) ئاشکرا دەبێت. با جارێ ئەوە بڵێین هەرکات چەمکی (دەسەڵات) بەکار دەهێنین مەبەستمان دەسەڵاتداری و شێوازی پەروەردەیی سیستەمی بابانە کە بێگومان بە شێوە «تەقلیدی، خۆرهەڵاتی، ئیسلامی»یەکە مومارەسەی حوکمی تێدا کراوە. نالیش وەکو کەسایەتییەکی زۆر نزیک (٥) لە خوانی دەسەڵاتداریی فەرمانڕەوایی بابانییەکانەوە بە شێوەیەکی ڕەمزی و لە نائاگاییدا هەمان پەیڕەو دووبارە دەکاتەوەو، وەکو هەموو مرۆڤێکی دیکەی ئەو قۆناغە نەیتوانیوە لە ژێر تەوژمی ئەو سیستەمی پەروەردەییە خۆی ڕزگار بکات کە فەرمانڕوایانی بابان بە هۆیەوە بیروڕای خۆیان ئاراستە (توجیە) دەکرد. بە بێئەوەی خۆمان بە جۆری ئەو یاسا پەروەردەییەوە خەریک بکەین، چاکترە سەرنجی خوێنەر بۆ ئەو وتارەی هەڵکەوت حەکیم (٦) ڕابکێشم کە تیایدا بە نموونەوە هەندێ هەڵوێستی حوکمدارانی بابانی لە ئاست تەریقەتی نەقشبەندی و کەسایەتیی مەولانا خالید ڕوون کردۆتەوە. ئەگەرچی ناوبراو نەیویستووە سەرجەمی ئەو هەڵوێستانە بە زەمینەی بۆچوونی ئیسلام بۆ دەوڵەت و دەسەڵاتدارییەوە ببەستێتەوە و ئەو ئاکامە بە دەست بهێنێت کە (عەبدوڵڵا عەرەوی) بە «کەمایەسیی ئازادی لە سیستەمی سوڵتان»دا ناوی دەبات، بەڵام بە جوانی

دەستنیشانی ئەو (گرێی پەستی= عقدة الحقارة) یەی کردووە کە دەسەڵاتدارانی بابان لە بەرانبەر دەرەوەی خۆیاندا بوویانە. بەبێ ئەوەی زیاتر بچینە مەیدانی ئەو باسەوە، گەرەکمانە هێما بۆ ئەو رەنگدانەوە رەمزییەی دەسەڵاتخوازی میرەکانی بابان بکەین لە ئەندیشەی نالیدا و ئەمەش ببەستینەوە بەوەی ئایا ئەم رەنگدانەوەیە لە ئەنجامی خۆشەویستیی نالی بۆ فەرمانڕەوایانەوە هاتووە، یا خود بەڵگەیە بۆ دەستبەسەر بوونی فیکریی شاعیر و ملکەچبوونێتی لە ئاست جیهانبینیی سیاسیی دەسەڵاتدارێتیی باباندا، کە ئەمەیش بە «نیشتمانپەروەریی نالی» لێکدراوەتەوە. لەئەنجامیشدا بە پێویستی دەزانین خۆمان بۆ پرسیارێک ئامادە بکەین کە چەندین سەدەیە لە بیرکردنەوەی مرۆڤی کورددا خۆی دووبارە دەکاتەوە. ئەو پرسیارەی بە بێ ئەوەی جەوهەری ئەنجامەکەی بیری لێکرابێتەوە، حەز بە وەڵامدانەوەی دەکرێ..

بەڵام با جارێ بچینەوە بە لای رەمزییەتی دەسەڵات لەجیهانبینیی نالیدا و خاڵی هاوبەشی نێوان نالی و فەرمانڕەوایانی بابان دەستنیشان بکەین.

لە شوێنەکانی دیکەی ئەم باسەدا، بە شێوەیەکی فراوانتر باسی پرۆسەی گەڕانەوەی شاعیرمان بە مەبەستی بە دەستهێنانەوە و خوڵقکردنەوەی رۆژگاری (پیرۆز) کرد، هەروەها باسی ئەوەیش کرا کە نالی سەردەمی گەنجێتیی خۆی لەو رۆژگارەدا بەسەر بردووەو ئەمەش رێکەوتی سەردەمی حوکمی بابانییەکان دەکات. مامۆستا محەمەدی مەلا کەریمیش لە باسی چامەکەی نالیدا دەڵێت: «رابردوو لەم شیعرانەدا سەردەمی حوکمی «بەبە» یە و کاتی پرسیاریش سەردەمی رۆمییەکانە. کەواتە نالی لایەنگریی خۆی بۆ سەردەمی بابەنەکان دەر ئەبڕێ و رێ چوونی خراپتر بوونی باری ژیانیش بۆ سەردەمی رۆمییەکان دائەنێ (٧). هەر لە هەمان باسدا مامۆستای نێوبراو ئەم «لایەنگری»یە دەبەستێت بە «نیشتمان پەروەری»یەوە. بێگومان ئەمانە دوو چەمکی جیاوازن و پێویستە لە بەکارهێناندا بەدیقەت بەکار ببرێ. رێی تێدەچێت لە قۆناغی ژیانی گەلێکدا لایەنگریی فەرمانڕەوایانی ئەو گەلە

نیشانەی نیشتمانپەروەری بێت، بەڵام ئەمە ڕێسا نییە. ئەوەی ئێمە گەرەکمانە جیای بکەینەوە ئەم دوو چەمکەن لە یەکتر، واتە ئەوەی مامۆستا بە لایەنگریی نالی بۆ بابانەکان ناوی بردووە بەلای ئێمەوە بریتییە لە (چارەنووس) بەستنەوە بەو ڕۆژگارەوە کە بابانییەکان فەرمانڕەواییان دەکرد و ئەوەیش کە نالی ناچار کردووە چارەنووسی خۆی بە شێوەیەکی ڕەها بەو ڕۆژگاری حوکمەوە ببەستێتەوە بریتییە لەو سیستەمی پەروەردە سیاسییەی دەسەڵاتداریی بابەنییەکان بۆ ئیحتیواکردنی عەقڵییەتی سەردەم. هەرچی مەسەلەی نیشتمانپەروەریی نالیشە ئەوە بابەتێکی دیکەیە و بواری دیکەی گەرەکە.

بەڵام ئایاچۆن بیری دەسەڵاتدار لە جیهانبینیی شیعریی نالیدا خۆی دەنوێنێ؟

ئەو دەمەی نالی لە پرۆسەی گەڕانەوەکەیدا بە تێکشکان دەگات و ئەو ئەنجامەی نایەتە دەست کە بیری لێکردبۆوە و ناتوانێت بەو (المدينە الفاضلە)یە بگاتەوە کە نرخی وجوودی خۆی تیا دەبینی، ئیدی ئەو پرسیارە سەر هەڵدەدات کە ئایا دەتوانێت لە ژێر سایەی دەسەڵاتێکی تردا بژی؟ بێگومان وەختێک پێشنیازەکەی نالی خۆی دەنوێنێ، وەڵامی ئەم پرسیارەیش دەدرێتەوە: نالی ناتوانێت جارێکی دیکە لە ژێر دەسەڵاتێکی دیدا، جگە لە هی بابانییەکان درێژە بە ژیانی دنیایی بدات. چونکە سیستەمی بابان لە لای نالی سیستەمێکی ئایدیاڵییە، ئایدیاڵیش قابیلی نەمان و تێکشان نییە. بۆیە کاتێک شاعیرەکەمان بە هەواڵی مەرگی ئەم ئایدیاڵەی دەزانێت، نایەت خۆی بە هۆی نەمان و تێکشانییەوە خەریک بکات و بیر لە ئایدیاڵێکی دی بکاتەوە، چونکە هیچ یەکێکی دی جێی لە دەستچووەکەی بۆ ناگرێتەوە. «ئازادی، سەربەستی، عەدالەت و بڕوا» تەنیا لەژێر سایەی ئەو ئایدیاڵەدا مومکین بوون و جەوهەری ڕاستەقینەی خۆیان دەخستەڕوو؛ بەڵام ئێستا، کە ئەوە نەماوە، ئەوا ئەو چەمکانەیش لە مانای خۆیان بەتاڵ دەبنەوەو نرخیان نامێنێ. نالی کە دەڵێ:

ئایا مەقامی روخصەتە لەم بەینە بێمەوە،
یا مەصلّەحەت تەوەققوفە تا یەومی نەفخی صوور
مەرجی هەیە، مەرجەکەیش ئەوەیە ئەگەر بارودۆخی وڵات بەو جۆرە بێت کە نالی خۆی بینیبووی و روخساری بە هەشتی نیشتمان نەگۆڕابێت(٨). ئەوا هەڵبەت هەلێکی باشە بۆ هاتنەوەو نالیش پرسیار لەو هەلە دەکات. خۆ ئەگەر بارودۆخ بەلای وێرانەییدا رۆیشتبێت، ئەوە چاترە خۆمان بەو رۆژە بسپێرین کە لە دایکبوونەوە گەورەکەی تێدا دێتە ئەنجام، واتە «یەومی نەفخی صوور». بەم پێیە، ئەگەر کۆششی شاعیر بۆ گەڕانەوە بە مەبەستی بە دەستهێنانی نرخێکە بۆ وجوود، ئەوە ئەم نرخەیش لەگەڵ ئایدیالێکدا پەیوەندیدارە کە لای نالی بریتییە لە رۆژگاری حوکمی بابانییەکان. ئەو رۆژگاری دەسەلاتەی لە رووخان و نەمان بەدەرە و ئەگەریش شتێکی ئەوتۆ رووبدات پێویستە رەتی بکەینەوە وەکو سیمبولێکی ئەبەدی و نەمر تەماشای بکەین. نالیش بە شێوەیەکی نەبینراو (غیر مرئي) مامەڵە لەگەڵ ئەم سیمبولیزمی دەسەلاتەدا دەکات و وەکو ئایدیالێکی نەمر تێڕوانینە پۆزەتیڤانەکەی خۆی لەسەر چەمکی «دەسەلات» دادەڕێژێ.
ئێستا با بێینەوە سەر ئەو پرسیارەی کە پێشتر نیازی خستنەڕوومان هەبوو: ئایا ئەم تێڕوانینە پۆزەتیڤانەیە لەسەر چەمکی دەسەلات و دەوڵەت، کە تاکو رۆژگاری ئەوڕۆکەیش زەینی مرۆڤی کوردی بەخۆیەوە گیرداوە و لەچەندین گوتاری ئەدەبی و رۆشنبیری و فیکری و سیاسیدا رەنگیداوەتەوە؛ تا چ رادەیەک تیشکێک بەرهەمدەهێنێ بۆ چارەسەرکردنی کێشەکانمان؟ ئایا ئەم کابووسی دەسەلاتەی ئێمە وەکو مەسەلەیەکی ئایدیالی تەماشای دەکەین، تا چ ئەندازەیەک لە بەدیهاتنی دوارۆژماندا دەوری دەبێت؟ ئایا ئەودەسەلاتەی بەدرێژایی چەندین سەدەیە ئیحتیوای فیکری و رۆشنبیریی کردووین، لە حەقیقەتدا چییە؟ ئەمانە ئەو پرسیارانەن تەنیا ئەو قەیرانە وەڵامیان بۆ دەدۆزێتەوە، کە سیستەمی ئەو دەسەلاتە دەیهێنێتە کایەوە.

## بەشی پێنجەم:

# دوو تایبەتمەندیی ئاو

**١- مەرگخوازی**
**٢- ئەبەدییەت**

بە ئاسانی تێپەڕبوون و گوێ نەدان بە ڕەهەندەکانی ئاوی نێو قەسیدەکەی نالی، شەبەقێکی مەزن دەخاتە دەزگای خەیاڵی شاعیرەوە. تەنیا لە ئەنجامی شیکردنەوەی ئەو ڕەهەندانەوە ئیمکانی تێگەیشتنمان لە بیرۆکە میتۆلۆژییەکانی (Myth) ناو ئەندیشەی نالی بۆ هەڵدەکەوێ. نەک هەر ئەوە، بەڵکو هەرگیز لە نێوەرۆکی ئەو ململانێ میتافیزیکییە ناگەین کە شاعیر دەیەوێ بە هۆی دەستنیشانکردنی جەمسەرەکانییەوە شوێن و پلەی بوونی خۆی قامک نیشان بکات.

خۆشبەختانە بوونی توخمی «ئاو» وەکو یەکێک لە بنەما هەرە دیارەکانی قەسیدەکە، بواری ئەوەمان بۆ دەڕەخسێنێ، لەم بەشەی باسەکەدا چەند تێبینییەکی سەرەتایی دەربڕین. لەم تێکستەدا گوتاری ئاو هێندە ئاشکرا دیارە، پێویست بە بەڵگە لەسەر هێنانەوە ناکات، ئاو نەک هەر تەنیا توخمێکی سروشتییە بەڵکو سروشتی سەرجەمی قەسیدەکەیش دەستنیشان دەکات و لەگەڵ هەموو بنەما شیعرییەکانی دیکەدا، لە پەیوەندییەکی هارمۆنیایی پتەودایە. تەنانەت پاڵەوانی خەیاڵە شیعرییەکەیش کە (با)یە سیفەتی ئاویی هەیە و وەکو (هەم میزاجی **ئەشکی تەڕ** و گەرمی عاشقان) حسێبی بۆ کراوە. بەڵام قورسایی ئاو کاتێک بێ هاوتا خۆی دەنوێنێ کە دەبینین لەگەڵ وشەی (خاک/نیشتمان) و چەمکی (یار)دا دوالیزمێک پێکدەهێنێ، کە ئەم دوالیزمە خۆی لە خۆیدا جەمسەرەکانی ئەو ململانێیە

دەردەخات کە شاعیری تێدا دەتلێتەوە: (مردن /ژیان) و (وشک بوون/ سەوز بوونەوە).

پرۆسەی بوونە ئاو (بوون/ئاو) لەگەڵ ئەنجامێکیشدا پەیوەندیدارە کە نالی بە (حوضوور)ی ناو دەبا. بەڵام باجارێ لە چۆنایەتیی سروشتی ئاوەکەی نالییەوە دەست پێبکەین.

لەلای نالی نەک هەر هیچ شتێک بە پاکی نەماوەتەوە و «گەرد» و «کودووراتی زەمەن» هەموو شتێکی داپۆشیوە، بەڵکو (ئاو) یش ئەبەدییەتی پاکیی خۆی لە دەست داوە و بۆتە توخمێکی دوو لایەنەی دژ بە یەک و پێویستی بە خۆشتنەوە هەیە تاکو سیفەتی ژیانبەخشی ئاو زاڵ بێت بەسەر سیفەتی ئیستیبدادی و ئەهریمەنییانەی ئاودا. چاوی نالی سەرچاوەیەکی ئاوە، یان سەرچاوەی ئەشکە. ئەشکیش دیوی ئەهریمەنی و مەرگخوازیی ئاوە. شاعیر خۆی دەڵێ: ئەگەر فرمێسکی چاوانم (تیژ و سوێر و بێ سەمەر) نەبوونایە، دەمگوت لە جۆگەی بەکرەجۆ دەچن. تیژی و سوێری و بێ سەمەریی دەلالەت لە سروشتی مەرگخوازی ئەشک دەکەن هەر کاتێکیش ئەشک هێندەی جۆگەی (بەکرەجۆ) زۆر بێت، واتە لایەنی ژیانبەخشیی ئاو دەمرێ. مەرگی ئاو بەفرمێسکبوونی هەموو ژیانە کە ئاو سەرچاوەکەی بوو. لەم کاتەدا دەبێ رێگایەک هەبێ تا مەرگی لایەنە ژیانبەخشەکەی ئاو لە ئیستیبدادییەتی ئاو رزگار بکرێ، واتە شوشتنەوەی ئاو بە ئاو... نالی رێگای چارەسەری ئەم کێشەیە بە خۆ شوشتن لەناو سەرچاوە پیرۆزەکە دەستنیشان دەکا، واتە خۆشتنەوە لە ئاوی پیرۆزی: (شیوەسوور، بەکرەجۆ سەرچنار و هتد)دا:

وەک ئاهەکەم دەوان بە هەتا خاکی کۆیی یار
وەک ئەشکەکەم رەوان بە هەتا ئاوی شیوەسوور
بەو ئاوە خۆت بشۆ لە کودووراتی سەر زەمین
شاد بن بە وەصلی یەکدی :کە تۆی طاهیر ئەو طەهوور

کەواتە ئاوی شێوە سوور (لە پاشانیشدا ئاوی: سەرچنار، بەکرەجۆ، حەوزی خانەقا و هتد) سەرچاوە پیرۆز و ژیانبەخشەکانی ئاون، یان وەکو نالی دەڵێت: (طەهوور) و پاککەرەوەن. ئەم گەڕانەوە و شاد بوونە لە (وەصل) دا، خۆی لە بنەڕەتدا (وشکاو داهاتنی) لایەنی ئەهریمەنی ئاو پێشان دەدات، کە ئەمەیش مانای (حوضوور) پەیدا کردنە لە بوونە ئەبەدییەکەدا، ئەمەش دوای ئەوەی (خود)ی بووەکە خودێتیی خۆی نەفی دەکات. ئەم بیرە فەلسەفییە بە جوانترین و قووڵترین شێوە لەم بەیتە شیعرەی نالیدا دەربڕاوە:

«لەم شەرحی دەردی غوربەتە، لەم سۆزی هیجرەتە
دڵ رەنگە بێ بە ئاو و بە چاوا بکا عوبوور»

«شەرحی دەردی غوربەت و سۆزی هیجرەت» دەلالەتێکی دیکەی ئەشک رشتن و موبتەلا بوونن بە بیماری ئەو مەرگەی کە غوربەتی شاعیر و دووریی لە سەرچاوە بێگەردەکەیەوە، بە هۆی لایەنی مەرگخوازی ئاوەوە هێناویێتییە دی. نالی پێشتر گوتوویەتی:

هەم هەم عەنانی ئاهم و هەم هەم ریکابی ئەشک

بەڵام گریمانی ئەوەی کە (دڵ رەنگە بێ بە ئاو) خۆی بە تەنیا مانای پاکبوونەوە، گەیشتنەوە بە سەرچاوە دەگەیەنێت. واتە شاعیر بە حەقیقەتی (وەصل) دەگاتەوە و لە ئەنجامیشدا دەبێتە ئاو، دەبێتە جەوهەر و کەینوونە چونکە بە چاوا عوبوور دەکاتەوە. ئەمەش دەلالەت لە ئارامی و هێور بوونەوەی رەوتی ژیانە پیرۆزەکە دەکات. ئەم بیرە، هەر (وحدة الوجود)ەکەیە کە پێشڕەوانی سۆفیزم پەیڕەویی لێدەکەن و لە سەر ئاستی پەیوەندییەکی یەکلایەنی بڕوایان پێی هێناوە. ئەو پەیوەندییەش بریتییە لە خۆنەفیکردن لە ئاست وجوودی خوادا، چونکە خوا سەرچاوەی پاکی هەموو (بوو) یەکەو مرۆڤ کاتێک بە قۆناغی «توانەوە لە خوادا» گەیشت، ئیدی خۆی لە یاد دەکات و حەللاج گوتەنی دەبێتە خوا.

لە لای نالی ئەم پرۆسەیە کێشەیەکی مەرگەساتییە و لە بەردەوامییەکی

هەمیشەییدایە. نالی دەڵێت: لە ئەنجامی بەردەوامبوون لەم شەرحی دەردی غوربەتە، کە بە هۆی ئەشکەوە دەری دەبڕێ، واتە بە هۆی زمانی مەرگخوازی ئاوەوە: ڕەنگە (دڵ)، کە خۆی لە خۆیدا سەرچاوەی ژیانە، پاش مەرگی غوربەتی و لەهەندەران سەرنانەوە، ببێتەوە بە (ئاو). چونکە «شەرحی دەردی غوربەت واتە: ئەشک ڕشتن» لەگەڵ ئەوەدا بەڵگەی مەرگی یەکەمی شاعیرە، لە هەمان کاتیشدا بەڵگەی گەیشتنەوەیە بە سەرچاوە، لە بەر ئەوەی «دڵ» وەکو سەرچاوەی ژیانەکە نەفی دەکرێ و دەبێتەوە جەوهەر کە «ئاوە». ئاویش بە چاوا عوبوور دەکاتەوە. واتە پرۆسەکە بە نەفیکردنی خودی شاعیر و تێکەڵبوونەوەی لەگەڵ سەرچاوەی پیرۆزدا کۆتایی دێت.

ئەم تێگەیشتنە دوو چۆنایەتی بۆ سروشتی ئاو لە سەر بنەمای دوالیزمی قایل دەبێ: یەکەمیان ئاوێکە «تیژ و بێ سەمەر و گەرم و سوێر و سوور» کە ئەم خەسڵەتانەش هەموویان بۆنی مردنیان لێدێ و سەرچاوەی ئەم ئاوەش چاوی نالی خۆیەتی. دووەمیشیان ئەو ئاوە پاککەرەوەیەی شاعیر لە شێوەی خۆرێکی ڕۆشندا دەیبینێ و سەرچاوەکەشی لە دەرەوەی خۆیەتی.

**ئاو / خۆر:**

پەیوەندیی ئاو و خۆر لەم قەسیدەیەدا چەند ئاستێکی بە خۆیەوە گرتووە، بۆ نموونە: نالی لە کاتی باسکردنی ئاوی سەرچناردا دەڵێت:

چەشمێکە میثلی خۆر کە لە صەد جێ بە ڕۆشنی
فەورانی نووری صافە لە سەر بەردی وەک بلوور

**ئەو جا کاتێک ئەو بەیتە و نیوەبەیتی:**

«دڵ ڕەنگە بێ بە ئاو و بە چاوا بکا عوبوور» بەراورد دەکەین، بە ئاشکرا دەردەکەوێ کە نالی خۆر و ئاو لە یەک پلەی گرنگیی وزە بەخشیندا سەبارەت بە دڵی خۆی دەبینێت. چونکە لێدانی دڵ بەڵگەیە بۆ زیندوویەتی

هەروەکو چۆن تیشکی خۆریش پێویستییە بۆ بەردەوامیی ژیان. جا لەبەر ئەوەی شاعیر دەڵێ: «چەشمێکە میثلی خۆر) و پاشان ئیمکانی/دڵ بوون بە ئاو (کە لە هەمان کاتیشکدا بوون بە تیشکە» دەخاتە بەردەست، ئەوە مانای پڕکردنەوەی وشەی «تیشک» و «ئاو»ە بە ناوەرۆکێک کە ئەو ناواخنەیش ژیانە. ژیانیش ئەوەیە بە چاوا بکا عوبوور و تیشک بداتەوە، یان لە روخسار و سیمادا رەنگ بداتەوە. لە زمانی کوردیدا گەلێک نموونە ئاخاوتنی وا هەیە کە دەیسەلمێنن دەم و چاو، یان روخسار بەگشتی «ئاوێنەی ناخە» و زیندوویی ژیانی ناوەوەی مرۆڤ پەرچدەکاتەوە. بۆ نموونە کورد دەڵێ: چاوی گەش، چاوی قرژاڵی (لەبەر بریسکانەوە و گەورەیی چاوی قرژاڵ)، چاوی قەترانی (قەتران ڕەشاییەتی ڕەشییەکە لە تاریکییان دەبریسکێتەوە)، یاخود دەگوترێ: دەڵێی مانگە، دەڵێی تۆپە گوڵە و گەلێکی دی لەم بابەتە.

## ئاو/خۆر/خاک:

دوای ئەوەی خۆر و ئاو وەکو دوو سەرچاوەی ژیانبەخش لە شیعرەکەی نالیدا ئاشکرا بوون، پێویستە هێما بۆ پەیوەندییەکی دیکەش بکەین کە ئەم دوو توخمە زیاتر لە تەباییدا دەهێڵێتەوەو بەڵگەی قسەمان پتەوتر دەکات.

نالی فەرمانی رۆیشتنەوەی رەگەزە هەڵبژاردەکەی، واتە «با» تاکو «خاکی کۆیی یار» دەردەکات و ئەوجا رایدەسپێرێ کە «بەو ئاوە» واتە ئاوی «خاکی کۆیی یار» خۆ لە کودووراتی زەوی پاک بکاتەوە. چونکە لە (خاکی کۆیی یار) دا ئاوێک هەیە بە ناوی «شیوە سوور» کە پێویستە ئەم خۆی بەو ئاوە بشواتەوە تا ئەمی «طاهیر» و ئەوی «طەهوور» لە «وەصل»ی ئەبەدییەتی ژیاندا پێک بگەنەوە. ئەم تەئویلە لە کاتێکدا ئامانجی خۆی دەپێکێ، کە ئاگاداری ئەوەبین چەمکی (خاک/نیشتمان) سێمبولیزمی «دایک»یش لە خۆیدا جێدەکاتەوە: دایک و نیشتمان لەوەدا هەردووکیان شوێنی فەڕ و زانەوەن، ئەوە یەک سروشتیشان هەیە. پێشتریش لە لایەنی ژیانبەخشی و ئەبەدییەتی ئاو دواین و نالی خۆیشی ئەمەی ناو ناوە پاک

بوونەوە و «وەصل». دیارە هەمـوو گـەیشـتـنەوە بە سـەرچاوەیەکی پیـرۆزیش دەلالەت لە بەدەست هێنانی نەمری دەکات. ئەمەش هەمان پرۆسەیە کە خدر (خـضـر) دەیویست بە هۆی دۆزینەوەی (ئاوی حـەیات)ـەوە نەمـری بەدەست بهێنێت. هەروەها پەیوەندیی (خـۆر/ئاو)یشـمـان سەبارەت بە ژیان، لە یەک ئاستی گرنگیدا لێکدایەوە، بۆیە لێـرەوە دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە بلـێین: هەر یەکێـک لەو رەگەزانە لەگەڵ ئەوەی دیکەیاندا تایبەتمەندییـەکی هاوبەش کـۆیان دەکـاتەوە، کـە ئەو تایبـەتمەندییـە هاوبەشـەش بریـتـیـیـە لە هەبوونی ماهیەتی ژیان تیایاندا و لێرەشەوە دەبنە کەرەستەی گونجاو لەبەردەم شاعیردا تاکو ژیاندۆستیی خۆی لەرێگەیانەوە دەربڕێ.

## بەرد/سەنگ:

سروشتی خـاک (بە لەبەرچاوگرتنی ئەوەیش کە گوتمان لەگەڵ خۆر، ئاو و دایکدا هاوبەشە) لەگەڵ سـروشـتـی «بەرد/ سەنگ»یشـدا هەمـان شـتـە. بەر لەوەی بچـینە سەر شیکردنەوەی ئەم لایەنە با دەستنیـشـانی ئەوە بکەین کە نالی چۆن و لە چ کـاتێـکدا «بەرد/ سـەنگ» بەکـار دەهێنێ و پەیوەندیی ئەم بەکارهێنانەش لە دواهەمین دێڕی قەسیدەکەدا چۆن خۆی دەنوێنێ؟

**بەکارهێنانی یەکەم:** فەورانی **نوور**–ی صافە/ لەسەر **بەرد**–ی وەک بلوور {کۆکردنەوەی (نوور/ بەرد)}.

**بەکـارهێنانی دووەم:** یەنبـووعی نوورە دابرژێنی لە/ کـێـوی طوور {کۆکردنەوەی (نوور/ کێو)}.

**بەکارهێنانی سێهەم:** بەردی خەراجی/ گەوهەر و.. {کۆکردنەوەی (بەرد/ گەوهەر)}.

**بەکـارهێنانی چوارەم:** ئەوەیە کـە نالی لەدوا بەیتی قـەسیـدەکـەدا «یاری سەنگ دڵ» و «شەوقی تۆ» کۆ ئەکاتەوە.

ئەمجا بۆ ئەوەی خۆمان لە تێگەیشتنە تەقلیدییەکەی «یاری سەنگ دڵ» کـە بە مـانای «یاری دڵڕەق» لێکدراوەتەوە رزگـار بکەین، پێـویسـتـە

روونکردنەوەی زیاتر لەسەر چۆنیەتیی ئەو چوار بەکارهێنانەی نالی بدەین بە دەستەوە:

لە بەکارهێنانی یەکەمدا نالی («عەین»ی سەر چنار) بە خۆرێک دەچوێنێ کە تیشکی خۆی بە سەر بەردی وەک بلووردا پەخش دەکاتەوە و بەو جۆرەش وزەی ژیان لە رێگەی (ئاو/خۆر)ەوە دەکرێتەوە دەروونی بەردەوە. واتە بەرد دەبێتە هەڵگری تایبەتمەندیی خۆر و ئاو، کە بریتییە لە ژیان و زیندوویەتی.

لە بەکارهێنانی دووەمدا کێوی طوور (لەگەل ئەوەدا سیفەتی رەقی و وشکی لەگەڵ بەرد کۆیان دەکاتەوە)، دەبێتە سەرچاوەی رووناکی. واتە وشکی و رەقیی بەرد/ کێو رێگر نییە لەبەردەم هەبوونی نوور و رۆشنایی/ ژیان و بەردەوامیی تیایاندا..

لە بەکارهێنانی سێیەمدا، ئەگەرچی گەوهەر هەم بەهۆی بەنرخی و هەم بەهۆی بریقە و رووناکییەوە بەهای تایبەتی خۆی هەیە، بەڵام هێشتاکو بەرد گرەوی لێدەباتەوە و لە گەوهەر بە نرختر دەخەملێندرێ!

کەواتە لەبەردەکانی نالیدا نوور و رۆشنایی و ژیان خۆیان حەشار داوە. کاتێکیش دەڵێت:

حاڵی بکە بە خوفیە: کە ئەی **یاری سەنگ دڵ**

«نالی» لە شەوقی تۆیە دەنێری سەلامی دوور

دیسانەوە جەخت لەسەر ئەو پەیوەندییە دەکاتەوە و روو دەکاتە یاری دڵ وەکو بەرد رۆشنایی تیا حەشار دراوی و پێی دەڵێ، لە ئەنجامی شەوق بڕینتە من وزەی سەلامی دوور ناردنەوەم تێدا ماوە.

ئێستا پرسیاری ئەوە دێتە پێشەوە: دەبێ ئەم یارە کێ بێت کە جورمی رۆژگار رۆشنایی ژیانی لە دڵدا پێ شاردۆتەوە؟ تۆ بڵێی کەسێک بێت یان نشتیمانێک؟ یاخود تەنیا بووێکی رۆحییە کە نالی بۆ هێورکردنەوەی ئازارەکانی پەنای بۆ دەبات؟

**ناوەڕاستی ساڵی ١٩٩١**

# پێشەکییەکی گشتی

لەبەشی یەکەمی ئەم کتێبەدا بەدوای ئەو رەگەزانەدا وێڵ بووم کە نالی دەیویست بە هۆیانەوە، وەڵامێک بۆ کێشە رۆحییەکانی خۆی بدۆزێتەوە، واتە عەودالّی ئەوەبووم پەیوەندیی نالی بە دەرەوەی خۆیەوە (نیشتمان) وەکو سەرەتایەک بدۆزمەوە تا دواجار ئاکامێک بهێنمە دەست کە ئەو ئاکامەش جیهانبینیی شاعیرانەی نالییە و دەربڕی بەشێکە لەسەرجەمی نائاگایی بە کۆمەڵی ئینسانی کورد.

لەم باسەدا دەمەوێت لە کلاورۆژنەیەکی ترەوە سەرنجی خوێنەر بۆ جیهانبینیی شاعیر رابکێشم. هەڵبەتە ئەم باسەش لە رووی مەبەستەوە درێژەدانە بە بەشی یەکەمی پرۆژەکەمان، بەو مانایەی لێرشدا کۆششم لەسەر ئەوە بەندە لە رێی بەکێشەکردنی هەندێ دیاردە و پاشانیش قسە لەسەرکردنیان برێک لەو پێناسەیە نزیک بکەومەوە کە نالی ویستوویەتی لە رەوتی پرۆسە شیعرییەکەیدا، تاریفی بوونی ئینسانییانەی خۆی پێ بکات.

دیارە ئەزموونی نالی لە قەسیدەی **قوربانی تۆزی رێگەتم**-دا بەنیسبەت ئەزموونی قەسیدەی (مەستوورە)وە جیاوازە، بەڵام وەک لەم باسەدا ئاشکرا دەبێت، ئەو ئەنجامەی شاعیر لە هەردوو قەسیدەکەدا دێتەدەستی هەر یەک شتە. ئەمەش بۆ قەڵەندرێکی مەزنی مەرگەساتبینی وەکو مەلا خدری نالی، کە دیدێکی تایبەتی بۆ ژیان و دونیا هەیە، نابێتە جێی سەرسوڕمان. بۆ چوونە نێو ئەم باسەش وا لەخوارەوە چەند تێبینییەک دەخەمە ڕوو:

**یەکەم:** هەرکات ناوی قەسیدەی مەستوورە دێت، یەکسەر لایەنی رووهەڵماڵینی ئەم قەسیدەیەمان بیر دێتەوە، یاخود سەراپای کۆششمان

تەرخان دەکەین بۆ سەلماندنی ئەوەی کە مەبەستی شاعیر روو هەڵماڵین نەبووەو مەبەستی پیا هەڵگوتن بووە، لە کاتێکدا هیچ کام لەو دوو زاراوەیە لە باسەکەی مندا رووبەرێکی ئەوتۆ بە خۆیانەوە ناگرن. ئەو بەشەش کە بۆ لایەنی جنسانی قەسیدەکە تەرخان کراوە، جیاوازە لە هەموو ئەو بۆچوون و لێکدانەوانەی پێشتر لەم بارەیەوە بە ئەنجام گەیشتوون و من لەبەر درێژە نەدان بەم باسە نامهەوێت سەرجەمی ئەو بۆچوونانە بەسەر بکەمەوە.

**دووەم:** خوێنەر نابێت چاوەڕێی ئەوە لەم دێڕانە بکات کە لە ئاستە مێژووییەکەدا لە مەستوورە دەکۆڵرێتەوە. واتە بە پشت بەستنمان بە سەرچاوەو بەڵگەنامەی مێژوویی، چونکە بەلای منەوە گرنگ نییە، ئەو مەستورەیەی نالی باسی کردووە، هەمان مەستوورە بێت کە سەرچاوەکان لێی دەدوێن. نەک هەر ئەوە بەڵکو هیچ بەلامەوە گرنگ نییە کە مەستوورەی نێو قەسیدەکە هەر دەبێت ناوی مەستوورە بێت، بگرە دەکرێ ناوێکی دیکەشی هەبێت، ئەمەش لەبەر ئەوەی من لە «فەزای خەیاڵی نالی» دەکۆڵمەوە کە «زمان»ی کردۆتە دەربڕی راستەوخۆی ناوەوە و توانیویەتی کائینێکی ئینسانی بخولقێنێ تا لەرێگەی قەسیدەکەیەوە (دەربڕینە زمانییەکەیەوە) باسی پەیوەندیی خۆی و ئەو کائینەی دیکەمان بۆ بکات. بۆیە دووبارەی دەکەمەوە، کە هیچ گرنگ نییە لەم باسەدا مەستوورەی نالی هەمان «ماه شەرەف خانم»ی بنەماڵەی ئەردەڵانی سنەو خێزانی «خوسرەو خانی ناکام» بێت، هێندەی ئەوەی مەبەستە مەستوورە لە بۆتەی «شیعرییەتی نالی» دا ببینمەوە.

**سێهەم:** بێگومان من نامەوێت لە روانگەی تەکنیکی رەخنەی کلاسیکی عەرەبییەوە، بەتایبەتیش بەلاغەی عەرەبییەوە، تەماشای شیعری نالی بکەم. بەڵام پێویستە خوێنەر ئاگاداری ئەوە بێت کە تێگەیشتنی ئێمە بۆ قەسیدەی نالی بناخەیەکی بەلاغیی هەیە و سەرچاوەی هەرە گرنگیش بۆ ئەو

تێگەیشتنە دیوانی گەورەی نالییە کە مامۆستایان مەلا عەبدولکەریمی مودەریس، فاتح عەبدولکەریم و محەمەدی مەلاکەریم لێکیان داوەتەوە. واتە هەرچەندە ئێمە لە دەرەوەی تەفسیری نێو دیوانی نالی قسان لەسەر شیعری نالی بکەین، دواجار هەمان تەفسیر و شەرح بۆخۆی یەکێکە لەو سەرچاوە گرنگانەی تێگەیشتنمان لە نالی بۆ ئاسان دەکات و لە هەمان کاتیشدا بواری ئەوەمان بۆ دەڕەخسێ لە مەنهەجی شەرح و تەفسیر بچینە دەرەوە و بۆ تێگەیشتنی زیاتر لە شیعری نالی پەنا ببەینە بەر مەنهەجی دیکە.

**چوارەم:** هەر دەقێک خاوەنی کۆمەڵێک زەمینە و پێشزەمینەی تایبەتە بەخۆی، کە ئەم زەمینە و پێشزەمینانەش لە پێکهاتنی گوتاری هەمان دەقدا ڕۆڵێکی گرنگ دەگێڕن و سنووری جیهانبینیی ئەو دەقە دەستنیشان دەکەن و دواجار ئیمکانییەتی ئەوە دەڕەخسێنن تا دەقێک بتوانێ خۆی لە دەقێکی دیکە جوێ بکاتەوە. من بۆ ناسینەوەی بونیادەکانی دەقی مەستوورە زیاتر خۆم بەستۆتەوە بە دەقی مەستوورەوە نەک پەنابردن بۆ دەقەکانی دیکەی نالی. واتە گوتاری نێو دەقی مەستوورە بە بەراورد لەگەڵ گوتاری دەقەکانی دیکەدا ناخوێنمەوە. چونکە ئەگەر ئەو کارە بکەم ئەوا لە ستراتیژی لێکۆڵینەوەکەم دەچمە دەرێ و ئەو ئاکامەم دەستگیر نابێت کە دەشێ دوای خوێندنەوەی دەقی مەستوورە بێتە دەستمان. دیارە شتێکی ئاشکرایە کە ڕەخنەی ئێمە زۆر کەم ئازادیی ئەوەی بە دەقێک ڕەوا دیتووە کە ئەو دەقە تەنیا لەبەر ڕۆشنایی بونیادەکانی هەمان دەقدا بخوێنرێتەوە، کە ئەمەش بە پلەی یەکەم بەرەنجامی ئەو میتۆدە سواوانەی نێو ڕۆشنبیریی ئێمەیە لە بواری لێکۆڵینەوەی دەقی ئەدەبیدا.

## بەشی یەکەم:

# ترۆری جەستە و نیگای حەرام

قەسیدەی مەستوورە بە هۆی گەلێک بەڵگەوە خۆی لە سەراپای ئەو دەقانە جوێ دەکاتەوە کە شاعیرانی قەڵەمڕەوی ئیسلام لەبارەی ئەندامەکانی لەشی ئافرەتانەوە بەرهەمیان هێناون. زۆربەی ئەو شاعیرانە مەلی خەیاڵ و بیرکردنەوەیان چەندێ ئازاد و بەرزە فڕ بوبێت، لە باسکردن و وەسفی ئەندامە «قەدەغە» کراوەکانی لەشی ئافرەتدا بوێر نەبوون(١). خۆ ئەگەر چەند کەسێکیشیان ئەسپی سەرکەشی خۆیان بەرەو رووبەری جەستەی ئافرەت تاودابێ، ئەوا زیاتر بەسەروسیما و شان و مل و گەردن و سینەوە گیرساونەتەوە، یا خود لە ژێرڕاوە ئەوپەڕی ناوی ساق و پێیان بە زاردا هاتووەو لە نەرمەی راندا وەستاون(٢).

نابێ ئەو راستییە لە یاد بکەین کە ئەو شاعیرانە وەسفی ئەو ئەندامانەیان بە چ ئاستێکی جوانکاری و داهێنان گەیاندووە، جا ئیدی ئەوان لە سیمای دڵدارە مەجازییەکانیاندا، سیمای دڵداری راستەقینەی خۆیان دیبێتەوە، یان هەر بەڕاستی مەبەستیان ئافرەت بووبێ و وەسفی ئەو، ئەمەیان باسێکی ترەو ئێرە شوێنی نییە. ئەوەی ئێمە دەمانەوێ قسانی لەبارەوە بکەین، دەقی مەستوورەیە کە شاعیری گەورەمان نالی تیایدا پێی ناوەتە شوێنێک و قەڵەمڕەوێ، کەمتر کەسانێ وێراویانە لێی نزیک ببنەوە. ئایینی ئیسلام بە شێوەیەکی رەها دیمەنی ئیروتێکای ئەندامەکانی لەشی ئافرەتی یاساخ کردووە، قورئان بە ئاشکرا و چەند جارێ حوکمی ترۆری جەستەی ئافرەتانی داوە. ئەوجا بۆ ئەوەی لە گرنگیی ئەو هەنگاوە بگەین کە مەلا خدر لە کۆمەڵگایەکی موتڵەقی ئیسلامیدا سەبارەت بە باس و تاریفی

ئەندامی جنسی ئافرەت هەڵیهێناوەتەوە، پێویستە لەو خاڵەوە دەستپێبکرێت کە قورئان ئەو دیمەنانەی یاساخ کردوون کە دەبنە هۆی بێدارکردنەوەی هەستی شەهوەترانی. لۆژیکی قورئان و ئامۆژگارییەکانی بۆ مسوڵمانان بەردەوام ئەوە دووپات دەکاتەوە، کە نابێت مسوڵمان دیدەی بچێتە سەر قەڵەمڕەوی حەرام. قورئان فەرمان بۆ پێغەمبەر دەنێرێ تا ئافرەتانی مسوڵمان ئامۆژگاری بکات و پێیان بڵێ کە چاوی خۆیان ببەستن و دامەن و نامووسی خۆیان بپارێزن. سەرپۆشەکانیان بئاڵێنن لە گەردن و ملیانەوە (سوورەی نوور ئایەتی ٣١). هەر لێرەشەوە، ژنانی پێغەمبەریش نموونەی ئافرەتانی تەقواکار و لە خوا ترسن. هەر بۆیەشە کاتێک قورئان ڕوویان تێدەکات قورسایی ئامۆژگارییەکانی چەندین جار زیاد ئەبێ چونکە: ئەی هاوسەرانی پێغەمبەر ئێوە وەکو هەر ئافرەتێکی تر نین، ئەگەر تەقواکارن، ئاگادار بن لە قسەکردندا نەرمیی ژنانەیی و پەیڤی شەهوەت ئاڵوود دەکار مەهێنن، نەبا ببنە هۆی تەماحی چاوچنۆکان (سوورەی ئەحزاب، ئایەتی ٣٢) پاشان داوایان لێ دەکات لە نێو ماڵەکانیاندا ئۆقرە بگرن و وەکی سەردەمی جاهیلی بۆ خۆ نواندن و ئارایشکردن نەچنە دەرەوە (احزاب، ٣٣).

بێداربوونەوەی هەستی جنسانی بەهۆی باسکردنی ئەندامە قەدەغەکراوەکانی لەشی ئافرەتەوە، مەسەلەیەکە لە حەدیس، فەرماییش و فەتوای زۆربەری ڕێبەرانی ئایینی ئیسلامدا باسی لێوەکراوە و بیریارە مسوڵمانەکانی هاوچەرخیش لەسەر هەمان بنەماوە هەرجۆرە بەرکەوتنێکی جەستەیی نێوان ئافرەت و پیاو بە حەرام ناو دەبەن. چونکە پێدەچێت ئەو بەرکەوتنە هەستی شەهوەترانی بە دووی خۆیدا بهێنێ، تەنانەت تەوقە کردنیش بە دەسکێشەوە، ئەگەر نییەتی چێژ و ڕەیبە لە ئارادا بێت هەر حەرامە(٣).

ئەم بونیادە ئایینییە لەسەر ئاستی گوتاری شیعریشدا ڕەنگی داوەتەوە و شاعیرانی قەڵەمڕەوی ئیسلام بە شێوەیەکی گشتی پەیڕەوییان لە «قاعدە»یەک کردووە، کە بە پێی ئەو قاعیدەیە باسکردنی ئەندامی جنسی

ئافرەت پشتگوێ خراوە(٤). بەم پێیەش ئیدی دەرەوەی یاسا نەبۆتە جاییز و بەگومڕاکەر و (خیلافی شەرع) حسێبی بۆ کراوە و دەرچوونێکی یاخیگەرانە بووە لە خیتابی قورئانی. جا لەبەر ئەوەی کەباس و تاریفکردنی ئەندامی نێوبراو پێویستی بە بەکارهێنانی وشە و پەیڤە و پەیڤیش لە روانگەی ئیسلامەوە دەچێتە خانەی دوالیزمی (چاک و خراپ)ەوە، ئەوا نەک هەر خودی باس و تاریفکردنەکە گومڕاکارییە، بەڵکو ئەو زمانەیش کە تاریفەکەی پێدەکرێ، زمانێکی بەدو خراپە، زمانێک کە دووچاری گەورەترین عەزاب دەکرێت. چونکە «خوای گەورە بە شێوەیەک زمان سزا دەدات کە هیچ ئەندامێکی تری لەش وەها سزا و ئەشکەنجەیەکی بەخۆیەوە نەبینیبێت، جا ئەو زمانە روو دەکاتە خوای گەورەو دەڵێت: ئەی خوای گەورە بە سزایەک ئەشکەنجەت داوم کە هیچ شتێکی ترت وەها ئەشکەنجە نەکردووە، لە وەڵامدا پێی دەوترێت: وشەیەک لە تۆ دەرچووە کە رۆژهەڵات و رۆژئاوای زەویی گرتۆتەوە، بە هۆیەوە خوێنی حەرام رژێنرا،ماڵی حەرام تالان کرا، ناموسی حەرام پێ شێل کراو قەترەی تکێنرا و دەستدرێژی کرایە سەری، بە گەورەیی و شکۆی خۆم سوێند دەخۆم بە شێویەک سزاو ئەشکەنجەت بدەم کە هیچ ئەندامێکی تری لەش وەها سزایەکی نەدرابێت»(٥).

ئیدی بە پێی ئەم روانگەیە، نەک هەر تەنیا نالی لە باسی جوگرافیای ئازاد بووی لەشی ئافرەت لایداوە و فەرمانی خودای پشتگوێ خستووە، بەڵکو بەهۆی گومڕاکردنی وشە و زمانیشەوە سزایەکی سەختی بەخۆی رەوا دیتووە. ئەمە جگە لە خۆ جیاکردنەوەی شاعیرەکەمان لە بەشێکی زۆری هاوەڵە شاعیرەکانی.

هەنگاوی نالی لەو ئاستەدا هەنگاوێکی یاخییانەیە، کە کوردستانی سەردەمی نالی و ناوچەی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست، بیری لەو جۆرە یاخیبوونە نەکردبۆوە کە مەلا خدر رچەکەی شکاند. نالی بەم کارەی نرخ و بەهای ئەندامێکی لەشی ئافرەتی لەپانتایی نووسیندا هێنایەوە گۆڕێ، کە دەبوو ئەو ئەندامە لەسەر سوونەتی موحەممەدی خەتەنە کرابا و لەسەرجەمی بوونی

ئینسانییانەی ئافرەت جودا بکرێتەوە. یاخیگەریی ناخودئاگایانەی نالی(٦) کاتێک بە پلەی هەرە بەرزی خۆی دەگات کە دەبینین تێڕوانین و بینینی شاعیر بۆ ئەندامی جنسی ئافرەت سەرجەم و بە شێوەیەکی ئاشکرا، «شیرنایەتی» ئەو ئەندامە دەردەخەن، نەک ژاراوی بوونی و گومڕایی(٧).

گومان لەوەدا نییە کە دەروونی شاعیر دەیەوێ لە ڕێگەی زمانیەوە خۆی ئاشکرا بکات (کە پاشان بە دوورودرێژی دێینەوە سەری)، بەڵام پێویستە لە ئێستاوە ئاگاداری ئەوە بین کە «دەروون»ی نالی دەروونێکی پاک و بێگەردە، هەر بۆیەشە لەسەر ئاستی زمانیشدا شیرین خۆی بەیان دەکات، کە دوا جار ئەم زمان شیرینییە دەبێتە بەڵگەیەک بە ڕووی ئەو تاوانانەدا کە دەشێ بۆ گوناهبارکردنی شاعیر خۆیان قوت بکەنەوە.

هەرچۆنێک بێت ئەم دەقە بەرلەوەی گوزارشت لە ناخی هەراسانبووی مرۆڤێک بدات و ڕووی پەردە لەسەر کەلێنی جنسانی ئەو مرۆڤە هەڵداتەوە، دەقێکە ڕاپۆرت لەسەردەم و ژینگەیەکی ئایینیی ئەوتۆ دەدات کە ترۆرکردنی جەستەی ئافرەت و بەها ئینسانییەکانی، یەکێک بووە لە خاسیەتە هەرە دیارەکانی ئەو ژینگەیە. ئەم دەقە بە پلەی یەکەم گوزارشتێکە لەسەر ڕەنگدانەوەی گوتاری قورئانی لەئاست لەشی ئافرەتدا. بەرلەوەی نالی پەردە لەسەر بوونی فەردیی خۆی هەڵماڵێ، پەردەی لەسەر ئەو ژینگە شارستانییە هەڵماڵیوە کە سزای ئافرەتی بە شەللاق و زەربەت لێدان بڕیوەتەوە و بە کێڵگەی پیاوانی ناوبردوون (و نسائکم حرث لکم).

بە بۆچوونی من گرنگیی ئەم دەقە لێرەدا دەردەکەوێ، چونکە تا ئێستا نەک یاسا ئایینی و دەزگاکانی فیکری دینی لە ناوچەی ئێمەدا نەیانتوانیوە یاساخی بکەن، بەڵکو خۆشیان لێحاڵی نەکردووە و نەیان ویستووە لەبەر یاسا ئایینییەکاندا ئەم دەقە لێک بدەنەوە، ئەگەرچی لە ناوەڕۆکدا دەقێکە تەجاوزی هەموو حەرامێکی ئایینی کردووە.

ئەگەر ڕۆژگارێ بزووتنەوەیەکی فێمینیستانە لە ناوچەی ئێمەدا لە پێناوی گێڕانەوەی بەها لەدەستچووەکانی وجوودی بایۆلۆجیی ئافرەتان، لە دەست

ترۆریزمی دینی و باوک سالارییەکەیدا سەرهەڵدات، گومانی تێدا نییە ئەم قەسیدەیەی نالی بە شێوەیەکی شێلگیرانە ئاوڕی لێدەدرێتەوە.

## دەقی قەسیدەی «مەستوورە»

### سەرەتا:
### (ریوایەت)

(١)

مەستوورە کە حەسناو و ئەدیبە بە حیسابێ
هاتە خەوم ئەمشەو بە چ نازێک و عیتابێ

### بەشی یەکەمی خەونەکە:

(٢)

هاتووم، وتی، عوقدەم هەیە، قەط مومکینە وابێ؟
هیی تۆم ئەگەرەم مەسئەلە حەل کەی بەجەوابێ؟

(٣)

هەر مەسئەلە بیکرێ کە بە تۆ شەرحی کرابێ
مومکین نییە کەس دەخلی بکا (چین و خەطا) بێ

(٤)

ئایینە بە مایینە دەبێ رەنگ نومابێ
(مەستوورە)بەم ئەستوورە دەبێ موهرە گوشابێ

(٥)

نوکتێکی ظەریفە بە نەصیبی ظورەفا بێ
تەعریفی دەکەم، بەڵکو لە بۆ دەرد شیفا بێ:

(٦)

ئەم سیڕڕە چییە میثلی سوها بێ، نەسوابێ؟
دورڕێ کە وەکو دورڕی سەما بێ، نە سمابێ؟

(٧)

دوککانی توحەف، کانی حەیا، کانیی بەقا بێ
قوببەی لەقیبابی نوقەبابێ، نە قوپا بێ

(٨)

وەک خەیمە بەپەردێکی دوو ئەستوونە بەپا بێ
سەرتیلەکی نەختێ بە نەزاکەت قڵەشابێ

(٩)

وەک هیممەتی صۆفی کە لە نێو خەڵوە خزابێ
مەستوور و عەزیزی شەرەف و ریفعەت و جا بێ

(١٠)

یاکۆمەڵە زیوی بوخەلا دور لەسەخابێ

مـوغلەق بە بەخـیلی، بە مـەثەل مـشـتـی مـەلا بێ

(١١)

کـــاســـێکی بلوورینی نـخـــوونـی لەســـەرابێ
نەخـتـێکی لەبەر مـەوجی لەطافـەت قـلـّەشابێ

(١٢)

یاخـــۆ پەڵە بەفـرێکی کـە ئەســلـّـەن نەشکا بێ
قـــەندیلی مـــونـیـــر و گـــوزەری ئاب و هەوا بێ

(١٣)

کـام ئاب و هەوا؟ مـوعـتـەدیلی نەشـئـو نومـا بێ
یەعنی لە وەسـەط کـانـیـیـە گـەرمـێکی تێ زابێ

(١٤)

لەو کــــانـیـــیـــــەدا چووزەرە ڕێـواسێ ڕووا بێ
بەو چووزەرە ڕێواســە کــەمــێکی قــلـّــەشـابێ

(١٥)

یا قـــەصــری مـــوعــەللا کـــە لە ئاوێنە کـــرابێ
یا غـــونچـــەیی نەشکوفـــتـــە کـــە ئاوی نەدرابێ

(١٦)

یا گـومـبـەدی نەزهەتگەهی نێـو باغـچـە سـەرابێ
ئەلوانی گـــوڵامـــێـــز و شـــەکـــەرێـــزی تیـــا بێ

(١٧)

یا قـورصی نمەک هەر وەکـو مـەڕمـەڕ بەضـیـا بێ
جـێی قـەطرەیە ئاوێکی لە نێـودا قـڵـەشـابێ

(١٨)

یا گـردەکی گـردێکی کـە شـیـرین هەڵێـدا بێ
گـــردی نمەکین، یەعنی گـیـــای لێ نەڕوا بێ

(١٩)

دامـێـنی بە ئەنواعی گـوڵ و مڵ خـەمـــڵابێ
گـەنجـێکی تێـدابێ کـە طیلەسـمی نەشکابێ

(٢٠)

حـوقـقـێکی زەڕی صـافی لەسـەر بانی نرابێ
نەختـێکی بە صـەد صـەنعـەتی (مـانی) قـڵـەشـابێ؟

(٢١)

یا رەئسی یەتیـمـێکی کـە بێ بەرگ و نەوا بێ
غـەڵطان و سـەراسـیـمـە: نە دایکێک و نە بابێ

(٢٢)

فـێسـێکی سـپی و توندی لە کـەللەی کـەلی نابێ
هێـشـتـاکـو لەحـەق جـێگەیی خـاصی نەدرابێ

(٢٣)

چەسـپـیـدە و وخـڕ هەروەکـو بەرقـاڵبی دابێ

نەختێکی لەبەر توندی و سفتی قلّەشابێ

(٢٤)

دورجێکی موجەوهەر کە هەموو حوسن و بەها بێ
دورڕێکی مونەووەر کە هەموو ئاوی صەفا بێ

(٢٥)

بەیضێکی شوتورمورغی کەوا تازە کرابێ
وەک بەیضەیی بەیضا بە ضیاوو بە سەنا بێ

(٢٦)

خرچێکی مودەووەر، بە عەسەل ئاوی درابێ
نەختێکی لەبەر حوسن و حەلاوەت قلّەشابێ؟

(٢٧)

یاخود وەکو خۆی شاهیدە، با وەصفی وەها بێ:
سیمین مەمکێکی هەکە تازە هەلّیدا بێ.

(٢٨)

یاتازە هەنارێکی کەناری گولّی مابێ
بێ درز و قلّیش میثلی شەمامێکی تەلا بێ

(٢٩)

بۆ تەجرەبە تا لەذذەتی شیرینی ئەدا بێ
نەختێکی وکو دیدەیی دەرزی قلّەشا بێ؟!

(٣٠)

یاخو، مەثەلا، میثلی نەوا بێت و نەوابێ
مەشهوور و خەفی هەر وەکو عەنقا و وەفابێ

(٣١)

صاحێب زەڕ و زیوێ کە فریبی عوقەلا بێ
ئیکسیری طەڵای ئەحمەری چەند قەطرە لەلابێ

(٣٢)

دەعوای ئومەرا چەندە لەسەر تەختی کرا بێ
چەند خوێن کە رژابێت و چ خوێنێ نەڕژابێ

(٣٣)

کێ بێ لە جیهاندا چ گەدا بێت و چ شابێ
تەرکێکی وەها ناسک و پڕ لەززەتی {گا بێ}؟!

**بەشی دووەمی خەونەکە:**

(٣٤)

دێوانە کە زانیی کە دەبێ عوقدە گوشا بێ
هەستاوو گوتی: ئەشکی ڕەوانم بە فیدا بێ!

(٣٥)

ئەم صاحیبی تەشریحە دەبێ هەیئەتی چا بێ

هەم شاریح و هەم جاریح و مووضیحە گوشا بێ

(٣٦)

بۆ توند و ڕەقی مەتنی مەتینی حوکەما بێ
تەدقیقی ئەمیش سیڕڕە دەبێ خوفیە ئەدا بێ

(٣٧)

نەرم و خۆش و مونتیج وەکو بەسطی ئودەبا بێ
طوولانی و بەرجەستە وەکو دەستی دوعا بێ

(٣٨)

شەو نائیم و قائیم، عەلەمی بابی ڕەزا بێ
بێ دیدە هەڵستێ، بە مەثەل عەینی عەصا بێ

(٣٩)

مەجذووبی طوروق، مورتەعیشی لەرزش و تا بێ
سالیک ڕەوشی مەسلەکی ڕێگەی صولەحا بێ

(٤٠)

فەرقێکی هەبێ: داخیلی میحرابی ڕەجا بێ
چاوێکی هەبێ: غەرقەیی فرمێسکی بوکا بێ

(٤١)

ڕێی حورمەت و بێ حورمەتیی هەرگیز نەکوتابێ
چەند ئاوی ڕژابێت و چ ئاوی نەڕژابێ

(٤٢)

لەم رێگە سەریشی کە بچێ، یەعنی کوژابێ
گەردن کەچی بەر پێتە قەدەم رەنجەکە، سا بێ

(٤٣)

تا گەرمەڕەوی رێگەیی ظولماتی بەقا بێ
(ماء الخضر)ت قەطرە لەسەر قەطرە فیدا بێ

(٤٤)

کێ بێ وەکو تۆ بەم شەوە رەحمی بە منا بێ!
مەجذووبە صیفەت، یەعنی صیلەی رەحمی تێدا بێ!

(٤٥)

هەم جاذیبە و قابیلەیی ئەخذ و عەطا بێ!
مەستوورەو و مەخفی، شەبەهی بادی صەبا بێ!

(٤٦)

مەستانە هەڵستێت و بە کوێریی روقەبا بێ
ئەم باب زەنە گەرم و تەڕی کا بە کەبابێ

**بێدار بوونەوە:**

(٤٧)

«نالی»! وەرە هەزلیکی کە عاری شوعەرا بێ
رووڕەش مەکە پێی صەفحەیی هەر لەوح و کیتابێ

(٤٨)

تەحریری خەیاڵ و خەو ئەگەر بێتە حیسابێ
دەروێش و گەدا شاه و، دەبێ شاه گەدا بێ

(٤٩)

وا چاکە خەیاڵ و خەوت ئەسراری هودا بێ
نەک بەحثی سرور و عەلەم و بادی هەوا بێ..

بەشی دووەم:

# ریـوایــەت

مەستوورە کە حەسناو ئەدیبە بە حیسابێ
هاتە خەوم ئەمشەو بە چ نازێک و عیتابێ!

ریوایەت و گێڕانەوەیەکی سادەی خەونێکە، کە تیایدا مەستوورە هاتۆتە پێش چاوی شاعیر(٨). سەرەتایەکە بەهۆیەوە مەستوورەمان پێ دەناسێنێ، مەستوورەی حەسناو ئەدیب کە بە ناز و رازی (عیتاب)ەوە خۆی پیشانی شاعیر داوە. ئا لێرەدا هەروەکو چۆن لە زمان شاعیرەکەمانەوە ئاشناییەکی کەم لەگەڵ مەستوورەدا دەبەستین، بەهەمان شێوەش پاشتر لە زمان مەستوورەوە (نالی)مان پێ ئاشنا دەبێ، بەم پێیە (شاعیر) بە نیسبەت مەستوورە و نالییەوە دەوری (راوی) دەبینێ و لە هەمان کاتیشدا نووسەری شیعرەکەیە.

هاتنی مەستوورە، رووداوێکە لە شیعرەکەدا کە دەبێتە هۆی ونبوونی شاعیر، یاخود ونبوونی راوی و بوونی بەکەسی یەکەمی گوێگر:
هی تۆم ئەگەرەم مەسئەلە حەل کەی بە جەوابێ

شاعیر خەونێکی دیتووە، پاشان قەسیدەیەکی نووسیوە، دێڕی یەکەمی قەسیدەکەی تەرخانکردووە بۆ گێڕانەوەی خەونەکە (واتە بۆ ریوایەتکردنی). لە دێڕی دووەمەوە ئیدی خەونەکە ریوایەت ناکرێ، بەڵکو خۆی خۆی ریوایەت دەکات. بە زمانێکی تر: بەهاتنی مەستوورە (شاعیری راوی ) ون دەبێت و «نالی» لە دایک دەبێت. نالیش ئەو کەسەیە کە مەستوورە عوقدەی خۆی هێناوەتە لا، کەواتە شاعیری قەسیدەکە خۆی دەکاتە قوربانیی بۆ ئەوەی

کەسایەتییەکانی نێو خەونەکەی خۆیان بێنە گۆ.

بەڵام ئەم نالییە کێیە لەلایەکەوە راوی نایەوێت بە زمان ئەوەوە بدوێ و لەلایەکی تریشەوە ئەگەر «عوقدە»ی مەستوورە حەل بکات، ئەوا مەستوورە دەبێتە هی ئەو؟

هاتووم، وتی عوقدەم هەیە، قەت مومکینە وابێ؟
هی تۆم ئەگەرەم مەسئەلە حەل کەی بە جەوابێ؟

بۆچی مەستوورە ئاوا دەستەمۆی بەردەمی نالییە، ئایا جەوهەری کەسێتیی نالی چ نهێنییەکی لە خۆیدا شاردۆتەوە؟

هەر مەسئەلە بیکرێ کە بە تۆ شەرحی کرابێ
مومکین نییە کەس دەخڵی بکا (چین) و (خەتا) بێ

مەسەلەی مەستوورە، «مەسئەلەی بیکرە»، (بابەتێکە کەس رێی بە لێک دانەوەی نەبردووە.) بەڵام یەکەمین مەسئەلە نییە، چونکە مەستوورە بە ئاشکرا هێما بۆ رابردووش دەکات: (بە تۆ شەرحی ***کرابێ***)، واتە لەمەوبەریش هەر شتێ نالی شەرحی کردبێ، مومکین نەبووە لە پاشانیشدا کەس دەخلی بکات و خۆی تێوە هەڵقورتێنێ تەنانەت ئەگەر (چین و خەتا)ش بێت.

لێرەدا ئێمە دەکەوینە ناکۆکییەکەوە لەگەڵ تەفسیر و لێکدانەوەی چەمکی «چین و خەتا»ی لاپەڕە (٦٠٦) دیوانی نالی، کە سیفەتی شەڕانگێزی بە چین و خەتا دراوە، بەبێ ئەوەی ئەم سیفەتدانە پاڵە لەگەڵ مەبەستی مەستوورەدا یەک بگرێتەوە کە پیاهەڵگوتنی نالییە. واتە من دەمەوێ بە هێنانەوەی بەڵگە لە خودی ئەو شیعرەدا ئەو قەناعەتە دروست بکەم کە چەمکی چین و خەتا هێندەی ئەوەی یادهێنەرەوەی «حیکمەت و زانایی» چین و خەتا و خوتەنە، ئەوەندە یادهێنەرەوەی «هەستان و هێرش هێنانی وڵاتی چین و خەتا و خوتەن» نییە وەک مامۆستایان لە لێکدانەوەی دیوانی نالیدا بۆی چوون.

جارێ بەر لەهەمووشتێک ئەگەر تەماشای یەکەم دێڕی قەسیدەکە بکەین

دەبینین شاعیر کەسێتیی مەستوورەمان زۆر بەڕێزەوە پێ دەناسێنێ و دەڵێت: مەستوورە کە بە ئافرەتێکی جوان و ئەدیبی دادەنێن ئەمشەو بەنازەوە (کە نازیش سیفەتێکی تری جوانیی ئافرەتە) هاتە خەوم. بەمجۆرە شاعیر هەر لەسەرەتاوە بە پاڵەوانی خەونەکەی خۆی هەڵدەڵێ. کاتێکیش مەستوورە دێتە گۆ، ئەویش دەستەواوی ئەو ڕێزگرتنەی نالی دەداتەوە و بە «شاریحی مەسئەلەی بیکر»ی ناو دەبات، واتە حەساسترین مەسەلە (وادیارە لە زەینی مەستوورە دا پێوانەی زانست و حیکمەت، زانست و حیکمەتی زانایانی چین و خەتاو خوتەن بووە و ئەمەش یەکێ لەئاستەکانی رۆشنبیریی مەستوورە دەردەخات). بەڵام هەر کەنالی هاتۆتە مەیدانی شەرحکردنی مەسئەلە بیکرەکانەوە، ئیدی ئیمکانی دەخلی حەکیم و زانایانی چین و خەتا گۆڕەپان چۆڵ دەکات. بەم پێیە لەلای مەستوورە حیکمەتی نالی پلەیەک بەرەو ژوورترە لە حیکمەتی چینییان، واتە مەستوورە گەرەکیەتی بڵێت: **من بۆیە پەنام بۆ تۆ -نالی- هێناوە و نەچوومەتە لای زانایانی چین و خەتاو خوتەن، چونکە دڵنیام هەر مەسئەلەیەکی وەکو ئەوەی من بیکر بێ و بە تۆ شەرحی کرابێ، ئیدی قسە بۆ زانایانی چین نەماوەتەوە. کەواتە عوقدەکەم حەل بکەو بیکە بە هی خۆت**(٩).

بەمجۆرە تەفسیر و لێکدانەوەی «چین و خەتا» وەک ئەوەی لە دیوانی نالی دا هاتووە لەگەڵ نییەتی مەستوورەدا ناگونجێ، ئەمە لەلایەک. لەلایەکی ترەوە، مەستوورە کە هاتۆتە خەونی نالی عوقدەیەکی هەیە و داوای «شەرح»ی عوقدەکەی لە نالی دەکات، شەرحی عوقدەش پەی بردنە بە نهێنی و نەزانراو ئەویش لە ڕێگەی بەکارهێنانی دیقەت و زانایییەوە، نەک لە ئەنجامی بەکارهێنانی زۆر و زەبروزەنگەوە.

ئێستا پێویستە لەبارەی وشەی «عیتابێ» وە کە لە کۆتایی بەیتی یەکەم دا هاتووە، قسان بکەین:

مەستوورە کە حەسناو ئەدیبە بە حیسابێ
هاتە خەوم ئەمشەو بەچ نازێک و عیتابێ

من بەردەوام ئەو پرسیارە لە خۆم دەکەم، ئایا لێکدانەوەی وشەی عیتابێ بە مانای «گلەیی و لۆمە کردنی نالی»، تا چ ئەندازەیەک راستەو ئەم لێکدانەوەیە لەگەڵ ئەو تاریفە جوانەی نالی بۆ مەستوورەی هەڵبژاردووە، تا چ ئاستێک گونجاوە؟ مەستوورەی حەسناو ئەدیب بۆچی لە نالی بە لۆمەو گازندەیە؟ ئایا ئەگەر مانای وشەکە لەگەڵ وشەکانی دوای خۆیدا لێک بدەینەوە، کار هەر بەو جۆرە دەبێت؟

ئەگەرچی پێویستە ئاگاداری ئەوە بین کە لێکدانەوەی پەیڤێک بە تەنیا لەگەڵ وشەکانی یەک لای خۆیدا، (پێشەوە یان دواوە) لەوانەیە ببێتە هۆی کوشتنی دینامییەتی ئەو پەیڤە و دواجار تێکدانی هارمۆنیای دەق بە شێوەیەکی گشتی(١٠). بەڵام بەبێ ئەوەی بمەوێ دینامییەتی ئەم دەقە هەڵبوەشێنمەوە، حەز دەکەم بە نیسبەت مانای وشەی (عیتابێ) وە سەرنجی خوێنەر بۆ چەند شتێک رابکێشم.

مەستوورە پەنای بۆ نالی بردووە و نالیش ئیعتراف بەمە دەکات:

مەستوورە دەڵێ: هاتووم،

نالی دەڵێ: گوتی: هاتووم.

بەڵام هاتنی مەستوورە هاتنێکی ئاسایی نییە، بەڵکو هاتنەکە لەبەر ئەوەیە کە مەستوورە (عوقدە)یەکی هەیە و عوقدەکەش «نهێنی»یەکی تیایە کە مەستوورە بۆ خۆی لە کردنەوەی دەستەوەستانە. حەلکردنی عوقدەکەیشی هێندە بەلاوە گرنگە، کە ئامادەیی تێدایە خۆی لە بەیعا دابنێ و ببێتە هی ئەو کەسەی بۆی لێکدەداتەوە!

شکستی مەستوورە لە بەرامبەر لێکدانەوەی عوقدەکەیدا، بێتوانایی ئەو پێشان نادات، بەڵکو نیشانەی بەرپرسیارکردنی نالییە لە ئاست هەڵهێنانی سرڕێکدا کە سیرڕی عوقدەکەیە. مەستوورە هاتووە بڵێت: من بۆیە هاتووم چونکە عوقدەم هەیە، تۆش خاوەنی حیکمەت و زانستی، حیکمەت و زانستێکیش ئەگەر عوقدەیەکی وەک ئەوی منی پێ نەکرێتەوە، ئەوا بۆ

نەمان باشە. ئیدی یەک ڕێگات لە بەردەمدایە: یان ئەوەتا ئینکاری زانایی خۆت بکە، یان ئەوەتا عوقدەکەم لێک بدەرەوە و لەو ڕێگەیەشەوە بمکەرە هی خۆت.

بەمجۆرە ئێمە دەکەوینە بەردەم چەمکی دەروونشیکاری - التحلیل النفسی-ی خودی نالی وەک کەسێک، بەڵام لێرەدا داوا لە خوێنەر دەکەم چاوەڕێی بەشی دووەمی لێکۆڵینەوەکە بێت و ئێستا دەگەڕێینەوە سەر ئەو مانایەی کە دەشێ وشەی «عیتابێ» لە خۆیدا شاردبێتییەوە.

هەر وەکو پێشتر گوتم: هاتنی مەستوورە، هاتنێکی ئاسایی نییە، چونکە عوقدەیەک لە ئارادایە کە خودی عوقدەکە حاڵەتی عیتابی بۆ مەستوورە وەپێش هێناوە. ئەو پەنای هێناوە بۆ نالی، هەر بۆیەشە لێرەدا جێگەی ئەوە نابێتەوە، عیتاب و گلەیی مەستوورە بەلای نالیدا بشکێنینەوە یان ساخی بکەینەوە، چونکە لە حاڵەتی پەنا بۆ بردندا هیچ بەڵگەیەک بە دەست پەناهێنەرەوە نییە بە لۆمەکردن و گازندەکردنی پەنا بۆ هێنراو دەست پێ بکات.

بەکورتییەکەی ئەگەر بمانەوێت مانای وشەی عیتابێ، تەنیا بە پەیوەندی لەگەڵ وشەکانی پێش خۆیدا: (حەسنا، ئەدیب، ناز) لێک بدەینەوە، ئەوا ئەو فەزایەی ئەو وشانە دروستیانکردووە دەسەڵات بەسەر وشەی «عیتابێ»شدا دەگرێ و ئەو دەمە لێکدانەوەی بەیتەکە بەو جۆرەی لێدێت کە لە دیوانی نالیدا لێکدراوەتەوە: «مەستوورە کە بە ئافرەتێکی جوان و ئەدیبی دائەنێن، ئەمشەو هاتە خەوم، بەڵام چۆن نازێکی بەسەردا ئەکردم و چۆن بە گلەیی و لۆمە بوو لێم؟»، کە ئەم مانا کردنەیش باری وشەی «ناز» بەسەر وشەی «عیتابێ»شدا فەرز دەکات و دەیخاتە ژێر کۆنترۆڵی خۆیەوە.

بەڵام ئەگەر بێت و مانای عیتابێ بە پەیوەندی لەگەڵ وشەکانی دوای خۆیدا لێک بدەینەوە (ئەوەی کە ئێمە پێشنیاری دەکەین)، ئەوا مانای وشەکە نابێتە گلەیی و لۆمە کردن لە شاعیر، چونکە مەستوورە کەسێکی پەنابەری عوقدەدارە و پرسیاری «قەت مومکینە وابێ»ی لەسەر زارە، ئەم

عوقدەیەش لە دەرەوەی مەستوورەدا نییە، بەڵکو لە مەستوورە خۆیدایە. بۆیە ڕێی تێدەچێت عیتابی مەستوورەش عیتاب بێت لە خۆی و لە عوقدەکەی، یان عیتاب و لۆمەکردنی خۆی لە ئاست دەستەوەستانی و بێچارەییدا لە بەردەم نەکرانەوەی عوقدەکەی بێت، بەتایبەتی کاتێک پرسیارەکەش جەخت لەسەر سەنگ و قورسایی عوقدەکە دەکاتەوە.

لێرەدا نابێت باز هەڵدەین بەسەر پیتی (و)ی نێوان «نازێک -و- عیتابێ» و ڕۆڵی ئەم واوە بە نیسبەت هەردوو وشەکانەوە لە یاد بکەین، چونکە ئەگەر دوای لێکۆڵینەوەیەکی پێویستی زانستییانە لە «و»ی نێوان هەردوو وشەکان بەو ئەنجامە نەگەین کە ڕێگەمان پێبدات شوێنی «و»ە کە بە نیشانەیەکی دی پڕ بکەینەوە، ئەمەش بەبێ ئەوەی کێشی بەیتەکە زیانی پێ بگات و ڕەچاوکردنی ماوەی زەمەنیی ئەو نیشانەیە لەگەڵ ئەو ماوە زەمەنییەی کە «و»ە کەی تێدا دەخوێندرێتەوە. بۆ نموونە بەمجۆرە:

مەستوورە کە حەسناو ئەدیبە بە حیسابێ

هاتە خەوم ئەمشەو بە چ نازێک «..» عیتابێ

دەڵێم ئەگەر دوای لێکۆڵینەوەیەکی ورد نەگەینە ئەنجامی دۆزینەوەی ئەلتەناتیڤێک بۆ شوێنی «واو»ە کە ئەوا پێویستە بڵێین: چ خوێندنەوەی بەیتەکەی نێو دیوانی نالی و چ ئەوەی ئێمە سەرنجمان بۆ ڕاکێشا، خوێندنەوەی پڕاو پڕ نین. لەبەر ئەوەی خوێندنەوەکەی مامۆستایان مانای وشەی عیتابێ تەنیا لەگەڵ وشەکانی پێش عیتابێ- دا لێک دەداتەوە کە بەڵگەیش بۆ ئەو پەیوەندییە «واو»ە کەیە و بەو جۆرەش عیتاب دەبێتە عیتاب لە شاعیر. لەکاتێکدا ئێمە دەمانەوێت مانای وشەکە بەهۆی ئەو پەیوەندییەوە لێک بدەینەوە کە لەگەڵ وشەکانی دوای خۆیدا هەیەتی و ئەو وشانەیش بریتین لە «عوقدە، مەسئەلەی بیکر» دیارە لێرەشدا ڕۆڵی واوی نێوان نازێک و عیتابێ ئەو گرنگییەی نامێنێت و دینامیەتی دەقەکەش ڕۆڵی لێ ناکرێت. ئەوەی لێرەدا بەلای منەوە گرنگە، وەستانێکە، ئێستێکی زەینییە لە کاتی خوێندنەوەی ئەو دوو بەیتەی یەکەمدا بەو

مەبەستەی مانایەکی دی لە فەزای وشەکانی دواترەوە بۆ وشەی عیتابێ بهێنینە دەست.

## مەسخبوون

ئێستا بۆ زیاتر ئاشنابوون و گفتوگۆکردنی پتر لەسەر مۆتیڤەکانی ئەم قەسیدەیە، سەرنج بۆ هەندێ مەسەلەی دی رادەکێشم:

پاش ئەوەی شاعیر لە دێڕی یەکەمدا کلیلی قەسیدەکەمان دەداتێ و مەستوورەمان پێ دەناسێنێ، ئیدی رەوتی قەسیدەکە بەرەو ناوەوەی خەونەکە ئاراستە دەبێت و رۆڵی راویی شاعیر نامێنێت.. واتە نالی و مەستوورە هەردووکیان بەرەو زەمەنی (خەون)ەکە شۆڕ دەبنەوە (لە پاشاندا دێمەوە سەر باسکردنی سروشتی ئەم خەونە)ە بۆیە کاتێک شاعیرەکەمان وشەی خەون بەکار دەهێنێت لە راستیدا رەوا بوونێک دەداتە قسەکانی و خۆی لەو تابۆ و قەدەغە کراوانە (ممنوعیات) دەپارێزێ کە لەجیهانی ئاگادا هەن و ناکرێ لە کاتی ئاسایی و بێداریدا بە شێوەیەکی سروشتی و ئاسایی قسانیان لەبارەوە بکەین (١١). لێرەدا خەون ئازادییەک بۆ دوان و قسەکردن لەسەر تابۆکان دەهێنێتە ئاراوە و چەکێکە بە دەستی قسەکەرەوە تا بەبێ شەرم و حسێب بۆ کردنی مەسەلە ئەخلاقییەکانی کۆمەڵگا، بەیانی حاڵی خۆی بکات. چونکە لە زەینی کۆمەڵدا خەون بینین لە ئیرادەی فەردیی مرۆڤ بەدەرە، هەر بۆیەشە فەرد لەسەر نێوەرۆکی خەونەکانی دووچاری ئەشکەنجە نابێت.

نالیش، ئەو ئازادییە دەخاتە ئیختیاری مەستوورەوە تا سەربەستانە باسی عەورەتی خۆی بکات و وەکو ئافرەتێک سەرنج بۆ هەندێ لایەنی ئیرۆتیکی ئەندامی لەشی خۆی رابکێشێت. هەڵبەتە ئەمەیش لە نالی-ی یاخی چاوەڕوانکراوە و «نیشانەی چاو نەترسان و بزێوی و جەسارەتێکی بێ سنوورە لە نالییەوە و بەڵگەی ئەو ئاگری یاخی گەرییەیە لە سینەیدا کڵپەی سەندبوو» (١٢).

بە درێژایی بەشی یەکەمی ئەم خەونە کە مەستوورە تیایدا تاقە سوارەو

سەربەستانە عەورەتی خۆی بە هەموو دیمەنێکی جوان و ناسک دەچوێنێ، بەڵگەی ئەو یاخیبوونە پتەوتر دەبێت کە رووبەرووی هەموو ترادسیۆن و ئایینێک دەوەستێتەوە، کە ئافرەت لە ژێر سایەیاندا کائینێکی بێ ناسنامەی بێ نرخکراوە. نالی بەهۆی شۆڕکردنەوەی رووداوی قەسیدەکەیەوە بۆ جیهانی خەون، ئیحتیمالی هەر دیدارێکی هێناوەتە ئاراوە، جا ئەو دیدارە دیدار و (روئیەت)ی پیر بێت، یاخود عەورەتی مەستوورە. ئایا ئەگەر شاعیر ئەم تەکنیکەی بەکار نەهێنابا، دەیتوانی دەقێکی شیعریی هێندە بەزر بخوڵقێنێ کە یاخیبوون تێیدا مەزنترین رووداوی شیعرییە؟

تائێرە باس هەرباسی بەشی یەکەمی خەونەکە بوو، بەڵام ئەی لەبەشی دووەمدا چی روودەدات کە نالی بەهەمان شێوەی مەستوورە دەکەوێتە وەسفکردنی زەکەری خۆی؟ (دواتر بە دوورودرێژی باسی ئەوە دەکەم کە بۆچی نالی و مەستوورە تەنیا باسی ئەندامی جنسی خۆیان دەکەن، نەک سەرجەمی لەشی خۆیان؟)

ئامانجی مەستوورە و نالی لەوەدا کە، سەرنج بۆ ئەندامی جنسیی خۆیان رادەکێشن و دیمەنی ئیرۆتێکی زەق دەکەنەوە، هەر یەک ئامانجە، بەڵام وەسفی مەستوورە بۆ عەورەتی خۆی لە ئاست وەسفی نالیدا بۆ زەکەری خۆی، زەوی و ئاسمانیان لە نێواندایە.

ئێمە دەزانین کە مەستوورە عەورەتی خۆی بەو دیمەن و شتانە دەچوێنێ کەلە دەرەوەی خۆینی:

ئەم سیڕڕە چییە میثلی (سوها)بێ، نەسوابێ؟!
دوڕڕێ کە وەکو (دوڕڕی سەما) بێ، نە سمابێ؟!

یان:

وەک (خەیمە) بە پەردێکی ...
وەک (هیممەتی صۆفی) کە لە نێو..
یا قورصی (نمەک) هەر وەکو (مەڕمەڕ) بە ضیابێ
(خرچێکی مودەووەر) بە (عەسەل) ئاوی درابێ..

واته له وهسفهکانی مهستوورهدا دهلالهت بهرهو سهرچاوهیهکی مهدلوولی دوورترمان دهبات وهک له عهورهتی خۆی، که ئهمهیش بهڵگهیهکه دهیسهلمێنێ مهستووره عهورهتی خۆی وهکو دیمهنێک له دهرهوهی خۆی دهبینێ و مامهڵهی لهگهڵ دهکات، نهک وهکو بهشێکی جودا نهکراوه له سهرجهمی بهدهنی خۆی. به زمانێکی دی، له وهسفهکانی مهستوورهدا ئهندامی جنسی لهو دیاردهو دیمهنانه دهچێت که له دهرهوهی رووبهری جهستهی مرۆڤدان، کهچی لهلای نالی وهسفی زهکهر، وهسفکردنێتی به سیفاتی مرۆڤ. زهکهر «دێوانه»یهکی پێزانی قسهکهره! نالی لێرهدا به نێوی خۆیهوه نائاخڤێ، بهڵکو هێما بۆ زهکهری خۆی دهکات و دهڵێت:

«دێوانه» که زانی که دهبێ عوقده گوشا بێ
ههستا و (گوتی): ئهشکی رهوانم به فیدا بێ..

بهم پێیه ئاشکرایه وهسفهکانی نالی مهسخ بوونێک پێشان دهدهن که تیایدا مامهڵهکردن لهگهڵ «زهکهر» وهکو مامهڵهکردنی لێدێت لهگهڵ «ئهویتر»دا. واته زهکهر سهربهخۆییهکی ههیه و له ژێر کۆنترۆڵی نالیدا نهماوه، ههر بۆیهشه شاعیر به «دێوانه» ناوی دهبات. بۆ زیاتر تێگهیشتن لهم پهیوهندییه پهنا دهبهین بۆ ئهم هیلکارییهی خوارێ:

## (هێڵکاری یەکەم):

جیاوازییەکی دی لە نێوان وەسفی مەستوورە بۆ عەورەتی خۆی و وەسفی نالی بۆ زەکەری خۆی، بریتییە لە سروشت نەرمی و بوونی کەشێکی مامناوەندی لەلای مەستوورە و سروشتێکی شەڕانگێز و تووڕە لەلای نالی.

مەستوورە، عەورەتی خۆی بەو دیمەن و شتانە دەچوێنێ کە جۆرێک هاوسەنگی لە سروشتیاندا هەیە، واتە چیڕ و رقاوی نین و بەناوهێنان و بەکارهێنانیان ئاساییش و خۆشی و لەززەت دێتە دەست. لەکاتێکدا ئەو دیمەن و شتانەی نالی زەکەری خۆی پێیان دەچوێنێ، سروشتێکی ڕمووزن، تووڕە و دیسپلینکراویان هەیە. لەم دوو نەخشەیەدا هەندێ نموونە بۆ مەبەستەکەمان پێشان دراون:

| خانەی نالی | تەشبیهپێکراو | سیفەتی دیاری تەشبیهپێکراو |
|---|---|---|
| زەکەری نالی | دێوانە: | حاڵ لێهاتوو، جەزبە و هەیت و هاوار. |
| | جاریح: | بریندارکەر، زام و دەستوەشاندن. |
| | مەتنی مەتینی حوکەما: | پتەوی و قورسی، گرانی و نامەفهووم. |
| | عەصا: | لێدان و دەستنەپاراستن، کوێری و تاریکبین (عەسای کوێران، دیوانی نالی: ل: ٦٢٤ |
| | مورتەعیش: | موچڕکە پیاهاتوو ئەویش لە ئەنجامی ترس، یان حاڵەتێکی نائاسایی، بۆ نمونە: گۆڕانی هەوا لە گەرمەوە بۆ سارد. |

| خانەی مەستوورە | تەشبیهپێکراو | سیفەتی دیاری تەشبیهپێکراو |
|---|---|---|
| عەورەتی مەستوورە | ئاوێنە: | یادهێنەرەوەی ئاوی سازگار و زوڵاڵ، رووناکیبەخش، و هێما بۆ کراوەیی و سەفا و خۆدیتن. |
| | نوکتە: | قسە و باسی خۆش و پێکەنیناوی |
| | دوڕڕ: | پرشنگ و بریسکەدانەوە. |
| | کانی: | سازگاری، شیرینی، حەسانەوە و پشوو. |
| | خەیمە: | شوێنی ئاساییش، پشوودان و خۆپاراستن و مەنزڵگرتن. |
| | مەڕمەڕ: | بە نرخی، جوانی و تیشک و سافییەتی. |
| | نەمەکین: | خۆش و بەتام و خوێ. |
| | دورج: | (قوتوویەکە ژنان زێڕ و خشڵ و شتی گرانبەهای خۆیانی تیا هەڵدەگرن)، جێگەی پارێزگاریکردن و ئاساییش. |
| | خرچ (کاڵەک، گندۆرە): | شیرینی، هەڵگری تۆو، کە نیشانەی بەردەوام بەرهەمهاتنەوەیەتی. |

دوای چاوگێڕان بە دوو نەخشەکەی پێشوودا، بە ئاشکرا دیارە سیفەتە بەرجەستەکانی تەشبیهپێکراو لە خانەی مەستوورەدا، سەرجەم رووناکن و رەنگی رۆشن بەسەریاندا زاڵە، ئەمە لە کاتێکدا سێ بەشی تەشبیهپێکراوەکانی خانەی نالی، واتە (وشەی: دێوانە، مەتنی مەتینی حوکەما و عەصا) لەرووناکی بێ بەرین.

ئەگەر بێت و لە هەمان نەخشەدا، یاخود بە گەڕانەوەمان بۆ خودی دەقەکە، دەلالەتی «دەنگ»یش وەربگرین، ئەوا بە هەمان شێوەی دەلالەتی «رەنگ» و سیفەتە بەرجەستەکانی هەردوو گرووپی تەشبیهپێکراو جیاوازی دەردەکەوێ. بۆ نموونە لەکاتی خوێندنەوەی ئەو بەشەدا کە مەستوورە لە بارەی عەورەتی خۆیەوە دەدوێ، هیچ بەڵگەیەکمان بە دەستەوە نییە «دەنگ» بەرز بکەینەوە:

ئەم سیرڕە چییە میثلی سوهابێ، نەسوابێ؟!

دوڕڕێ کە وەکو دوڕڕی سەمابێ، نەسمابێ؟!

یان:

وەک هیممەتی صۆفی کە لە نێو خەڵوە خزابێ

مەستوور و عەزیزی شەرەف و ریفعەت و جابێ

یاخود:

یاخۆ، مەثەلا، میثلی نەوابێت و نە وابێ

مەشهوور وخەفی هەروەکو عەنقاو وەفا بێ

واتە موناسەبە نییە لە کاتی خوێندنەوەدا دەنگی پیتەکانی وەک (س، ص و هتد) بشێوێنین و بەدەنگی بەرز بڵێین: ئەم سیرڕە.. وەک هیممەتی صۆفی و هتد... بەڵام بۆ خوێندنەوەی ئەو بەشەی نالی تیایدا وەسفی زەکەری خۆی دەکات، بە ناچاری دەبێت تۆنێکی بەرزتر بدرێتە دەنگ. بۆ نموونە، بۆ خاتری ئەوەی مانای نیوەی دووەمی بەیتی یەکەم، کە کردار (فعل)ی «هەستان»ی تێدایە، بگەیەنرێ، پێویستە لە نیوەی یەکەمی هەمان بەیتەوە زەمینەسازیمان ئامادە بێت، واتە دەنگمان هەڵبڕی بێ. یاخود کاتێ نالی دەڵێت:

مەجذووبی طوروق..
مورتەعیشی..
لەرزش وتابێ ..
ئەوا وشەکانی وەک (مەجذووب، مورتەعیش و لەرزش) خۆیان دەلالەتی جموجوولّیان تێدایە و نائاسایین، بۆیە ئەگەر بە دەنگێکی ئاسایی و تۆنی لاواز بخوێندرێنەوە، ئەوە وێنە و سروشتی وشەکانی وەک مەجذووبی و مورتەعیشی و لەرزشی حالّەتە شیعرییەکە ون دەبێت.
لە ئەنجامی ئەم بەراوردە کورتەوە دەگەینە چەند ئاکامێک. بێسوود نابێ گەر کەمێ زیاتر لەبارەیانەوە بئاخڤین.
هەروەکو لە سەرەتاوە گوتم، نالی-ی شاعیر دەروازەی قەسیدەیەکمان بەهۆی گێڕانەوەی خەونێکەوە بۆ دەخاتە سەر پشت و رشتەی قسانیش دەداتە دەست مەستوورە. بەم پێیە نالی لەدێڕی یەکەمدا «راوی»یە و کەسایەتیی نالی هەمان کەسایەتیی شاعیرە کە شیعرەکەی نووسیوە. بەلّام لە بەیتی دووەمەوە، ئیدی شاعیری راوی ون دەبێت و پرۆسەکەیش لەوەدوا «نووسین»ی شیعر نییە، بەلّکو دەبێتە پرۆسەی «رووداو»ی نێو قەسیدەکە.
بە زمانێکی دی: ئیدی نالی-ی شاعیر و راوی نییە کە بە زمان مەستوورەوە دەدوێ و شیعر بەرهەم دەهێنێ، بەلّکو مەستوورە و نالی دوو کەسایەتین بە کردەوە (فعل) لەحالّەتی رووداودان. بۆیە ئەرکی ئێمە لەوەدوا (دوای بەیتی یەکەم) «خوێندنەوە» نییە، بەلّکو «بینین»ە. بینینی ئەو رووداوانەی لە دوای وشەکانەوە روو دەدەن. چونکە چ مەستوورە و چ نالی زیاتر لەوەی بئاخڤن، سەرگەرمی نواندن و پیشاندانن، نەک گێڕانەوە و ریوایەتکردن. لەبەر ئەم هۆیەشە پێویستە خوێنەر خەیالّ و روئیای بخاتە کار بۆ بینینی دیمەن و رووداوەکان نەک لێکدانەوەی ئەقلّی بۆ گەیشتن بە مانای وشە و رستەکان.
ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە لەم قەسیدەیەدا (لەززەتی بینین و تەماشاکردن) زالّە بەسەر چێژوەرگرتنی لۆژیکی لە رەهەندی زمان و مانای

زمانەوانیی وشەکان(١٤). بەڵام سەیر لەوەدایە، کامێرای هەڵگرەوەی فیلمی ڕووداوەکان، یاخود دیمەنە شیعرییەکان لە هەر دوو حاڵەتەکەیا (چ ئەو کاتەی لە دیدی مەستوورەوە دەبینێ و چ ئەو دەمەش لە هی نالییەوە) تەنیا بەشێکی بچووک دەبینێ کە ئەویش «ئەندامی جنسی»ی مەستوورە و نالییە. نەک سەرجەمی لەشی مەستوورە، یاخود ئەندامە ئارەزوو بەخشەکانی دیکەی؛ یاخود سەرجەمی جەستەی نالی. با وای دابنێین مەستوورە خۆی ڕووت کردۆتەوە، بەڵام ئایا ئێمە سنگ و مەمکی وی بە دی دەکەین؟ یان داخۆ دەتوانین وردەکاریی لەشی نالی بهێنینە پێش چاوی خۆمان: ئایا تووکن بووە یان کۆسە؟ لەڕ بووە یان گۆشتن..؟ یاخود باواز لە جەستەی کەسایەتییەکان بهێنین و پرسیار ئاراستەی «دەرەوەی نزیکی» نالی و مەستوورە بکەین: ئایا ئەو شوێنەی مەستوورە هاتۆتە خەونی نالی کوێیە؟ ئایا ژوورەکەی نالی خۆیەتی یان شوێنێکی تر؟ دیمەنی ئەو شوێنە چۆنە؟ هەوا ساردە یان گەرم؟ و دەیان پرسیاری دی. ئەمانە هیچیان لە بونیادی قەسیدەکەدا ڕەنگیان نەداوەتەوە. چونکە هەر وەکو پێشتر گوتم: کامێرای هەڵگرەوەی ڕووداوکان بەسەر یەک ڕووبەڕەوە نیشتۆتەوە کە ڕووبەری ئەندامی جنسیی نێر و مێیە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەر خوێنەرێک بۆی هەیە بە پێی سەلیقە و خستنەکاری خەیاڵی خۆی وەڵام بۆ ئەم پرسیارانە بدۆزێتەوە. ئەگەرچی ئەوە کارێکی هونەرمەندانە نییە، چونکە خەیاڵ لە دەقەکەدا، تەنیا خەیاڵکردنەوەیە لە دوو ئەندامی جنسی. جا ئەگەر بێت و خوێنەر خەیاڵی خۆی لە دەرەوەی ئەو دوو ئەندامە بخاتە کار، لە خەیاڵ لێکردنەوەی دیمەنە سەرەکییەکە دەپچڕێ و ئەو چێژەی نایەتە دەست کە دەشێت لەم دەقە وەربگیرێ. هەروەکو لە بەشی دوایيدا دێمەوە سەری. لە کاتی پڕۆسەی جووتبووندا، بیرکردنەوە (خەیاڵکردنەوە) لە هەر دیمەنێک خاڵی بێ لە ئیحای جنسی، ئەوە دەبێتە هۆی خاوبوونەوەی پڕۆسەی جووتبوونەکەو مرۆڤ لە جیهانی خەون و خەیاڵ و خۆشی و ڕوئیاوە دێتەوە حاڵەتی بێداری و ژێر ستەمی ئاگایی. یان لە «حاڵ و جەزبە و فەنای

شەهوانییەوە» دەگەڕێتەوە بۆ ملکەچی و فەرمانبەرداریی بونیادی واقع. لە گفتوگۆی شکاندنی تابۆکانەوە دێتەوە سەر ئاستی بێدەنگی لەبەرامبەر تابۆکاندا.

ئەوەتا نالیش لە بەشی سێهەمی قەسیدەکەیدا لە دیمەنی حاڵەتە ئیرۆتیکییەکان دەپچڕێ و دەبێتەوە «شاعیری راوی». جیهانی خەون دائەخات و مەستوورەش مەحو دەبێتەوە. لەم بەشەدا نالی دەبێتەوە هەمان کەسێتیی بەیتی یەکەم و «داوا لە خۆی ئەکا واز لەم جۆرە قسە بێ جێیانە بێنێ و، بەخۆی ئەڵێ بنیادەم بە خەو و خەیاڵ نابێ بەهیچ و، چاتریش ئەوەیە لە جیاتی قسەی هیچ و پووچ شتێ بڵێی و بنووسی کە بۆ دوارۆژی پاش مردنی چاک بێ» (١٥). لەمەیش زیاتر دەڕوات و دەڵێت: وا چاکە رازی پەی بردن بە راستی و رێگە دۆزینەوە بۆ لای خودا بگرێ نەک بەحسی سروور و ئالآی شەکانەوە بە بای «ئارەزوو» بازی.

* * * *

ئابەم جۆرە نالی جارێکی دی هەمان پێشنیازی کۆتایی قەسیدەی «قوربانی تۆزی رێگەتم ئەی بادی خۆش مروور» دووبارە دەکاتەوە. مرۆڤ دەبێتەوە ئەو کائینە گوناهکارەی بەردەمی دەروازەی بەزەیی و شکۆی یەزدان، لێرەدا بە گەڕانەوەمان بۆ سێهەمین هێڵکاری لە بەشی پێشووی ئەم کتێبەدا و بە بەراوردکردنی لەگەڵ ئەنجامی قەسیدەی مەستوورە چەند ئاکامێ گرنگمان دەستگیر دەبێت. دیارە بەر لە هەر شتێ ئەو ئاکامانە دەلالەت لە یەک سەرچاوەی دەروونی و فیکریی هاوبەش دەکەن بە نیسبەت بونیادی هەردوو قەسیدەکەوە.

نالی نەک هەر لە پرۆسەی تەماهیکردن لەگەڵ نیشتمان وخولقکردنەوەی رۆژگار و شوێنی پیرۆزدا بە شکست دەگات، بەڵکو لە تەماهیکردن و دۆزینەوەی (ئەویتر)یشدا تێک دەشکێ و دوا جاریش یەک رێگای لەبەردەمدا دەمێنێ: رێگای گەڕانەوە بۆ لای خوا، یان ملکەچکردن بۆ

رووبەرێکی یەزدانی و میتافیزیکی، کە قورئان مژدەی هاتنی بە ئوممەتی ئیسلام راگەیاندووە. بۆ گەیشتنمان بەو رۆژە «وا چاکە خەیاڵ و خەو»مان بەلاوە نابێت و کەوتبینە بیرکردنەوە لە ئەسراری هودایا. بەلای منەوە ئەم شکستە، شکستی فەرد نییە لەبەردەم ئایین- دا، بەڵکو تێکشکانی بونیادی ژیانە لە ئاست بونیادی مەرگ-دا. تێکشکانی ئێستای واقعییە لە بەردەم ئایندەی وەهمی-دا. شکستی شارستانییەتە لەبەردەم بەهەشتی ئاسمانیدا. شکستی مێژووی خوێناویی میللەتێکە لەبەردەم یوتۆپیادا. شکستی چارەنووسە لەبەردەم بوونی بێچارەنووسماندا. ئێمەش لە نالییەوە، لە ساتەوەختی تێکشکانی نالییەکانەوە، تێکشکانەکان دووبارە دەکەینەوە، دەیانڵێینەوە، بە حەماسەوە یادیان دەکەینەوە، شانازییان پێوە دەکەین و شکۆی رەنج و خوێنی رژاومانی تێدا بەدی دەکەین. بەڵام بەداخەوە نایانخوێنینەوە، دەترسین نەبا لە شکۆمان بێتە خوارەوە و ئەو پەیکەرانەی خۆمان لە وجوودی خۆمان دامان تاشیون رووبەڕووی شکاندن ببنەوە.

## هێڵکاریی دووەم:

**تێبینی:**

لەم هێڵکارییەدا بازنەی - جیهانی واقیع- بریتییە لە «خود ئاگا»ی شاعیر و بازنەی - جیهانی شیعری- بریتییە لە «ناخود ئاگا»ی شاعیر. دیارە دەکرێ سێ گۆشەی «یۆتۆپیا»ش بە «سوپەرئاگا»ی نالی لێک بدرێتەوە.

## بەشی سێیەم:

# وەهمی مەستوورە/ مەستوورەی وەهم

### کورتەیەک لە بەشی پێشووەوە:

لە بەشی پێشووی ئەم باسەدا کۆششی من بۆ ئەوە بوو کەسایەتی و سیفەتی کەسایەتییەکان و چوارچێوەی گشتی قەسیدەکەی نالی دەستنیشان بکەم. ئەوە بوو لە سێ بەشی قەسیدەکە دووام کە ئەو سێ بەشەش بریتیبوون لەمانەی خوارەوە:

یەکەم: سەرەتا: کە تیایدا (شاعیر- نووسەر- راوی) مەستوورەمان پێدەناسێنێ و کلیلی دەرگای خەونەکەیمان دەداتە دەست.

دووەم: ئەلف: بەشی یەکەمی خەونەکە: ئەمەیش بریتییە لە نەمانی دەوری «راوی» و پەیدابوونی مەستوورە وەک تاقە بێژەر و تاریفکەری عەورەتی خۆی.

بێ: بەشی دووەمی خەونەکە: هاتنە گۆی نالی و تاریفکردنی زەکەری خۆی.

سێیەم: بێداری و گەڕانەوەی «راوی»: مەحووبوونەوەی کەسانی نێو فەزای خەونەکە و قڵپ بوونەوەی بونیادەکانی بەشی یەکەم و دووەمی قەسیدەکە لەوانەیش «زاڵبوونی لەززەتی بینین و تەماشا، بەسەر چێژی خوێندنەوەدا، کۆتاییهاتنی دیمەنی وەهمی حاڵەتێکی ئیرۆتیکی.. دواجار زاڵبوونەوەی مانای ئەقڵیی وشەکان و کۆتاییهاتنی «گێڕانەوەی رووداو»ەکە بەهۆی وێنە شیعرییەکانەوە».

گرنگترین تایبەتمەندییەکانی ئەم بەشی سێهەمە، بریتییە لە رەخنەگرتن و

خوێندنەوەی سەرجەمی خەونەکە لەبەر بونیادی خەونێکی تردا (واتە خۆدانە دەست ئەسراری هودا و رازی پەی بردن بە راستی و رێگە دۆزینەوە بۆ لای خودا).

* * *

لەم بەشەدا دابەشکردنی قەسیدەکە وەکو خۆی دەهێڵمەوە، هەوڵیش دەدەم هەندێ نیوە ناچڵیی بەشی پێشوو زیاتر دەوڵەمەند و پڕ بکەمەوە. ئەم دێڕانە هەوڵدانێکن بۆ چڕکردنەوەی مەبەستمان لەسەر زەینی شاعیر، واتە مەلا خدری نالی و روانگەیەکە بۆ دۆزینەوەی لێکچوونەکانی «بونیادی دەروون» و «بونیادی زمان» کە پێشتر پەیمانم بەخوێنەر دابوو بگەڕێمەوە سەر ئەم باسە. هەروەها دەمەوێ هەندێ پرسیار سەبارەت بە ژیانی سێکسیی مەلا خدر بهەژێنم، لەوانەیش: ئایا نالی هەرگیز ژیانی سێکسیی هەبووە؟ یان بە کوردییەکەی: هەرگیز لەگەڵ ئافرەتدا جووت بووە؟ دیارە تەنیا لەو رووەوە پرسیارەکان دەکرێن چونکە ماقوڵییەتیان تیا بەدی دەکرێ و دەشبێ ئەم پرسیارانە سەبارەت بە ژیانی هەر کەسێکی تریش بێنە ئاراوە. بەڵام سەبارەت بە نالی لەبەر ئەوە نرخی ئەم پرسیارانە گرنگن، چونکە تا ئێستا لێکۆڵینەوەیەکی تایبەت سەبارەت بە ژیانی خێزانیی شاعیرەکەمان بەرهەم نەهاتووە و بۆچوونی جیاواز لەو بارەیەوە هەیە.. هەندێک بە دوودڵییەوە باسی ئەوە دەکەن نالی هاوسەرێکی هەبووبێ و هەندێکی دی بە دڵنیاییەوە باسی ژن نەهێنانی نالی- یان کردووە(١).

با لەو خاڵەوە دەستپێبکەم، کە نالی لە حاڵەتێکدایە تێیدا ملکەچی ئارەزوویەکی سێکسی بووە و بۆ ئەمەش دەکەوێتە نێو تەلیسمی «دیمەنێکی وەهمییەوە». لێرەوە «مەستوورە» دێتە وەهمی نالییەوە و ئەمیش بە خەیاڵکردنەوە لە عەورەتی ئەو و وێناندنی لە فەنتازیای خۆیدا، گەرەکیەتی پێمان بڵێ و بڕوای ئەوەمان لە لا دروست بکات کە ئەوەی روویداوە، لە «خەون»ی نالیدا روویداوە. بەمجۆرە، پرۆسەی خەون دەکاتە پەردەیەک تا

لەو دیوەیەوە چەند شتێکمان لێ بشارێتەوە.

یەکەم: ئەو حاڵەتە ئارەزوومەندییەی شاعیری تێدا بووە، واتە ئارەزووی بۆ ئافرەت (مەستوورە).

دووەم: دروستکردنی دیمەنێکی وەهمی لە عەورەتی مەستوورە.

سێهەم: لە قەڵەمدانی هەموو ئەو پرۆسەیە، کە پێویستی سێکسیی شاعیرە بە «هەزل و رووڕەشکەری سەفحەی لەوح و کیتاب»

ئێستا ئەگەر توانای ئەوەمان هەبایە گەڕانەوەیەک بۆ سەرجەمی ژیانی سێکسیی پیاو ئەنجام بدەین، بەبێ هەڵسلەمینەوە دەکرا بڵێین: ئەم شیعرە زادەی ئەو ساتەوەختە ئارەزوومەندییەیە کە نالی تیایدا بە پەنابردن بۆ دیمەنی وەهمی، ئارەزووی خۆی لە پرۆسەیەکی تەحریفی وەک ئیستیمنا: (دەسپەڕ)دا بەکام گەیاندووە. بەڵام ئێمە بۆ چەسپاندنی ئەم تێزە رێگایەکی دوور و درێژمان دێتە بەر و ئەویش لە وزەی ئێمە بەدەرەو پێویستی بە زەخیرەیەکی رۆشنبیریی فراوان هەیە.. هێندە هەیە، بەلای منەوە «خەون و مەستوورە هاتنە خەون» تەنیا لەو نومایشە خەیاڵییەدا حەقیقەتیان هەیە کە نالی، یان هەر کەسێکی دی لە کاتی دامرکاندنەوەی هێزە جنسییەکاندا پەنای بۆ دەبات. ئەمەش ئەو خاڵەیە گەرەکمە لەمەودوا لێی بدوێم.

بە کورتییەکەی ئایا دەکرێ شاکارێکی ئاوا لە دایک ببێت بەبێ ئەوەی هێزێکی لێبیدۆیی لە پشت خۆیەوە حەشار نەدابێت؟ ئایا دەکرا نالی بۆ دامرکاندنەوەی ئارەزوومەندی خۆی بەهۆی دیمەنی وەهمییەوە، عەورەتی ئافرەتێکی لە زەینی خۆیدا بەرجەستە نەکردبا و لەجیاتی ئەو بیری لە قیامەت و عەزابی دۆزەخ کردباوە؟ یاخود دەبوو قیامەتی لە حاڵێکی وادا فەرامۆش کردایە، هەروەکو چۆن لە دوایشدا ئەو حاڵەتە بۆ قیامەت وەلا دەخات و بگرە سەرزەنشتیشی دەکات و بە «هەزلی شوعەراو بادی هەوا»ی ناو دەبات.

قبووڵ نەکردنی ئەوەی لە ژیانی نالیدا ئارەزوو دامرکاندنەوەی جنسی بە پرۆسەی دیمەنی وەهمی و ئیستیمنادا رەت نەبووە، ئەمەش لە شیعری نالیدا

رەنگی نەداوەتەوە (کە مەستوورەکەی بێ)، وەکو ئەوە وایە بگوترێ: قەسیدەی «قوربانی تۆزی ڕێگەتم» بەیانی هەستی غەریبایەتیی نالی ناکات و شیعری «ئەم تاقمە مومتازە» بۆ «خوڵامە تایبەتییەکانی دەرباری بابان» نەگوتراوە و قەسیدەی «وەک قەفەس ئەم حوجرە کۆن تێیە» لە ئەنجامی کێشەی شاعیر بەدەست حوجرە کۆنەکەیەوە لە دایک نەبووە.

واتە قایل نەبوون بەوەی هەستی ئارەزوومەندی لە شیعری نالیدا نییە و ئەم ئارەزوومەندییەش نالی-ی ناچار نەکردووە بیر لە عەورەتی مەستوورە بکاتەوە، قایل نەبوونە بە هەموو ئەو بەڵگانەی کە ئێمەی کورد تا ئەم کاتە بە هۆیانەوە نالی وەکو شاعیرێکی مێژوویی مەزنی گەلەکەمان پێناسە دەکەین.

بە هەرحاڵ، ئەگەر هیچ نەبێت نالی هەروا لە چوارچێوەی مرۆڤێکدا تەماشا بکەین و ڕووبەری جنسانیش بە لایەنێکی گرنگی چالاکییەکانی ژیانی مرۆڤ قبووڵ بکەین، ئەوە بە ئاسانیش لەوە تێدەگەین کە چۆن شاعیرەکەمان لە ریزی ئەزموونەکانی تری ژیانی رۆحی و مەعنەوی و سەرجەم ئیسنانیی خۆی ئەزموونی سێکسیشی لە شیعردا رەنگ پێداوەتەوە. بە پێی تێگەیشتنە (لاکان)ییەکەش، بۆ ناسینەوەی مرۆڤ، پێویستە لە زمانی و لەو وشە و دەستەواژەو دەربڕینە زمانییانەی بکۆڵینەوە کە لە کاتی ئاخاوتن دا بەکاریان دەهێنێت(٢).

## دیمەنی وەهمی وەک چەمکێکی دەروونشیکاری:

دیمەنی وەهمی بریتییە لە یەکێک لە ڕەگەزە گرنگ و سەرەکییەکانی پەیوەندی بەستنی ئارەزوومەندانەی پیاو لەگەڵ لەشی ئافرەتدا. لە بناخەدا ئەم زاراوەیە چەمکێکی فرۆیدییە و ئێمە بۆ ڕوونکردنەوەی پەیوەندی نالی و مەستوورە بەکاری دەهێنین، بەبێ ئەوەی زۆر خۆمان بە کەلێن و قوژبن و گشت ئەو ڕەهەندانەوە ببەستینەوە کە ئەم زاراوەیە پێناسە دەکەن، یان بەبێ

ئەوەی شوێنی مانای وشەکە لە سەرجەمی ڕەوتی دەروونشیکاریدا (التحلیل النفسی) بناسێنین و پێ بخەینە هەرێمی کێشە تیۆرییە سەختەکانەوە(٣)

( فەنتازم: Fantasm)، پرۆسەیەکە تیایدا ئەندام و بەشە جیاجیاکانی لەشی ئافرەت لە خەیاڵی پیاودا بەرجەستە دەبن و هەر یەکێک لەو ئەندام و بەشانە ڕۆڵی جۆراوجۆر لە پرۆسەی دیمەنی وەهمی و وێناکردنی جەستەی ئەویتردا دەبینن. لێرەدا پێویستە ئەوە ڕوونبکرێتەوە کە غەریزەی جنسیی مرۆڤ هەردەم ئارەزوومەندی و تەمەننا بە دوای خۆیدا دەهێنێ، کە خەسڵەتی بنەمایی ئەو ئارەزوومەندییەش خەسڵەتی پیاوانە بوونیەتی(٤). واتە هێز و ڕووبەری لایەنی نێرانەی مرۆڤ لە کاتی ئارەزوومەندیدا خۆی دەردەخات و خۆی دەنوێنێ و بەرجەستە دەبێت. بەمانایەکی دیکە مرۆڤ بە نێر ومێ-وە، کاتێ ئارەزووی دەبزوێ، ئەوە وزە و پاڵنەری پشتەوەی ئەو ئارەزووە، وزە و پاڵنەرێکی نێرانەیە. یاخود دەکرێ بگوترێ: ئارەزوومەندی (الرغبە) دەبێتە خەسڵەتێکی نێرانە. ئەمەش بە هیچ جۆرێک بەو مانایە نا کە ئافرەت ئارەزوومەند نییە، یا خود ئارەزوومەندی پێشان نادات. بەڵکو دەبێت وەها لێک بدرێتەوە کە «نێرانە بوونی پرۆسەی ئارەزوومەندی دەلالەت لەوە دەکات، وێڕای پیاو، ئافرەتیش لە کاتی دەربڕین و پێشاندانی ئارەزووی خۆیدا سوود لەلایەنی نێرینەیی کەسایەتیی خۆی وەردەگرێت، هەر وەکو چۆن ئەگەر پیاوێک دووچاری عەشق ببێت ئەوە مانای وایە لایەنی مێینەیی کەسایەتییەکەی زاڵە بەسەریا. بەم پێیەش ئارەزوومەندیی بنەمایەکی نێرانە و عەشق بنەمایەکی مێیینەی هەیە» (٥).

ئێستا بەرلەوەی لە چەمکی دیمەنی وەهمی دوور بکەوینەوە، درێژە بە قسان دەدەین. ئەگەر وەکو (فرۆید) دەڵێت(٦) لیبیدۆ، یان هێزی بزوێنەری ژیانی جنسیی مرۆڤ، یەکەم پاڵنەر و پڤدەری ئارەزووی جنسی بێت بۆ خۆ پێشاندانی ئەو ئارەزووە، ئەوا هەموو ئارەزوومەندییەکی سێکسییانەی مرۆڤ بە پلەی یەکەم دەشێت لایەنی «نێرانە»ی کەسایەتیی مرۆڤ تیایدا زاڵ بێت، کە خەسڵەتی دەستبەسەراگرتن (التسلط) سیفەتی هەرە دیاری

لایەنی نێرانەی کەسایەتییەکەیە. چونکە «ئەوەی پەیوەندیی پیاو بە لەشی ئافرەتەوە دیاری دەکات، پابەند و پشت بەستووە بە حەزی دەستبەسەراگرتن و بە هی خۆ کردن» (٧)، کە دیمەنی وەهمی ئەرکی سانا کردنی ئەو حەزی دەستبەسەراگرتنە دەگرێتە ئەستۆی خۆی. واتە بە بێ پەڕینەوە لەکەناڵی پرۆسەی دیمەنی وەهمی، پرۆسەی بەهی خۆکردنیش روونادات.

کەوابێ ئێستا با بزانین گرنگیی کاناڵی وەهمی بە نیسبەت پیاوەوە چییە؟ بۆ وەڵامی ئەمەیش پەنا دەبەین بۆ بەشێکی دیکەی لێکۆڵینەوە بە نرخەکانی دەروونناس (کەرامەتی مووەلەلی) کە ئەویش لە خانەی تیۆریی «لاکانی»دا خۆی دەبینێتەوە.

نێوبراو سەبارەت بە گرنگیی دیمەنە وەهمییەکان دەڵێت: «پیاو پێداویستیی گرنگی بە دیمەنە وەهمی و شانۆنامە خەیاڵییەکان هەیە، چونکە بەبێ ئەوە توانای بەردەوامیدان بە چالاکیی جنسیی خۆی نامێنێ لەکاتی جووتبوونی لەگەڵ ئافرەتدا، لەم رووەوە دامرکاندنەوەی ئارەزووی جنسیی پیاو لەسەر زنجیرەیەک وەهم و خەیاڵ بەندە و تەنیا لەم رێگەیەوە دەتوانێت پەیوەندی بە لەشی ئافرەتەوە دروست بکات» (٨).

بەڵام حەزی دەستبەسەراگرتن لە پرۆسەی ئارەزوومەندیدا کارێکی وای کردووە کە بکەر، یاخود نەفسی ئارەزوومەند زۆر جار لە دیمەنە وەهمییەکەیدا لەشی ئافرەت لە شێوەی **کۆمەڵە پارچەیەکی لێک جودایا** ببینێ، نەک وەکو یەکەیەکی ئۆرگانی و یەکگرتوو. ئەمەش دەلالەت لەوە دەکا: پیاو خاوەنی توانای پێویست نییە بۆ چێژ وەرگرتن لە لەشی ئافرەت وەک «ئەویتر» یاخود وەکو نەفسێکی دی، چونکە بە نیسبەت پیاوەوە شوێنی لەززەت بینین لە «سەرجەمی» بەدەنی ئافرەت وەک بووێکی کامڵی سەربەخۆ (مستقل) لە دەست دەرچووە. بۆیە ئەم پیاوە توانایشی نییە وەکو کەسی دووەمی موتڵەق رووبەڕووی بوونی ئافرەت بێتەوە، کە ئەم حاڵەتەش لای ژاک لاکان پێی دەگوترێ «لادانی جنسیی هەمە چەشن» (٩). دیارە پێچەوانەی ئەمەش هەر راستە، بەو مانایەی ئەگەر پیاوێک دووچاری لادانی جنسی هەمە چەشن

نەهاتبێ، ئەوا لەکاتی پرۆسەی جنسیشدا ئەندامەکانی لەشی ئافرەت وجوودێکی سەربەخۆیان هەیە و لەت و پەت و پارچە پارچە نەبوون و ئافرەت وەک بوونێکی سەربەخۆی رەها کە ناکرێ دابەشبکرێتە سەر چەند بەشێک، قەبوول دەکرێ.

لێرەدا پێویستە ئەوەش بگوترێ کە پەنابردنی پیاو بۆ دیمەنی وەهمی و کۆنترۆڵکردنی ئەندامێک لە ئەندامەکانی لەشی ئافرەت لە ژێر دەسەڵاتی ئارەزوومەندانەدا، نهێنییەکی لە خۆیدا شاردۆتەوە، کە ئەو نهێنییەش بە کورتییەکەی «ترسی لە دەستدانی ئارەزووی جنسی و توانای جووتبوونە». یان گەر بمانەوێ ئاشکراتر قسە بکەین دەبێ بڵێین: پەنا بردنی پیاو بۆ خەیاڵکردنەوە لە تەنیا بەشێکی لەشی ئافرەت و لەوێشەوە خۆ رەحەتکردن بەهۆی دەستپەڕلێدانەوە، پەیوەندیی نییە بەوەی ئەو پیاوە لە رووبەڕووبوونەوەی (کۆنتاکتی) راستەقینەی جنسیدا نییە لەگەڵ ئافرەتدا. بەڵکو ئەمکارە بۆ ئەوەیە کە ئەو پیاوە دەیەوێت بەردەوام لە قودرەت، هەڕەت و بڕشتی پیاوانەی خۆی دڵنیا ببێتەوە و بەو جۆرەش وزە و متمانە بگێڕێتەوە بۆ کەسێتیی خۆی.

هەروەکو (مووەلەلی) هێمای کردووە، ئەم شانۆنامە وەهمی و خەیاڵییانە دوو خەسڵەتی باش و خراپ بە خۆیانەوە دەگرن. باشەکەیان ئەوەیە: بوار بۆ پیاو دەڕەخسێنن بەشێوەیەکی کاتی ئارەزوو و ئاڵۆشی خۆی لە رێگەیانەوە دابمرکێنێتەوە. بەڵام خەسڵەتی نێگەتیڤی ئەم پرۆسەیە لەوەدایە، نەک هەر تەنیا توانای لەززەت بینینی پیاو لە «سەرجەم»ی لەشی ئافرەت وەردەگرنەوە، بەڵکو بەجارێک پیاو لەئاست رووبەڕووبوونەوەی دروست لەگەڵ ئافرەتدا (وەک بوونێکی سەربەخۆی کامڵ و رەها) دەستە پاچە دەکەن و ئافرەت لەلایان دەبێتە کائینێکی نوقسان. ئەم بە «نوقسان» تەماشاکردنەی وجوودی ئافرەت تایبەتمەندییەکی هەموو کۆمەڵگا ئایینی و باوکسالارییەکانە کە کۆمەڵگای کوردیش لە پێش هەموویانەوەیە و ئەمەش بەتەواوی لەهەندێ پراکتیکی کۆمەڵایەتیی وەک «تەماشاکردن»ی کچ-دا

پێش داخوازیکردن، خۆی بەدیار دەخات، بەوەی کە وەسفی تەماشاکەران بۆ ئەو کچە دەبێتە وەسفی بەشەجیاوازەکانی جەستەی و دابەشکردنی بەسەر کۆمەڵێ ئەندامی «جوان» و «ناشیرین»دا: باڵای جوانە بەڵام دەم و لێوی ناشیرینە، چاوی خومارە بەڵام ملی کورتە، باڵای تەواوە بەڵام ناوچەوانی پانە و هتد.

** ** **

ئێستا بەر لەوەی بچینە سەر باسی زەکەری پیاو لە دیمەنی وەهمیدا با بزانین بەهۆی ئەو زانیارییانەی لەمەوبەر لە فرۆید و شیکردنەوەی لاکانییەوە وەرمانگرتن، چیمان لەبارەی نالییەوە پێدەگوترێ؟

وەک لەسەرەتادا خوێنەرم ئاگادار کردەوە، من لەم بەشەی باسەکەمدا نالی، لەسەر ئاستی دابەشکردنەکەی بەشی پێشووەوە: («راوی شاعیر» و نالی نێو رووداوە خەونییەکان) نابینم.. بەڵکو وەک کەسایەتییەک تێیدەڕوانم کە بە زەینی خۆی بیردەکاتەوە. تاقە رێگەیەکیش بۆ ئەوەی بزانین بیر لەچی دەکاتەوە پەنابردنە بۆ گوتارەکانی، چونکە: «زمانی گوتار هاواری وجوودی ناوەوەیە و دەلالەت و وشەو دەنگی زمانێک فۆرمۆڵەی لەپێشەوە سازکراونین.. زمان لەبنەمادا زمانی رەمز و هێمایە (Symbol) .. و لەگەڵ هەستی ناخی مرۆڤدا خاوەنی یەک سیستەمە» (١٠).

ئارەزوومەندیی نالی لەم قەسیدەیەدا شتێکە بەڵگەهێنانەوەی پێویست نییە. رەوا نییە لەسەر ئاستی ئەو ئەدەبیاتەوە، حسێبی بۆ بکەین کە لە مزگەوتەکانی کوردستانی جاراندا بەشێوەیەکی گشتی روانگەی کۆمەڵی پیاوانی لەئاست جەستەی ئافرەتا رادەگەیاند و لەچوار چێوەیەکی گاڵتەجاڕانەدا مەجلیسی پێ گەرم دەبوو.. هەندێ لە مەلاکان و خوێندەوارانی ئەو سەردەمەش بە «رەسمی سوننەت» (نظم) یان لەهەجوی بەدەنی ئافرەتا دەهۆنییەوە.. چونکە ئەم قەسیدەیە جیاوازە و بەڕاستی دەتوانرێت لەسەرجەمی دەقەکەدا خەسڵەتەکانی دەروونێکی ئارەزوومەند دەستنیشان بکرێن.

نالی بەهێنانە سەر شانۆی مەستوورە و کردنی بەپاڵەوانی بەشێکی دراما شیعرییەکەی، خەڵقی کەسێکی تری لەبەرامبەر خۆیدا نەکردووە، بەڵکو بەیانی ئەو ئارەزوومەندییەی کردووە کەخۆی تیایدا بووە. واتە بکەری سەرەکیی نالییە کە لەژێر کاریگەریی هێزی ئارەزوومەندانەیدا بەکارێک هەڵدەستێ؛ کە نێوەڕۆکی ئەو کارەیش لە پرۆسەی «دەستبەسەراگرتن» و «کردن بەهی خۆ» پێکهاتووە. لەبەر ئەوەش کە نالی مرۆڤێکی راستبێژە، یاخود دەروونێکی پاکە، ئەوا تەماشا دەکەین ئەم مەسەلەی «بەهی خۆکردن»ـە، کە بە پلەی یەکەم سروشتی نێرانەی ئارەزوومەندییەکە دەخاتە روو، لەسەر ئاستی «زمان»یشدا رەنگیداوەتەوە. بە دەربڕینێکی دی، کاتێک نالی لەژێر کاریگەری و هێزی ئارەزوومەندیدا پەنا بۆ دیمەنی وەهمی دەبات و مەستوورە دێتە خەیاڵیەوە و وێنای دەکات، ئەوا خۆیشی دەخاتە بەردەمی چارەنووسێک. ئەوەتا بەزمان مەستوورەوە( کە ئیدی لێرەدا مەستوورە کەسێکی تر نییە، بەڵکو بەشێکی دیی کەسێتی نالییە)، دەڵێت:

(هی تۆم ، ئەگەرەم مەسئەلە حەل کەی بە جەوابێ)؟

جەوابی چی؟ نالی دەبێت (چ وەڵامێک ، یاخود وەڵامی چی) بداتەوە؟ تا ئەو بەشەی دیکەی کەسێتی بکاتەوە هی خۆی؟.. ئەو جەوابە جگە لە درێژەدان بەدیمەنی وەهمی و لەو رێگەیەشەوە، دامرکاندنەوەی ئارەزوو، دەبێ چیتر بێت؟! ئایا ئەو چارەنووسەی شاعیر خۆی لەبەردەمدا دەبینێتەوە پێش هەموو شتێک «توانای جنسیی خۆی» نییە کە لەگەڵ ئەو توانایەدا دووچاری ململانێ هاتووە و تەنیا لەرێگای دیمەنی وەهمی و وێناکردنی پارچەیەک لە جەستەی ئەویترەوە، دەشێ خۆی لێ رزگار بکات؟

لەراستیدا وەڵامدانەوەی نالی، وەڵامدانەوەی پرسیاری کەسێکی تر نییە لە دەرەوەی خۆی، بەڵکو وەڵامدانەوەی پرسیاری دەروونە. پرسیارێک کە شاعیر ناچارە بۆ وەڵامدانەوەی پەنابەرێتە بەر سروشتی دەستبەسەراگرتنی نێرانەی خۆی و لەئەنجامی دامرکاندنەوەی ئارەزوومەندییەکەشییەوە لە قودرەت و توانای جنسانیی خۆی دڵنیا بێتەوە. خاڵی سەرەتایی هەنگاونان

بۆ ئەو دەستبەسەراگرتنەش، بریتییە لەخەیاڵکردنەوە لەعەورەتی(مەستوورە). ئەمەش زۆر ئاساییە. چونکە نالی نایەوێت یان ناتوانێت لەرێگەی خەیاڵکردنەوەکەیەوە سەراپای کەسێتیی ئافرەتێک و لەشی ئەو ئافرەتە بەسەر بکاتەوە، بەڵکو تەنیا ئەندامی جنسیی ئەو ئافرەتە دەبینێ. ئەمەش بەو مانایەی کە شاعیرەکەمان توانای نییە لەگەڵ ئافرەتدا وەک وجوودێکی سەربەخۆ پەیوەندی دروست بکات.. بۆیە ناخودئاگایانە و لە فۆرمێکی سیمبولیدا، ئەو ئافرەتە دەبێتە «مەستوورە»، واتە بە«داپۆشراویی/مەستور» دەمێنێتەوە و ئێمە رێگەی ئەوەمان نییە بزانین کێیە!. دیارە هۆیەکی لۆژیکیش ئەوەتا لەپشتی ئەم نهێنییەوە، کە بریتییە لەوەی نالی دیمەنی وەهمی (تەنیا) لە عەورەتی ئافرەت ساز دەکات، بۆیە دەکرێ ئەو عەورەتە عەورەتی هەر ئافرەتێک بێت و گرنگیش نییە ئەو ئافرەتە ناویشی چییە، چونکە «ناو» ئەو چێژە نابەخشێ کە «بیرکردنەوە» لە عەورەت بە نالی دەبەخشێ.. واتە ئەوەی لەخەیاڵەکەی نالی-دا چێژی دەداتێ، ناو نییە. **«مەستوورەی ئافرەت نییە» بەڵکو «عەورەت»ە..**

ئەمجۆرە خوێندنەوەیەی قەسیدەکە لەخۆ خەریککردن بەو کێشانەوە رزگارمان دەکات کە ئایا بەڕاستی مەبەستی نالی لە ناوهێنانی مەستوورە، مەستوورەی ئەردەڵانە؟ لەکوێ ئەم قەسیدەیەی نوسیووە و لەکام تەمەندا؟ ئەوەش لەبەر چەند هۆیەک:

**یەکەم:** ئەگەر بێت و «مەستوورە»ی نێو قەسیدەکە بەمەستوورەی ئەردەڵانیی شاعیر و مێژوونووس و ئەدیب لەقەڵەم بدەین؛ هەروەها بڵێین: بەڵگەمان بۆ ئەمە ماوەی خوێندنەکەی نالییە لەشاری سنە (تەماشای لاپەڕە ٦٨ و بەرەودوای دیوانی نالی بکە)، یان بڵێین؛ نالی مەستوورە بە«ئەدیب» ناو دەبات و مەستوورەی ئەردەڵانییش خوێندەوار و ئەدیب بووە، ئەمە رێی تێدەچێت. ئەویش بەمەرجێک کە بە بەڵگەوە روونی بکەینەوە زاراوەی «ئەدیب »لەسەردەمی نالیدا بەهەمان مانای ئەمڕۆ بەکار هاتووەو پێناسەی

کەسێکی خاوەن قەڵەمی پێکراوە کە بابەتی شیعر و چیرۆک و ژانرەکانی دیکەی ئەدەبی بەرهەم هێنابێ. ئەگەرنا کاتێک ئێمە دەگەڕێینەوە بۆ لای تێکستە شیعرییەکە، ئیدی هەموو بەڵگە ئامادەکراوەکانی لەوەوبەرهەڵدەوەشێنەوە، چونکە «مەستوورە»ی نێو قەسیدەکە کەسێک نییە، «سەرجەمی ئافرەت»ێک نییە بەهەموو رەهەندە ئینسانییەکانییەوە، بە رەهەندە بایۆلۆجی و فیزیکییەکانییەوە، بەڵکو ئەندامی جنسیی ئافرەتە و بەس. ناشکرێ دڵی خۆمان بەو ئەگەرە لاوازە خۆشبکەین و سیفەتی «ئەدیبی» بدەینە پاڵ ئەندامی جنسی و کاری وا نەشیاوە...

**دووەم:** راستە نالی مەستورە بەحەسناو و ئەدیب ناو دەبات، بەڵام خۆ دەکرێ وەسفی حەسناو و ئەدیبی بدرێتە هەر ئافرەتێکی دیکەش، هەر وەکو چۆن دیمەنە وەهمییەکەی شاعیر لەبارەی عەورەتی مەستوورەوە، بۆ عەورەتی هەر ژنێکیش تەفسیر دەکرێت.. دەمەوێت بڵێم: نە سیفەتی(حەسناو و ئەدیب) و نە ئەو بەڵگانەی دەیانەوێ ئیسپاتی(سنەیی) بوونی مەستوورەکەی نالی بکەن؛ لە دینامییەتی قەسیدەکەدا، لە رەوتی دەقە شیعرییەکەدا دەوریان نامێنێ. ئەمەش لەبەرئەوەی وەکو لەپێشاندا گوتم، نالی باسی کەسێک یان فەردێک ناکات، بەڵکو باسی «ئەندامی مێیینەی ژن» دەکات، واتە هەر ژنێک بەهەر ناوێکەوە کە دەشێت خاوەنی بێت.. یاخود ژنێکی تایبەت کە نالی خۆی زانیویە کێیە و فەنتازیای پێوە لێداوە.. چی لە مانای قەسیدەکە دەگۆڕێ، گەر وشەی «مەستوورە» بگۆڕین و ناوێکی تری هاوکێشی خۆی، یان نزیک لە خۆی لەجێگە دابنێین، جگە لە کەمە ئاڵۆزییەک لەڕووی تەکنیکی شیعرییەوە کە لایەنەکانی جیناس و ئیستیعارە و هتد. دەگرێتەوە؟ بڕوانە:

مەحبووبە کە حەسناو و ئەدیبە بە حیسابێ
هاتە خەوم ئەمشەو بە چ نازێک و عیتابێ

یان
ئایینه بەمایینه دەبێ رەنگ نوما بێ
«شوکرییه» بەمەستووره دەبێ موهره گوشابێ

هەڵبەته من کاتێک زاتی پێشنیازی ئاوام هەیه که دەبینم له لێکدانەوەی قەسیدەکەشدا، وشەی مەستووره جگه لەوەی وەکو ناوێک بۆ ئافرەتێک مامەڵەی لەگەڵ کراوە، هیچ رۆڵێکی تری نەدراوەتێ. بۆ روونکردنەوەی ئەم قسەیەش، لێرەدا دوو نموونه له شەرحی خودی دیوانی نالییەوە قەرز دەکەم تا خوێنەر مەبەستەکەمانی زیاتر بۆ ئاشکرا ببێت.

**نموونەی یەکەم:**

(حەسنا: حەسناء، ئافرەتی جوان. عیتاب: لۆمە و گلەیی واته: مەستووره که بەئافرەتێکی جوان و ئەدیبی دا ئەنێن، ئەمشەو هاته خەوم، بەڵام چۆن نازێکی بەسەردا ئەکردم و چۆن بەگلەیی ولۆمه بوو لێم؟!).

تەماشا دەکەین لەم لێکدانەوەیەدا نرخی وشەی «مەستووره» لەوەدایه که ناوە بۆ ئافرەتێک، هەر وەکو چۆن دەشبێ وشەی مەحبووبەش ناو بێ بۆ ئافرەتێ.. واته ئەوەی که ئەو ئافرەته ناوی مەستوورەیە، یا وەکو ناوێکی دی (بەمەرجێ لەگەڵ جوانکاری و کێشی بەیته شیعرییەکەدا بگونجێ)، لەگۆڕینی مانای وشەکانی دوای خۆیدا دەورێکی نییه.

**نموونەی دووەم:**

ئایینه بەمایینه دەبێ رەنگ نومابێ
(مەستووره) بەمەستووره دەبێ موهرەگوشابێ

شەرحەکەی بەمجۆرەی خوارەوە کراوە:
(ئایینه: ئاوێنه. مایینه: ئاواوی، تێکەڵ بەئاو.(×)

ڕەنگ نوما: ئەوەی تیشک بداتەوە، بەمەستوورە: بەم ئەستوورە، یاخود بەمەستوورە، واتە بە شتێ داپۆشراوە کە هێنەکەی نالییە. موهرە گوشا: سەر قاپکراوە، کینایەیە لەکچی بەژنکراو.

واتە: ئەبێ «ئاوێنەکەی» مەستوورە خانم بەشتێکی ئاواوی و وەک ئاو پاک بکرێتەوە تا ڕەنگ بداتەوەو، سەرقاپی مەستوورە خۆیشی بەم شتە ئەستوورە یا بەم شتە شاراوەیەی نالی بکرێتەوە)(١١).

لێرەدا تەماشا دەکەین «مەستوورە»ی یەکەم خراوەتە دوو کەوانەوەو لە شەرحیشدا هیچ کاریگەرییەکی بەلاغی و ماناسازیی بەنیسبەت وشەکانی ترەوە نییە. بۆیە هەر وەکو خۆی، واتە وەک ناوێ بۆ ئافرەتێک ماوەتەوە، کە ئەم ناوە لەم قەسیدەیەدا، دەکرێ ناو بێت بۆ هەر مەستوورەیەک کە لە سەردەمی نالیدا ژیابێ، بەبێ ئەوەی مەبەستی نالی سەرجەمی کەسایەتیی ئەو (مەستوورەیە) بێت.

پێشنیازی ئەوەی کە دنەمان دەدات بۆ گۆڕینی ناوی مەستوورەی نێو قەسیدەکە و جوێ کردنەوەی لە «مەستوورەخانی سنەیی»، فەرزیاتێکن کە بۆ شیعری نالی راستن. چونکە، هەروەکو دەزانین نالی لەهەندێ قەسیدەی دیکەشیدا، بۆ نموونە ئەوانەی باسی(حەبیبە) و(مەحبووبە)یان تێدایە، وشەی حەبیبە و مەحبووبە ناوێکی دیکەن بۆ ئافرەتێک کە ئێمە تائێستاش ناوە حەقیقی و ئەسڵییەکەی نازانین و نالی بەشاراوەیی هێشتوێتییەوە. بەخۆڕاییش نییە، گەڕیدە و شاعیری گەورەی کورد «پیرەمێرد» لەمبارەیەوە گوتوویەتی: «لە نەظەر مندا حەتتا- حەبیبە-ی مالیاوەش شەخصییەتێکی حەقیقی نەبووە و تەنها رەمزێکە حەضرەتی نالی کردوویە بەواسطەی ئیظهاری دەهای شاعیرانەی»(١٢).

لێرەشدا ڕێی تێدەچێت وشەی «مەستوورە» ناوێکی خوازراو بێت بۆ ئافرەتێکی تایبەت، کەدیسانەوە بۆ ئێمە نەناسراوە. دووریش نییە ئەم مەستوورەیە ناوێکی خوازراوی تر بێت بۆ «حەبیبە» و حەبیبەش ناوە بۆ

ناوێکی تر و بەم پێیە نالی ویستبێتی ئەسڵی کەسەکەمان بەجارێ لێبشارێتەوەو ونی بکات.. دیارە بەلەبەرچاوگرتنی بارودۆخی کۆمەڵایەتیی سەردەمی ژیانی مەلا خدر و ئێستاشی لەگەڵدا بێت، بەتایبەتی بۆ نووسینی قەسیدەیەکی لەم بابەتە، دەبوو ئەو کارە بکات، دەنا بۆ سبەی لاشەیان بە دەروازەی شارەوە هەڵدەواسی!

** ** **

ئێستا کاتی ئەوە هاتووە بچینەوە سەر باسی دیمەنی وەهمی و زەکەری پیاو لەم دیمەنەدا.

ئەگەر ئێمە جارێکی دی ئەو بەشەی قەسیدەکە بخوێنینەوە کە نالی تیایدا بەزمان مەستوورەوە دەدوێ، خێرایی و تەوژمی شاعیرمان لەوێنەسازی و تەشبیهاتدا بۆ ئاشکرا دەبێ، کە ئەمەش بارودۆخێکە ئارەزوومەندیی نالی هێناوێتییە گۆڕێ. واتە، نالی بۆ هەرچی زووتر گەیشتن بەکام و لەززەت بینین لەئەندامی جنسیی مەستوورە وەهمییەکەی، ناچارە بەتوندی هەوڵی ئەوە بدات لەشانۆنامە وەهمی و وێناسازییەکانی دانەبڕێ، چونکە بەتەنیا دابڕانێک و بیرکردنەوە لەهەر شتێکی دی کە ئیحای سێکسی نەداتێ، ئەوا ئارەزوومەندییەکەشی دەمرێ و سارد دەبێتەوە. لێرەشدا بەئاشکرا دیارە کە نالی عەورەتی مەستوورە وەکو ئەندامێکی پاسیڤ دەبینێ و نەرمییەکی لەئەندازە بەدەری دەداتێ (بڕوانە: نەخشەی یەکەم). ئەمەیش بەپێچەوانەوەی ئەو هەڵمەت و ئاکتیڤبوونەی لەوەسفەکانی لەوە دوایدا بۆ زەکەری خۆی بە ڕەوای دەبینێ و بەهۆیانەوە زەکەر دەخاتە چوارچێوەیەکی تووڕەیی و لەتاریکیی موتڵەقدا بەندی دەکات (بڕوانە: نەخشەی دووەم). ئەوجا بۆ ئەوەی پەیوەندیی پیاومان لەکاتی ئارەزوومەندیدا بەزەکەری خۆیەوە بۆ ئاشکرا ببێت، پێویستە بەناچاری بکەوینەوە قەرزکردنی هەندێ ئەنجام لە کایەی دەروونشیکاری. ئەمەش نەک لەپێناوی زۆر گوتن و سەر لەخوێنەر شێواندندا، بەڵکو لەبەرئەوەی ناچارییەکی مەنهەجییە و دەچێتە خزمەتی لێکۆڵینەوەکەمان لەبارەی شیعری نالییەوە.

ئێمە پێشتر گوتمان، پیاوێک ئەگەر دووچاری «لادانی جنسیی هەمەچەشن» هاتبێ، لەکاتی پرۆسەی دیمەنی وەهمیشدا لەشی ئافرەت دابەش دەکات بەچەند بەشێکەوە و لەو دیمەنەشدا گرنگی دەدات بە تاقە ئەندامێکی لەشی ئافرەت.. ئێستا دەمانەوێ هێما بۆ ئەوە بکەین کە روانینی پیاو بۆ زەکەری خۆیشی بەدابەشکردنێکی هاوشێوەدا دەڕوات. بەومانایەی وەکو بەشێکی جیاواز لەسەرجەمی لەشی خۆی تەماشای زەکەر دەکات: «وەک ئەوەی وجوودی پیاو و ئەندامی نێرینەیی ئەو دوو وجوودی جیاواز بن. چونکە زەکەر لەژێر دەسەڵاتی پیاودا نییە و بەڵایەکە گوێ بەفەرمانەکانی ئەو نادات.. هۆی جودایی زەکەر لەسەرجەمی کەسێتیی پیاو بەو مانایەیە، کە زەکەر خاوەنی سەربەخۆییەکی تایبەتە و پیاویش لەکاتی جووتبوون و پرۆسەی جنسیدا وەک مەوجوودێکی جودا لە خۆی هەستی پێدەکات. لەراستیدا ئەمەش جوداییەکی فیزیکی نییە بەڵکو پەیوەندیی هەیە بەباری دەروونیی پیاوەوە» (١٣)

نالی لەبەشی دووەمی خەونەکەیدا دەکەوێتە تاریفکردنی زەکەری خۆی و ئاوڕێک لەویش دەداتەوە، یاخود راستترە بڵێم: زەکەر نالی ملکەچی تاریفکردنی خۆی دەکات!، چونکە هەر وەکو پێشتریش گوتوومانە، شاعیرەکەمان لەبەشی یەکەمی خەونەکەیدا بەداخڵکردنی مەستوورە و باسکردنی دووروودرێژی عەورەتی ئەو، خۆی خستە بەردەم چارەنووسی وەڵامدانەوەی پرسیارێک کە ئەو پرسیارەش پەیوەندیی بەتوانا و هەڕەت و ئارەزوومەندیی خودی نالییەوە هەیە. بۆ وەڵامی پرسیارەکەش، پێویستە نالی لەپرۆسەی دیمەنە وەهمییەکەیدا لایەنی دووەمی بەزمەکەی بهێنێتە مەیدانەوە کە زەکەری خۆیەتی. ئەوجا بۆ ئەوەی نیازی سەرجەمی پرۆسەکەیش بێتە دەست، پێویستە هێز و قودرەتی نێرانە بدرێتە زەکەر، تا بەو هۆیەوە بتوانێت دەسەڵات بەسەر پاڵەوانی بەشی یەکەمی شانۆنامە شیعرییەکەیدا بگرێت و ملکەچی ژێر فەرمانی خۆی بکات کەئەویش عەورەتی مەستوورەیە. بەڵام هەر وەکو پێشتر دیمان، نالی

لەخەیاڵکردنەوەکانیدا تەنیا هێنی مەستوورەی دیتووەو دیمەنی وەهمی لەبارەوە سازداوە. واتە مەستوورەی دابەشکردووە. بۆیە بەهەمان شێوەش تەماشای زەکەری خۆی دەکات، بەو مانایەی وەک بەشێکی جودابووەوە لەخۆی.. ئەم کارەش وەنەبێ کارێکی ئاگایانە بێت بەڵکو پەیڕەوکردنە لە هەستی ناوەوە(شعور الباطن)و گوزارشێکە، زمان داوێتی لە دەروونی نالی. با گوێ لەبەیتی یەکەمی ئەم بەشەی خەونەکەی نالی بگرین کەتیایدا زەکەری خۆی، واتە ئەندامێکی خۆی لەسەرجەمی جەستەی خۆی جوێ دەکاتەوەو دەڵێت:

(دێوانە) کە زانی کە دەبێ عوقدە گوشابێ
هەستا و گوتی: ئەشکی ڕەوانم بەفیدابێ!

کەلێرەدا وشەی «دێوانە» هەردوو تایبەتمەندییەکەی لەخۆ گرتووە، واتە چ نێرایەتی و شەڕانگێزی، چ ئەوەش کەنالی وەک مەوجوودێکی دی تەماشای زەکەری خۆی دەکات و بە «دێوانە» ناوی دەهێنێ.

لێرەدا نامەوێت بێمەوە سەر بەشی کۆتایی قەسیدەکە، واتە قۆناغی «بێداربوونەوە»، چونکە لە دوادوای بەشی یەکەمی ئەم لێکۆڵینەوەیەدا کەم تا زۆر قسەمان لەبارەوە کردووە. بەڵام بەلامەوە گرنگە پرسیاری سەرەتای ئەم بەشەی باسەکەمان دووبارە بکەمەوە کەتیایدا سەرنجمان ڕاکێشا بۆ ئەوەی ئایا ئەم قەسیدەیە دەکرێتە بەڵگە بۆ بوونی ئافرەت لەژیانی مەلا خدردا؟

بێگومان ئەمە پرسیارێکی قورسە، بەر لەهەموو شتێکیش پێویستە ئاگاداری ئەوەبین کە ژیانی سێکسیی ڕاستەقینە ڕێگر نییە لەبەردەم پەنابردنی مرۆڤ بۆ دیمەنی وەهمی و دامرکاندنەوەی ئارەزووی جنسی بەهۆی دەستپەڕەوە، چونکە وەک (مووەلەلی) دەڵێت: ئەم پرۆسەیە وەکو ئیمکانییەتێک بۆ بەدەستهێنانی چێژی دوای ئارەزوو دامرکاندنەوە: «هەرگیز لەناو ناچێت و پەیوەندیی نییە بەهەبوون، یان نەبوونی ژیانی

سێکسیی راستەقینەوە». هەر لەبەر ئەوەیشە کەهەندێک جار دیمەنی وەهمی بۆ پووچکردنەوەی رارِایی و تاراندنی «لەئاست ئارەزوومەندیی مرۆڤدا پەنای بۆ دەبرێت. بەمانایەکی دیکە، بەهۆی ئەو کارەوە، واتە بەهۆی وێناکردنی دیمەنە وەهمییەکان و دەستپەرلێدانەوە، پیاو هەولدەدات بیسەلمێنێ کە هێشتا پێی ماوە و کۆتایی بەئارەزوومەندیی نەهاتووە» (١٤).

بەلام ئەگەر بمانەوێت وەلامی ئەم پرسیارە بەشێوەیەکی دی بدەینەوە، واتە راستی و ناراستیی وەسف و وێنە شیعرییەکانی نالی لەبابەت عەورەتی ژنەوە لەگەل پێکهاتەی ئاناتۆمیی کلێشەی ئەندامی مێینەی ئافرەت بەراورد بکەین، ئەوە کاری ئێمە نییە و ناشمانەوێ خۆمانی لەقەرە بدەین. لەگەل ئەوەشدا ئەو رایەی مامۆستا محەمەدی مەلا کەریم دەهێنمەوە کە لەراستای ئەم کێشەیەدا دەریبریوە و هێما بۆ بێ تەجرەبەیی نالی دەکات: «قەسیدەکەی لەمەر «مەستوورە» بەبۆچوونی من {بۆچوونی کاکە حەمە} نیشانەیەکی «شارەزایی» تیا نییەو وای ئەگەیەنێ نالی تا ئەوکاتەش کە ئەو قەسیدەیەی گوتووە، لەم بابەتەدا چێوی هەر لە تاریکی وەشاندووە، ئەگینا شتی وا زۆر بوو بە باسکردنیان بتوانێ بایەخێکی تر بەقەسیدەکەی بدات و ئەوسافەکانی کە هێناونییەوە زیاتر و رازاوەتر بکات» (١٥).

بە پێویستی دەزانم خوێنەر تەماشایەکی تری هێلکاری یەکەمی ئەم باسە بکات، کە تیایدا هەندێ لەپێچواندنە «دوورەکان»ی نالی بۆ عەورەتی مەستوورە پێشان دراوە. ئەم پێچواندنە دوورانەش، واتە تەشبیهکردنی عەورەتی مەستوورە بە «ئەستێرەی سوها، خەیمەی دو ئەستوون، خرچی مودەووەر...» دەلالەت لە«دووریی» شاعیر دەکەن لەبواری پراکتیکی ئەزموونی راستەقینەی جنسیدا. بەلای منیشەوە ئەمە ساتەوختێکی ژیانی تراژیدییانەی شاعیرە، ساتەوەختێک کە نالی تیایدا پێ دەنێتە قەلەمرەوی حەرامەوەو دەبێتە یاخییەکی بێ پەروا، کەچی لەهەمان کاتیشا ملکەچی هێزێکی میتافیزیکییە.. هەم رۆحێکی سەرکەش و هەم دەروونێکی شەرمەزار، لوتکەی ئەم ساتەوەختە تراژیدییەش لەوەدایە کە نالی ناکامە،

بێ ئەزموونە و بە ئومێد نەگەیشتووە، ئینسانێکی موتەلاشی سەردەمێکی شکستی مێژووی رۆحی و فیکریی ئێمەیە کە بەدوور بووە لەهەر پراکتیکێکی راستەقینەی جنسی و دەتوانین لەگەڵ هەزاران لاوی ئێستای ناو کۆمەڵگاکەمان بەراوردی بکەین کە وێڕای هەڵکشانیان لەتەمەندا، هێشتا لەرووی جنسییەوە ستەملێکراون.

## بەشی چوارەم:

# تەمـەنـی نالی لـە « مـەسـتـوورە» دا

بێـسـوود نابێ ئەگـەر لەم بەشـەدا سـەرنجێ لە قـەسـیـدەی مـەسـتـوورە و پەیوەندیی بە تەمەنی نالی-ی شاعیرەوە بدەین.

زۆربەی ئەو لێکۆڵەرەوانەی من دەسـتـم بە بەرهەمـیـان رادەگات، کـاتێـک باسی مـەستوورەکەی نالییـان کردبێ، مـەسەلەی تەمـەنی شاعیریان هێناوەتە پێش.. پێـموابێت زۆربەشیان لەسەر ئەوە رێـک کەوتوون، کە ئەم قەسـیـدەیە زادەی ئەو قۆناغەیە نـالی تیایدا لە پێتەختی ئـەمارەتی ئەردەڵان، واتە شاری «سنە» خوێندوویەتی.

بەکـورتیـیـەکەی، ئەو قـونـاغـەش سەردەمی گەنجـێـتیی شـاعـیـر و هەرەتی تەمەنی جوانیی ئەو بووە.. ئەوەتا مامۆستا محەمەدی مـەلا کەریم لە کـتێبی «نـالـی: لە کـڵاورۆژنـەی شـیـعـرەکـانـیـیـەوە» لاپەڕە: (ل ٢٦ ) دا دەڵێت: «قـەسـیـدە درێژەکـەیشـی کـەباسی خـەوبـیـنینەکـەی خـۆیی بە (مـەسـتـوورەی ئەردەڵان)ـەوە تیـا ئەکـا ، دیارە لە سنە وتوویەتی، چونـکە بابەتەکـەی دیارە بابەتی سەردەمی لاوییەتی» ( ١ ).

ئێـمە لێرەدا هەڵوێـسـتـەیەک دەکەین و بەگـەڕانەوەمـان بۆ دەقی شیـعـرەکە هەوڵدەدەین سەرنجی خوێنەر بۆ چەند شتێـک رابکێشین.

بەتەمـاشـاکـردنـی بەشی دووەمی ئەم لێـکۆڵـینەوەیە «وەهمی مـەسـتـوورە/ مـەسـتـوورەی وەهم» ، دەردەکەوێت پایەی کـارەکـەی ئێمە لەسەر ئەوە بەندە کە ئەم قـەسـیـدەیەی نالی، هێـزێـکی لێـبـیـدۆیی لە پشـتـە کـە نـالی-ی بەرەو کـردەیەکی جنسی راپێچ کـردووە. بۆ دامـرکـاندنەوەی ئەو هێزەش شـاعـیـر پەنا

دەباتە بەر وێناندن و پرۆسەی سازدانی دیمەنی وەهمی. بە پێی ئەو پێناسەیەش کە لەبەر دەستایە دیمەنی وەهمی پرۆسەیەک نییە تەنیا تایبەت بێت بە سەردەمی جوانی و تافی لاوێتیی مرۆڤەوە، تا بەهۆیەوە هەستی ئارەزوومەندیی دامرکێنرێتەوە، بەڵکو جەختم کردە سەر ئەو راستییەی کە پەنابردن بۆ دیمەن و شانۆنامەی وەهمی هەندێ جار بۆ ئەوەیە کە پیاو لە مان و نەمانی ئارەزوو و توانای جنسانی خۆی دڵنیا ببێتەوە. ئەو لێکۆڵەرەوانەی سەردەمی نووسینی ئەم قەسیدەیە بەسەردەمی گەنجێتیی شاعیرەوە دەبەستنەوە، بەڵگەی ئەوە دەخەنەڕوو، کە وەسفەکانی نالی بۆ زەکەری خۆی، وەسفی کەسێکی «شۆخ و قۆز و بڕمێن»مان دێننەوە یاد کە خاوەنی تەکان و هەڵمەت بێ،.. بەڵام بەپێی ئەو بارودۆخە دەروونییەی کە ئێمە نالی-ی تێدا دەبینین و لە لاپەڕەکانی پێشوودا کەم و زۆر لێوەی دواین، بەپشتیوانیی ئەو تێزەشەوە کە دەڵێت دیمەنی وەهمی «خۆ تاقیکردنەوە»ی پیاوە لەئاست مان و نەمانی توانای جنسیی خۆیدا، ئەوا رێگە بەخۆمان دەدەین کە بڵێین: رێی تێدەچێت ئەم قەسیدەیە لەدایکبووی سەردەمێکی تەواو کامڵبووی تەمەنی شاعیر و لەوانەیشە هی قۆناغی پیریی ژیانی بێت، چونکە مەسەلەی ڕاڕایی و دوودڵیی پیاو لە ئاست مان و نەمانی وزەی شەهوەترانیدا، هی سەردەمێکە پیاو تیایدا چووبێتە تەمەنەوە و گومانی لە ئاست توانای جنسیی خۆیدا پەیداکردبێ، نەک هی تەمەنێکی وەک ئەوەی دەیدەنە پاڵ نالی و لە سییەکانی عومر تێپەڕ ناکات(٢). چونکە لۆژیکی نییە نالی، یان هەر کەسێکی دی لەو تەمەنەدا گومان لە قودەرتی خۆی بکات.

بۆچوونێکی دی کە دەکرێ بۆ ئەم بابەتە سوودی لێوەربگیرێ، پەیوەندیی بەرەفتاری کۆمەڵایەتیی کوردەوە هەیە.. نووسینی قەسیدەیەکی ئەوتۆ و ناوبردنی مەستوورەی «ئەدیب و حەسناو»ی هاوسەری «خوسرەو خانی ناکام» تیایدا، وەکو سەرچاوەکان باسی دەکەن، هەروەها مانەوەی ئەم قەسیدەیە و چەندین جار لەبەر نووسینەوەی و (٣) دواجار بەئاسایی باسکردنی لە نێو

گۆڕەپانی ئەدەبی و کۆمەڵایەتیی ئێمەدا، هەموو ئەمانە ڕێگەی ئەوەمان نادەنێ کە نیسبەتی ئەم دەقە بدەینە پاڵ تەمەنی لاوێتیی شاعیر. چونکە بە لەبەرچاوگرتنی بارودۆخی ئەو سەردەمە و ئێستای کوردستانیش لەهیچ گەنجێک و دەستە کوڕێ چاوپۆشی نەدەکرا تەجاوەزی هەموو ئەو مەسەلە ئەخلاقی و داب و نەریتانە بکات و بە ڕۆژی ڕووناک قەسیدەیەکی وەها بنووسێ، بێ ئەوەی بۆی ببێتە مایەی تەنگەتاوی. بۆیە زۆر ڕێی تێدەچێت نالی ئەم قەسیدەیەی لە تەمەنێکی پیرتردا نووسیبێ و بارودۆخی ئەو سەردەمەش لەبەر ئەو پیرێتییە لێی خۆش بووبێت.. واتە «پیری و شاعیرێتی و نزیکیی نالی لە بابانەکانەوە» ئەو خەسڵەتانە بووبن، شەفاعەتیان بۆ نالی و سەرجەمی قەسیدەکەیشی کردبێ.. کەئەمەیش لە کورد چاوەڕێکراوە و پێویستیی بەوە نییە بەڵگەی لەسەر بهێنینەوە.

بۆچوونێکی دی بەدەست ئێمەوە، بریتییە لەو بەیتەی کە مەستوورە تیایا بەنالی هەڵدەڵێ و لەگەڵ زانایانی «چین و خەتاو ختەن» بەراووردی دەکات:

هەر مەسئەلە بیکرێ کە بەتۆ شەرحی کرابێ
مومکین نییە کەس دەخلی بکا چین و خەطابێ

هەر وەکو لەبەشی یەکەمدا مەبەستی خۆمان لەم بەیتە ڕوون کردۆتەوە، لێرەدا قسە لەسەر حیکمەت و زانایی نالییە. دیارە مرۆڤیش لە تەمەنێکی وەک ئەوەی بۆ سەردەمی نووسینی ئەم دەقە پێشبینی کراوە نابێتە حەکیم و زانایەکی وا لێهاتوو، تا بکرێتە «شاریحی مەسئەلەی بیکر»، کە مەسەلەیەکە هەموو یەکێ ناتوانێ خۆی لە هەندەر بدات. ئەگەر ئەو کەسە پلەیەکی دیاریکراوی لە زانست و حیکمەتا نەبێ کە ئەوەیش تەمەنێکی دیاریکراوی دەوێ.

هەروەها لەسەر بنەمای ئەو بۆچوونانەی پێشەوە، ئیمکانی ئەوەمان لەبەر

دەستایە وشەی «دێوانە» بەمانایەکی جیاوازتر لەو مانایانەی پێشوو لێک بدەینەوە و بڵێین: ئەگەر نالی بەهۆی بەکارهێنانی ئەم وشەیەوە هێما بکات بۆ خۆی «هەروەکو چۆن کینایەشی پێکردووە بەزەکەری خۆی»، کە زەکەریش بەشێکە لەسەرجەمی ئەو، ئەوا ئەم هێماکردن و ناو بردنی «دێوانە»یە خۆی پرسیارێک قوت دەکاتەوە.

ئەوە راستە مانای فەرهەنگیی وشەی «دێوانە» بە «گێل و حۆل و نەفام» لێکدەدرێتەوە و بەسەر کەسانی لە دەشت و دەر ژیاوی بێلانەدا براوەتەوە. بەڵام دەبێ ئەو رەهەندە فەلسەفییەی ئایینی ئیسلام لە یاد نەکرێ کە داوێتی بە«دێوانە»کان. لێرەدا هێندە بەسە گەر ناوی کتێبەکەی «ابو القاسم حسن نیشابوری» ببرێت کە لە سەردەمی رێنسانسی سەدەی چوارەمی کۆچیدا بەناوی (العقلاء المجانین)ەوە نووسیویەتی و ئەم وشەیەش «دێوانە» بۆ دەستەیەکی زۆر لەو کەسانە بەکار دەبات کە لە بەرامبەر کەماڵی موتڵەقی خوادا کەوتبوونە پرسیار و سەربزێوی و پەنایان بۆ گومانکردن بردبوو، هەروەها لە زانستێکی زۆر بڵند بەرخوردار بوون و هەمیشە ئەو شتانەیان بەسەردەمدا هاتووە کە عاقڵەکانی دی هەرگیز بۆیان نەچوون(٦).

بەم تێگەیشتنەی مانای وشەکە، «حیکمەت و زانایی وئەزموونداریی دێوانەکان» زێتر دەچەسپێ و ئەگەر نالییش ئەم وشەیە بۆ هێماکردن بەخۆی بەکار ئەهێنی، ئەوە تەئکید لەسەر پلەی زانایی و ئەو حیکمەتە دەکاتەوە، کە ئاگاداریی لێی هەبووە. بۆ ئەوەی پەیوەندیی ئەم قسەیەشمان بەکامڵبوون و قۆناغی تەمەنی شاعیرەوە بۆ دەربکەوێت، پێویستە هێندەش زیاد بکەین و بڵێین: کە پلەو مەقامی دێوانەیی لەنێو خانەقاکاندا، پلەو پایەی ساڵانێکی زۆر عیبادەت و سەر و ریش سپیکردن و لەخزمەت شێخدا شەوو رۆژکردنەوەیە، نەک هی کەسێکی بێ ئەزموون و کەم تەمەن. جا ئەگەر ئەم مانا لێدانەوەیەی نالی وەکو هێماکردنێکی ئەو بۆ کەسێتیی خۆی قبووڵ بکەین و وەهای لێک بدەینەوە کە نالی نەیویستبێ ناوی راستەقینەی خۆی بێنێت و خۆی بە «دێوانە» لەقەڵەم دابێ (کە بێگومان ئەمەش هۆیەکی

تایبەت و ئایینیی خۆی هەیە و پەیوەندیی بەو دیدارەوە هەیە کە هەر مسولمانێک چاوەڕێیە لە ڕۆژی ئاخیرەتدا بەدیتنی یەزدان شاد ببێت و لەپاکیی خۆی دڵنیا بێت) ئەوا بەم خۆ بە «دێوانە» لە قەڵەمدانە هیچ نەبێ هێمایەکی بۆ تەمەنی دێوانەیی و لەوێشەوە بۆ زانایی خۆی کردووە، کە سەردەمی نووسینی قەسیدەی مەستوورە دەگرێتەوە.

هەر چۆنێک بێت، سەبارەت بەبێ ئەزموونیی نالی لە مەسەلەی لەگەڵ ئافرەت نەخەوتنیدا، ڕایەکەی مامۆستا محەمەدی مەلا کەریم بەهای خۆی نادۆڕێنێ، کە دەڵێت نالی تا ئەوکاتەیش کە ئەم قەسیدەیەی تیا وتووە، چێوی هەر لە تاریکی وەشاندووە.. بەڵگەش بۆ ئەمە ئەو هەڵانەن کە شاعیر لە وەسفکردنی عەورەتی ژندا تێیان کەوتووە، ئەمەیش کێشی ئەو تراژیدییە چەند قات زیاد ئەکات کە پێشتر لە ژیانی نالیدا هێمامان بۆ کرد.

## بەشی پێنجەم:

# پەیوەندیی دەقەکان

**یەکەم: لەگەڵ دەرەوەی خۆیاندا**
**دووەم: لەگەڵ یەکتردا**

## یەکەم: پەیوەندیی دەقەکان لەگەڵ دەرەوەی خۆیاندا:

بەشی کۆتایی ئەم لێکۆڵینەوەیە هەوڵدانێکە بۆ ناسینەوەی ئەو سەرچاوە ڕۆشنبیرییە جیاوازانەی لە دەقی مەستوورەدا ئامادەن. کاری ناسینەوەی ئەوەی ئاخۆ چ ئاستێکی ڕۆشنبیری و زانستیی سەردەمی نالی و پێش نالی بوونە بەشێکی دیار لەم دەقەدا، ڕەنگە لەوێدا یارمەتی دەر بێت، کە بزانین دەق نەک بەتەنیا زادەی ساتە وەختێکی عەفەوی و ئیلهامی خودایی نییە.. بەڵکە لەگەڵ سەرجەمی وتارەکانی ئەو ساتەوەختەشدا کە تیایدا بەرهەم دێت، پەیوەندییەکی نەپساوی هەیە.

بێگومان ئێمە نامانەوێت تەنیا لە ڕووبەرێکی تایبەتی و داخراودا پێشوازی لەم دەقەی نالی بکەین، نامانەوێت خۆمان بدەین بەدەست ئەو مانایانەی فەزای قەسیدەکە فەرزیان دەکات و بەس، بەڵکو مەبەستیشمانە بۆ ماناو ڕەهەندی ئەو دەوروبەرەش بگەڕێین کە دەقەکە تێیدا سەری هەڵداوە. بێ هەڵسلەمینەوەش دەتوانین بڵێین: تەنیا پرۆسەیەک، بواری بۆ نالی ڕەخساندووە ئامادەیی خۆی لە سەرجەمی ڕۆشنبیریی ساتەوەختی خۆیدا و ئامادەکردنی ڕۆشنبیرییەکانیش لە خیتابی خۆیدا فەراهەم بکات، «پرۆسەی ڕووداوی شیعری»یە..

پرۆسەی ڕووداوی شیعری بۆتە هۆی ئەوەی کە نالی لە دووڕیانێکی ڕۆشنبیریدا خۆی ببینێتەوە: واتە بواری بۆ ڕەخساوە لەلایەکەوە گوزارشێک لەسەر باری ڕۆشنبیریی سەردەمەکەی بدات و، لەلایەکی تریشەوە پێمان بسەلمێنێ کە بۆ خۆیشی تا چ ئاستێک لەو ڕۆشنبیرییە بەئاگایە. بەمانایەکی دی: بەهۆی پرۆسەی بەرهەمهێنانی قەسیدەیەکەوە کە نالی بۆ مەبەستێکی تایبەت تەرخانیکردووە و ئەو مەبەستەیش لە گێڕانەوەی«خەون»ێکدا بەرجەستە بووە، توانیویەتی تەوزیفی سەرجەمی ئەو ڕۆشنبیرییەش بکات کە بۆ خۆی تیایدا پێگەیشتووە. ئەمە بەبێ ئەوەی سەرجەمی ئەو ڕۆشنبیرییە و گوتارە جیاجیاکانی پەیوەندییەکی ڕاستەو خۆیان بە بابەتی قەسیدەکەی شاعیرەوە هەبێت کە بەیانکردنی حاڵەتێکی ئارەزوو مەندانەیە. ئەمەش بۆتە هۆی دروستکردنی دژایەتییەک لە نێوان بابەت و فەزای شیعرەکە لەلایەک و ئەو چەمکە زمانییانەی شاعیر بۆ ڕوونکردنەوەی بابەتە شیعرییەکەی دەکاری بردوون لەولای دیکەوە.. ئاخر وەسفکردنی ئەندامی جنسیی ژن و پیاو بەهۆی چەمکی ئەستێرەناسی، تەسەووف، جوگرافیاوە و لە پرۆسەی ڕووداوی شیعریدا نەبێت و لە شاعیر قەبووڵ نەکرابێ لە کێ و لە چی قەبووڵ کراوە؟!

بۆ زیاتر ڕوونکردنەوەی مەبەستەکەشمان، هەوڵ دەدەم لە ڕێی قسەکردن لەسەر سێ سەرچاوەی ڕۆشنبیری، کە نالی بۆ بەرهەمهێنانی ئەم دەقە سوودی لێوەرگرتوون، کەمێ لە ڕوونکردنەوەی مەبەستماندا بچینە پێشەوە. پاشانیش بەهۆی چەند نەخشەیەکەوە ئەو بوارە ڕۆشنبیرییانە دەستنیشان بکەم کە چەمکە بەکار هاتووەکانی لای نالی دەگرنە خۆیان.

** ** **

ئێمە کاتێک بۆ ئەم مەبەستە قەسیدەکە دەخوێنینەوە، ڕووبەڕووی چەند سەرچاوەیەکی جیاوازی ڕۆشنبیریی دەبینەوە، کە لێرەدا بۆ ئاسانکردنی کاری خوێنەر دەیانکەین بەسێ بەشەوە:

١) سەرچاوەی رۆشنبیریی دوور.
٢) سەرچاوەی رۆشنبیریی ئامادە.
٣) سەرچاوەی رۆشنبیریی بیسراو.

کەهەموو ئەم سەرچاوانە دەکەونە دەرەوەی بابەتی یان (Emne=)ی شیعرەکەی نالییەوە.

## ١) سەرچاوەی رۆشنبیریی دوور:

مەبەستمان لە زاراوەی «رۆشنبیریی دوور» ئەو زانیارییانەیە کە رەگەز و سەرچاوەیان دەچێتەوە سەر ئەفسانە و حیکایەت و سێمبوولی دینی و سەرگوزەشتەی پاشایان و قارەمانان، یاخود زاراوەی زانستەکانی کۆنن و پەیوەندیی راستەوخۆی لۆژیکییانەیان بە باسی ئیرۆتێکییەوە نییە. لەگەڵ ئەوەشدا ناتوانین لە قەسیدەکەیان وەدەر بنێین. چونکە سەرجەمی دینامیەتی قەسیدەکەیان پێوە بەندە و مانای بنچینەیی و رووبەری راستەقینەی خۆیان دۆڕاندووە و نالی هاتووە ملکەچی مانا و رەهەندی دیکەی کردوون.

ئەو زاراوەو دەستەواژانەی دەچنە ژێر خانەی سەرچاوەی رۆشنبیری دوور لەسەردەمی نالییەوە، دەبن بەدوو بەشەوە:

| دەستەی یەکەم<br>(ئایینی - میتۆلۆژی) | دەستەی دووەم<br>(سەر بەزانستی کۆن) |
| --- | --- |
| طەلیسم: (جادووگەری)<br>عەنقا: (میتۆلۆژی)<br>ماء الخضر: ( ئایینی)<br>مانی: (ئایینی - مێژوویی)<br>گەنج: (داستان و میتۆلۆژی)<br>موضیحە: (زاراوەیەکی شەرعە لە باسی قیصاص دا. بڕوانە: دیوانی نالی، ل: (٦٢٢) | تەشریح: (تشریح الافلاک، ناوی کتێبی مەلایانە لەزانستی ئاسمان شوناسیدا کە «بهاالدین العاملی» دایناوە : دیوانی نالی، ل: ٦٢٢)<br>هەیئەت: (الهیئە: زانستی ئاسمان شوناسی کۆن: دیوان ٦٢٢)<br>جاذبیە و قابلیە: (فیزیاگەری)<br>ضولماتی بەقا: (زانستی تەشریح)<br>سوها: (ئەستێرە ناسی) |

دیاره بەکارهێنانی ئەم زاراوانە لەلایەن نالییەوە و تەوزیفکردنیان بۆ مەبەستێکی شیعری، نیشانەی شارەزایی و ئاگاداربوونی شاعیرە لە هەر یەکێ لەو مەیدانانەدا، کە بەهۆیانەوە توانراوە پەیوەندییەک لە نێوان شیعر و ئایین، شیعر و میتۆلۆژی و شیعر و مەیدانەکانی زانستی کۆن، بێتە ئاراوە.

## ٢) سەرچاوەی رۆشنبیریی ئامادە:

مەبەست لە زاراوەی «رۆشنبیریی ئامادە»، ئەو رۆشنبیرییەیە کە دەشێ لە سەردەمی نالیدا ئامادە بووبێت و پراکتیک کرابێ و پەیوەندیی راستەوخۆی بە ژینگەی شارستانیی شاعیرەوە هەیە. کەرەستەکانی ئەم رۆشنبیرییە لە دەوروبەری ژیانی رۆشنبیریی سەردەمی نالیدا هەبوونی بابەتییانەیان هەبووە و مامەڵەکردن لەگەڵیاندا مامەڵەکردنێکی رۆژانە بووە و هەروەکو دیاریشە نالیش لە قەسیدەکەیدا بەبێ هیچ پلان بۆدانانێک ئاوێتەی کردوون. لێرەدا پێویستە ئەوەش بگوترێ، کە دەستەواژە و زاراوەکانی ئەم رۆشنبیرییە بەهەمان شێوەی دەستەواژە و زاراوەکانی (سەرچاوەی رۆشنبریی دوور)، پەیوەندییەکی راستەوخۆیان بە نێوەرۆکی دەقەکەوە نییە و بۆ تێگەیشتنیش لەهەر یەکێکیان پێویستە بگەڕێینەوە بۆ ئەو مەیدانانەی لە بنەڕەتدا وشە و زاراوەکانیان لێوەهاتوون، یان بە زۆری بەکاریان هێناون و دەهێنن؛ ئەو مەیدانانەش کایەی زانستی جوگرافیا، جیۆلۆجیا و تەسەووف و عیرفان دەگرنەوە. بەڵام لە هەمان کاتیشدا نالی توانیویەتی بیانخاتە ژێر دەسەڵاتی دینامیای قەسیدەکەیەوە. یاخود ئەگەر بمانەوێت بە زمانی «ژان کۆهێن» بدوێین، دەبێ بڵێین: ئەو زاراوە و وشانە لەمەیدانی ئەسڵیی خۆیان دابڕ کراون و (ئینزیاح) یان کردووە بەلای مەیدانێکی تردا و بەو هۆیەشەوە جۆرێک لە «شیعرییەت»یان وەرگرتووە. ئەم سەرچاوە رۆشنبیرییانەش دەکەین بەدوو دەستەوە:

| دەستەی یەکەم<br>(جوگرافی/جیۆلۆجی) | دەستەی دووەم<br>(عیرفان و تەسەووف) |
| --- | --- |
| (جوگرافی و جیۆلۆجی)<br>قورصی ئمەک: (سەربەخانەی جیۆلۆجی)<br>گردی ئمەکین: (سەربەخانەی جیۆلۆجی)<br>قەندیل: (ناوی چیا، جوگرافی)<br>خەتا: (سەربەخانەی<br>خوتەن: جوگرافی)، ناون بۆ ناوچەی منچوری، مەغۆلستان و تورکستانی رۆژهەلات. بروانە: فرهنگ عمید ۹۹۳ و۹۹٤). | سالیک<br>مەسلەک<br>مەجذوب<br>خەلوە<br>قائیم (قائم باالیل) |

لە ئەنجامی بەراووردێکی خێرای ئەم دوو نەخشەیەوە دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە، نالی بەپلەی یەکەم زاراوەی عیرفان و تەسەووفی لە قەسیدەکەیدا تەوزیف کردوون، ئەوجا بەگشتی زاراوەی ئایینی و ئەستێرە ناسی. دووجار زاراوەی میتۆلۆژی و دووجاریش هی جوگرافی و پاشان لە جیۆلۆجی و فیزیاگەری و ئاناتۆمی لەش، زاراوەی قەرزکردووە. دیارە بە لەبەرچاوگرتنی ئەو رۆڵەی بیر و خیتابی عیرفانی لەفەرهەنگی ئێمەدا گێراویێتی، دەبێ لەلامان ئاسایی بێت کاتێک نالی زۆرترین وشەی فەرهەنگە شیعرییەکەی خۆی لەم سەرچاوە رۆشنبیرییەوە، وەرگرتووە(۱).

## ۳) سەرچاوەی رۆشنبیریی بیسراو:

ئێمە مەبەستمان لە بەکارهێنانی ئەم زاراوەیە، ناسینەوەی ئەو رۆشنبیرییەیە کە لە رێی بیستن و دەماودەمەوە دەگاتە گوێی مرۆڤ بەبێ بەڵگەنامەی بینراو و هەستپێکراو. بەڵام ئەم رۆشنبیرییە بناخەیەکی عەقلانیی هەیە و رەنگە رۆژگارێکیش «نزیک یان دوور» بەهۆی زانستە جۆر بەجۆرەکانەوە پێ بنێتە قۆناغی سەلماندنی عەینییەوە. یان دەکرێ سوود لە زاراوەیەکی دی وەربگرین و بڵێین: ئەم رۆشنبیرییە لە قۆناغێکیدا کە

هێـــشـــتـــا نە گـــەیشـــتـبـــێـــتـــە دەست ڕەسی خـــاس و عـــام، ئەوا ڕۆشنبیرییەکی(شەفەهی)ـە و خەڵکی تەنها بە «گوێ» بیستوویانە و بەزمان باسی دەکـەن، وەکـو قـسـەکـردن لەسـەر جـۆرە بـوونەوەرێکی دی کـە لەسـەر ئەستێرەیەکی دیکە بژین. یان وەکو قسەکردن لە بارەی ئەو جیهان و فەزا و ژینگە و گیاندارانەی ڕۆمان و چیرۆک و فیلمی خەیاڵی زانستی باسی لێوە دەکـەن، یان ئەو هەمـوو قـسـە و بـاسـانەی لەسـەر ئەژدیهـا و دێو و بوراق و «سیـمـرغ»ـەوە پشـتـاو پشت و بەبێ خـۆ بۆمـانـدووکـردن، هاتوونەتە زەینی خەڵکەوە.

بە نیـسـبـەت سـەردەمی نـالیـشـەوە، باسکردنی «قـەسـرێکی بەرزی لە ئاوێنەکراو» دەچێـتـە بازنەی ئەم ڕۆشنـبـیرییـەوە و ڕەنگە لەو سـەردەمـەشـدا جـۆرێک لە «خـەیاڵـی زانسـتی» بـووبێت، چونکە لـە هیـچ قـەڵـەمـڕەوێکی سەدەی نۆزدەهەمدا «قەسرێکی موعەللای لە ئاوێنەکراو» نەبووە.

هەروەها کـاتێـک نالی باسی «شتـور مورغ» ، یاخـود نەعـامـە دەکات، کە باڵندەیەکـە و زیاتـر لە دەشـتـەکـانی ئەفـەریقـیـادا دەژی و نـالیـش نەچۆتە ئەفەریقـیـا.. بەو مـانایە نییـە کە نالی لە نزیکەوە ئەم باڵندەیەی ناسیبێ و ئەوجا بۆ مـەبەستێـکی شیعری تەوزیفی ناوەکەی کردبێ. بەڵکو بەو مانایەیە کە شـاعـیر سەری بەسـەرچاوەی جۆربەجـۆردا گێڕاوە و بەو هۆیەوە زانـیـاریی جۆراوجـۆریشی دەست کـەوتـووە. ئەگـەرچی بەڵگـەیەکـیش بەدەسـتـەوە نیـیـە ئیـسـپـاتی هەبوونی کـارگـەی کـیـمـیـاگـەری لەکـوردسـتـانی سـەردەمی نالیـدا بکات، بەڵام شـاعیر زاراوەی ئەم بوارەشی ملکەچی ژێر پرۆسە شیـعرییـەکەی خۆی کردوون:

| زاراوەی کیمیاگەری | بابەتی دیکە |
|---|---|
| ئیکسیر | قەسری موعەللای |
| گەوهەر | لە ئاوێنەکراو |
| زێڕی سوور | |
| ئاوێنە | شتوورمورغ |
| ئاوی ئاوێنە | |

دەکرا ئەم دەستەبەندیکردنە لەسەر ئاستی دیکەش بەئەنجام گەیشتبا ، وەکو دابەشکردنی زاراوە و وشە بەکارهاتووەکانی نێو شیعرەکە لە سەر بنەمای دوانەی «نێر» و «مێ» ، «گەرم» و «سارد» و «نەرم» و «رەق» و هتد.. بەڵام نەمانویست لەوە زیاتر درێژەی بدەینێ. مەبەستی ئێمە لەم دابەشکردنە ئەوەبوو تا ئەو دژایەتییە لە نێوان بابەتی قەسیدەکە: (ئێرۆتیکا ) و رۆشنبیرییەکانی دەرەوەی ئەو بابەتە دەستنیشان بکەین بۆ ئەوەی لێمان ئاشکرا بێت کە چۆن خیتابە جیاجیاکان وشە و زاراوە لە یەکتری وەردەگرن. هەروەها مەبەستیشمان بوو تا لەسەر ئەوە جەخت بکەینەوە، کە شیعر نەک هەر ئیلهام و عەفەوییەتێکی سۆزی شاعیرانە نییە ، بەڵکو شیعری راستەقینە سەرجەمی ئەو رۆشنبیرییەش لەخۆی دەگرێ کە لە ساتەوەختی لەدایکبوونی ئەو شیعرەدا ئامادەیە.

## دووەم: پەیوەندیی دەقەکان لەگەڵ یەکتردا

پاش ئەوەی تا رادەیەک ئەو پەیوەندییانە ئاشکرابوون کە لە نێوان دەقی مەستوورە و خیتابە رۆشنبیرییەکانی تردا ئامادەن، بە پێویستی دەزانم بەشێوەیەکی کورت و چڕ هێما بۆ هەندێ لەو پەیوەندییانەیش بکەم کە لە نێوان دەقە شیعرییەکان خۆیاندان بۆ ئەوەی لەو رێگەیەوە بتوانین بەشێوەیەکی گشتی سەرنجێک لە ئاست پەیوەندیی دەرەوەی دەقەکان، دەرببڕین.

بەزمانێکی تر، دەمەوێ بڵێم: ئایا دەکرێت بە مەبەستی دۆزینەوەی خاڵی هاوبەشی دەقەکان لە ناو خۆیاندا، ستراتیژیی هەمان ئەو دەقانە لە دەرەوەی خۆشیان بناسینەوە؟ ئایا دەکرێت دوای تەواوبوونمان لە خوێندنەوەی دوو دەقی جیاواز، لە دەرەوەی رووبەری نووسراوی ئەو دوو دەقە، هێشتاکو بۆ پەیوەندیی نێوانیان بگەڕێین؟

بۆ زیاتر روونکردنەوەی ئەم پرسیارە، لێرەدا پەنا دەبەینە بەر دوو دەقی شیعریی جیاواز. کە دەڵێم «جیاواز» مەبەستم لە جیاوازیی ناوەڕۆکی ئەو دوو دەقەیە. دەقی یەکەمیان بریتییە لە قەسیدەی «قوربانی تۆزی رێگەتم..» کەلەمەو دوا بەدەقی(ا) ناوی دەبەین و دەقی دووەمیش بریتییە لە دەقی «مەستوورە» کە بە دەقی (ب) ناوی دەبەین.

هەرچەندە فەزای دەقی (ا) لەگەڵ ئەو فەزایەدا جیاوازە کە دەقی(ب) هەیەتی، بەڵام ئەو جیاوازییە نەبۆتە هۆی جیاوازیی دروستکردن لە نێوان «بونیادە شیعرییەکان» دا. بۆ نموونە، لە هەردوو قەسیدەکەدا بونیادی «پرسیارکردن» و بونیادی «هەستکردن بەگوناه» ئامادەن و لە هەردوو قەسیدەکەدا پرۆسەی «تەماهی و ئاوێتەبوون»، بریتییە لە «ئاوێتەبوون و تەماهیکردن» لەگەڵ مرۆڤدا. ئەگەر لەدەقی (ا) دا، ستراتیژی قەسیدەکە، لە «ئێستا»وە بۆ «رابردوو» لە «مرۆڤ»ەوە بۆ «موقەدەس» یان لە

«غوربەت»ـەوە دەمانبا بۆ «غـیـاب»؛ یاخـود ئەگـەر سـەرجـەمی پڕۆسـەکـە بریتییە لە گرێدانەوەی وجوودی شاعیر بەنیشتمانەوە، ئەوە لەدەقی (ب) دا ئەم ستراتیژە هەوڵدانە بۆ تەماهیکردن لەگەڵ «ئەویتر»دا. ئەگەر لەدەقی (ا) دا بونیادی پرسیار بەهۆی ئەو بۆشاییەوە ئامادەیە کە کەوتۆتە نێوان «ئێستا» و «رابردوو»ی شاعیرەوە، ئەوە لە دەقی (ب)دا گرێی حەلکردنی سیرڕێک بۆتە هۆی بەهێزکردنی بونیادی پرسیار. ئەگەر لەدەقی (ا)دا تێکشکانی دەسەڵاتی سیاسیی ئایدیاڵ دەبێتە هۆی پتەوکردنی بیرۆکەی هێنانەکایەی «یەومی نەفخی صوور»، ئەوە لەدەقی (ب)دا، هەستکردن بەگوناه لە ئاست دەسەڵاتی ئەخلاقیدا، دەبێتە هۆی لە قەڵەمدانی هەموو پڕۆسەکە بە «هەزل و روو رەشکەری صەفحەی لەوح و کیتاب»..

ئەمانە هەندێ لەو هاوبونیادانەبوون کەبەشێکی ستراتیژیی دەقەکانمان بۆ دەستنیشان دەکەن. بەڵام دەبێ ئاگاداری ئەوەبین کە هەریەکێ لەم بونیادانە لە نێو خودی تێکستەکاندا بەچەند ئێستگایەکدا تێپەڕ دەبن تا دەگەنە کۆتایی هێڵی ستراتیژیی نێو هەمان دەق. بەبێ ئەوەی ستراتیژیی دەرەوەی دەقەکان کۆتایی هاتبێ. واتە بە تەواوبوونی تێکستی (ا) مانای وانییە ستراتیژیی تێکستی(ا) کۆتایی هاتووە، یاخود بەکۆتایی هاتنی دەقی مەستوورە وابزانین ستراتیژیی قەسیدەکەیش کوژاوەتەوە. ئێستا بۆ ئەوەی بتوانین راستەوخۆتر لە بارەی سەرجەمی ستراتیژیی هەر کام لەو دوو تێکستە بدوێین، ئەم هێڵکارییانەی خوارەوە پێشان دەدەین.

لە هێڵکاریی یەکەمدا، قۆناغی یەکەمی ستراتیژی دەقی(ا) لە «خودی ئێستای شاعیر»ـەوە دەست پێدەکات و پاش ئەوەی بە ئێستگای «نیشتمان، شار، خانەقا، حوجرە و ..هتد»دا تێپەڕ دەبێت دەگاتە «خودی رابردووی شاعیر»، یان راستترە بڵێم دەبوو بگاتە «خودی شاعیر لە رابردوودا». بەم مانایە، لەو شوێنەدا کە تێکستە نووسراوەکەی بەر دەستمان کۆتایی هات، خۆبەخۆ بەشی یەکەمی مەسیری ستراتیژیی تێکستەکەش

کۆتایی دیت. بەڵام هەر لەو کۆتاییەدایە کە شاعیر ئەڵتەرناتیڤی «یەومی نەفخی صوور» دەهێنێتە ئاراوە، کە ئەمەش دەبێتە هۆی درێژکردنەوەی مەسیری قەسیدەکە، بەبێ ئەوەی ئیدی پشت بە تێکست ببەستین. واتە سەرەتای بەشی دووەمی ستراتیژی دەقەکە دێتە ئاراوە کەدیسانەوە لە «خودی ئێستای شاعیر»ەوە دەست پێدەکات تا ئەو رۆژەی «فوو بە نەفخی صوور»دا دەکرێت. ئەمەیە ئەو بونیادەی سەرجەمی ستراتیژی هەردوو دەقەکەی لەسەر دەڕوات، واتە هەوڵدان بۆ تەماهی کردن لەگەڵ میتافیزیکدا.

بەکورتی: ستراتیژیی تێکستەکەی بەر دەستمان سەرجەمی ئەو ستراتیژە نییە کەشاعیر بۆ خۆی داناوە، بەڵکو قۆناغێکی ئەو ستراتیژەیە کە بەچەند ئێستگایەکدا رادەبووری وستراتیژی نالی لەدوا ئەنجاما بریتی نییە لە گەیشتنەوە بە «خود» و بەس، بەڵکو بریتییە لە گەیشتنەوە بە رووبەرێکی میتافیزیکی..

لەدەقی (ب) شدا، شاعیر هەمان ستراتیژی بۆ خۆی داناوە. بەو مانایەی بەشی ناوەوەی ئەم ستراتیژە لە تێکستەکەدا بریتییە لە هەوڵدان بۆ تەماهیکردن لەگەڵ مەستوورەدا. کاتێکیش ئەم هەوڵدانە بەقۆناغی بنبەست دەگا، نالی ئاراستەی دەقەکە بەهۆی بەچاکتر لە قەڵەمدانی کردەی «گەڕان بەدوای ئەسراری هودایا»، (لەگەڵ ئەوەی تائێستا کردوویەتی)، کۆتایی ستراتیژیی دەقەکە لە هەوڵی گەیشتن بە «ئەویتر»ەوە دەگوێزێتەوە بۆ هەوڵدان بە گەیشتن بە «ئەسراری هودا». کەواتە ئەگەرچی قەسیدەکە کۆتایی پێدێت، بەڵام ستراتیژی شاعیر کۆتایی پێنایەت، کە تەماهیکردنە لەگەڵ یەزدانا بەهۆی پەی بردن بە ئەسرارەکانیەوە.

بەمجۆرە دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە بڵێین: جیاوازیی بابەتی هیچ کام لەم دوو تێکستە شیعرییە جیاوازییەکی مەبدەئی و بونیادانەی شاعیر نییە، هەروەها ستراتیژی شاعیر بە کۆتاییهاتنی دەق، کۆتایی پێ نایەت و تەماهیکردن لەگەڵ خود و ئەویتر و خود و نیشتماندا، ئێستگایەکە بۆ تەماهیکردن لەگەڵ میتافیزیکیەتی بووندا، واتە ئەوەی نالی بە «حوزوور»ی ناو دەبات.

دەمانتوانی گەلێ هاوبونیادی دیکەی وەکو: لێکچوونە مۆسیقاییەکانی زمانی هەردوو دەقەکە و بونیادی «پاڕانەوە و سکاڵا» و «بونیادی زەمەن» لە دەقەکاندا بدۆزینەوە و قسانیان لە بارەوە بکەین، بەڵام ئیدی بەپێویستمان نەزانی زیاتر لەسەر ئەم لایەنانە بوەستین. لەگەڵ ئەوەشدا بەگرنگی دەزانم کە بڵێم: ئامادەیی نالی بە نیسبەت ئینسانی هاوچەرخی کوردەوە، زیاتر لەوەی ئامادەییەکی میتافیزیکییانە بێت، یان بەزمانێکی تر: گرنگیی نالی بۆ ئەمڕۆی ئێمە لەوەدا نییە کە بمانبەستێ بەهێزێکی خوداییەوە، هێندەی ئەوەی بەستنەوەمانە بەداهێنانێکی شاعیرانەی رۆژگارێکی تێپەڕیوی میللەتەکەمانەوە، رۆژگارێک کە هەتا ئێستاش لە ئێمەدا ئامادەیە. لێرەوە قسەکردنی ئێمە لەسەر نالی و بەرهەمەکانی هەر بەتەنیا خۆنواندنێکی رەخنەیی و سەلماندنی بانگەشەیەکی تایبەت نییە لەسەر شیعری کلاسیک؛

بەڵکو پێش هەموو شتێ بریتییە لە بەرهەمهێنانی راڤەیەک کە تایبەت بێت بە خۆمان و هەڵگری ئەو مەرجانە بێت کە نەوەی ئێمە بۆ گفتوگۆکردن لەگەڵ بەرهەمی کلاسیکەکاندا لێوەی هەنگاو دەنێت.

## ئەنجام:

# شیعر و جەستە

نالی و گوتاری نالی بەرەنجامی گۆڕانکارییەکی شارستانییانەی مێژووی نوێی ئێمەیە و دروستبوونی شاری سلێمانیش یەکێکە لە دیارترین نیشانەکانی ئەو گۆڕانە ژیارییە، کە دواجار دەتوانین بەهۆی لێکۆڵینەوە لە پێکهاتە میعماری و دامەزراوە جۆراوجۆرەکانی ئەم «پایتەختە تازەیەی بیر و زەینی کورد»، ئەو کاریگەرییەش بەدی بکەین؛ کە گواستنەوەی پایتەخت کردییە سەر جیهانبینی و روانینی مرۆڤی ئێمە بۆ دوارۆژی خۆی. لێرەدا پرسیار ئەوەیە، ئایا لە سەرەتای بناخە دامەزراندنی پایتەختی تازەوە تا ٣٦ ساڵی یەکەمی تەمەنی ئەم پایتەختە، بیر و زەینی مرۆڤی کورد لە قەڵەمڕەوی شاری سلێمانیدا زیاتر بە چییەوە خەریک بووە؟! هەروەها ئەنجامەکانی ئەم پێوە خەریکبوونەش چۆن لە رازاندنەوە و بیناکردنی شوێنە جیاوازەکانی شاردا بەدیار کەوتوون؟ واتە ئێمە بە پێشنیاری لێکۆڵینەوە لە سیمای یەکەم ٣٦ ساڵی تەمەنی سلێمانی دەمانەوێ سەرنج بۆ زەوق و سەلیقە و ئەوگرنگی بەخۆدانەی مرۆڤی کورد رابکێشین، کە بە تەنزیمکردن و رازاندنەوەی شارە تازەکەیەوە دیار بووە. هەروەها دەمانەوێ ئەم گرنگی پێدانەش بە ژینگەی دەوروبەر، بەگرنگیدان بە خود (الاهتمام بالذات) تەفسیر بکەین، بەتایبەتیش کاتێک قسەمان لەسەر شیعری نالی بێت(١).

شێوازی دامەزراندن و دروستبوونی (شار) هەمیشە پابەندی چەند پرنسیپێک بووە کە دواجار ئەو پرنسیپانە خۆیان سروشتی «شار»یان دەستنیشان کردووە. یەکێک لەو پرنسیپانەیش(رەنگە گرنگترینیشیان

بێت)، ئاستی سیاسی و سەربازیی بەخۆیەوە گرتووە. واتە بەر لەوەی شار شوێنێک بووبێت بۆ کۆبوونەوەی خەڵک و گۆڕینەوەی کاڵا و بەستنی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان و دامەزراندنی دامودەزگای هەمەچەشن تیایدا، شوێنی ئاسایش و پاراستنی خەڵک بووە لە هێرشی هێزەکانی بێگانە و سروشتی رامنەکراو.

دیتنەوەی ئەم پرنسیپە یاخود ئەم دیاردەیە لە پرۆسەی دروستبوونی شاری سلێمانیدا برێ سەختە، ئەویش لەبەر نەبوونی سەرچاوەی پێویست. بەڵام وەک دەردەکەوێ، تا ساڵی ۱۸۲۰ کە «مستەر ریچ» چۆتە سلێمانی و ئەو دەمە شاری تازە تەنیا (۳٦) ساڵ تەمەنی هەبووە «لەشکرگا، یاخود - معسکر- هەر ئەو قەڵایە بووە کە مەحموود پاشای مامی برایم پاشا- چوار پێنج ساڵ پێش دروستکردنی سلێمانی، لەم دیو گۆبژە- دروستی کردووە(۲).

ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە ساتەوەختی دروستبوونی شاری سلێمانی، هاوشانی ساتەوەختی لە دایکبوونی لەشکرگا و دامەزراوە سەربازییەکانی تر نەبووە. جا ئایا ئەمە چۆن لێکبدەینەوە؟

بێگومان دەکرێ ستراتیژیەتی جوگرافیایی شاری نوێ خۆی بەڵگەیەک بوبێ بۆ ئەوەی بابانییەکان گرنگیی قەڵاو لەشکرگا بەنیسبەت هەندێ دامەزراوی دیکەوە پلەیەک دوا بخەن، بەڵام ناکرێ ئەم دیاردەیە بەدوور لە سەرجەمی پرۆسەی گواستنەوەی پایتەختەوە حاڵی ببین.

ئێمە دەزانین کە یەکێک لە هۆیەکانی گواستنەوەی پایتەخت لە قەڵاچوالانەوە بۆ مەڵبەندی تازە، واتە بۆ ناوچەی سلێمانیی ئێستا؛ بریتی بووە لە دوورکەوتنەوە لە «قەڵەمڕەوی ژێر دەسەڵاتی بێگانە»، بەتایبەتیش پاشاکانی ئێران. بەڵام ئەمە بەڵگەی ئەوەمان ناداتێ کە ئیدی بابانییەکان لە هێرشی بێگانان خۆیان بێخەم کردبێ و بێ خەیاڵ پاڵیان دابێتەوە، بەڵکو بەڵگەیەکی باشە بۆ ئەوەی کە بڵێین خودی پرۆسەی دوورکەوتنەوە لەژێر دەسەڵاتی هێرشی بێگانە، دەبێ لەهەمان کاتا دوورکەوتنەوەش بووبێ لەو

«شێوازە ژیانە»ی کە مەترسیی لە «ژێرچەپۆکی بێگانەدا بوون» فەرزی دەکات. واتە تەجاوەزکردنی بارودۆخی هەمیشە مانەوە لە ژیانێکی تەیار و ئامادەباشدا لە ترسی هێرشی بێگانە؛ کە ئەم تەجاوەز کردنەش بۆتە هۆی کەمکردنەوەی دامەزراوە جەنگی و سەربازییەکان و رزگاربوونی کاتیی سەرانی کورد لەوەی بیر لە دامەزراندنیان بکەنەوە. لەئەنجامیشدا ئەم تەجاوەزکردنە پرۆسەیەک بووە بۆ هێنانەکایەی سەرەتای شێوازە ژیانێکی تر. ئەمەیش لە زۆر لایەنی روخساری سلێمانیدا دەردەکەوێ و بەڵگەی ئەوەمان دەداتێ کە مرۆڤی ئێمە دوای گواستنەوەی پایتەخت، بۆ پارێزگاریکردن لە خۆی نەهات پەنا بەرێتەوە بەر هەمان ئەو شێوازەی کە جاران پەنای بۆ دەبرد، بەڵکو لەگەڵ مانەوەی مەترسیشدا توانی وزەی خۆی بۆ شێوازی تری خۆ پاراستنیش تاقیبکاتەوە. با لە رێگەی نموونەیەکەوە ئەم تێزە کەمێ روونتر بکەمەوە.

سەیر نییە سەرەتای دروستکردنی شاری سلێمانی بە پرۆسەی (بەپیرۆزکردن- تقدیس) دا تێپەڕیوە. پرۆسەی تەقدیسکردن کە لە دۆزینەوەی ئەنگوستیلە و هەڵکۆڵرانی ناوی «سلێمان» لەسەر ئەو ئەنگوستیلەیە، پرۆسەیەکە، هەوڵدانی ئینسانی کورد بۆ گرێدانی چارەنووسی موقەدەسی خۆی بەخاکەوە، دیاری دەکات. پرۆسەیەکی وەها، کە بتوانێ ریشە و رەگەزی مرۆڤ بەخاکەکەیەوە بچەسپێنێ و لە دووڕیانی یەک چارەنووسدا بیهێڵێتەوە. ئەم گۆڕانکارییە لەناخی مرۆڤی ئێمەدا، ئەوەمان پێدەڵێ کە پەیوەندییەکی ریشەیی و دەروونی بۆتە هۆی جێگرەوەی ئەو پەیوەندییانەی کە قەڵا و لەشکرگاکان ماوە ماوە دروستیان دەکرد. واتە مرۆڤی ئێمەی لەوە رزگارکرد کە هەر تەنیا وزەی خۆی لەبەر پەرچدانەوەی دەرەوەدا بەکار بهێنێ، بەڵکو بواری ئەوەی خستە بەردەم کە ئەو وزەیە دابەش بکات؛ کە ئێمە یەکەم نیشانەی ئەم دابەشکردنی وزەیە لە بنیادکردنی شاری تازە و چاوپۆشیکردنی تا ئەندازەیەکی بەرچاو لە «دامەزراوی سەربازی»یەکاندا بەدی دەکەین.

بۆ نموونە: بەپێی ئەو هەوڵدانە بەنرخەی مامۆستا جەمال بابان بۆ نەخشەکێشانەوەی شاری سلێمانی داویێتی، هەروەها دوای بەراووردکردنێکی خێرای شوێنە سەربازییەکان لە چاو مزگەوت و شوێنی گشتی و حەمامەکاندا، بۆمان دەردەکەوێ کە لە ساڵی یەکەمی تەمەنی سلێمانیدا: **«پێنج»** مزگەوت، **«پێنج»** حەمام، شوێنی یاری و ژمارەیەکی بەرچاو کارێزی ئاو دروستکراون، کەچی لەشکرگا هەر ئەوە بووە کە لە دەوروبەری ساڵی ۱۸۷۰ لە لایەن مەحموود پاشاوە دروستکراوە.

دیارە ژمارەی دامەزراوەکان لێرەدا گرنگ نین، بەڵکو ئەو دەلالەتە جیاوازانەی لە پشت پێویستیی هەبوونی ئەو دامەزراوانەوەن گرنگن. بۆ نموونە ئەگەر دەلالەتی پێویستیی هەبوونی (٥) مزگەوت لە تەمەنی سی و شەش ساڵی یەکەمی سلێمانیدا، مەدلوولێکی ئایینیی موتڵەقی هەبێت، ئەوا دەلالەتی (٥) حەمامەکە، مەدلوولێکی شارستانی و گرنگیدانی هەیە بە پاک و خاوێنی و کایەی تەندروستی کە خۆی لە خۆیدا ئاستێکی دیاریکراوی کولتووری رادەگەیەنێ و دەشێت بە جۆرێک لە دیسیپلینکردنی جەستەی دابنێین لە رێگەی گوتاری پاک و خاوێنییەوە. ئەم دیاردەیەش دووبارە لە گرنگیدان بە باخ و رواندنی دار و دەرەختێکی زۆری وەک ئەوەی مستەر ریچ باسیانی کردووە و هەروەها لەمەسەلەی کارێزلێدان و ئاوەڕۆدەرکردنی تا ئەو«سی و شەش ساڵە»ی تەمەنی شارەکەدا، دووبارەبوونەوە. جا هەر وەکو لە پێشاندا گوتم، لەگەڵ مانەوەی مەترسیی هێرشی بێگانە و بە لەبەرچاوگرتنی ئەو ململانێیەش کە لە نێو خودی بنەماڵەی باباندا هەبووە، تەماشا دەکەین پرۆسەی شارستانییانەی ئەو قۆناغەی مێژووی ئێمە هەر لە بەردەوامیدا بووە. لێرەدا پێویستە ئەوەش بڵێم کە ئەگەر پرۆسەی بیناکردن و لەوێشەوە گەیشتن بە ئاستێکی دیکەی ژیان و جۆرێکی دیکەی پەیوەندی، بەتوندی لە زەینی کۆمەڵی ئێمەدا لە ئارادا نەبووبێ، ئەوە دەبوو ئەو چەند ساڵەی یەکەمی تەمەنی شار، تەرخانکرابا بۆ سنوور قایمکردن و قەڵا بە دەوری شاردا دروستکردن، ئەوجا

ئاوڕ بۆ لایەنەکانی تری ژیان دراباوە، نەک بە پێچەوانەوە.

دیسانەوە سەیر نییە، کە ناوچەی قەڵاچوالان لە مێژووی تازەی میرانی بابان و خەڵکی مەڵبەندەکەدا بەرە و خانەی لەبیرچوونەوە بچێت. ئەم لە بیرچوونەوەیەش یەکەمجار لە خودی وشەی «قەڵاچوالان» و وشەی «سلێمان»ی دا بەدیار دەکەوێت . من دەپرسم: هۆی چی بوو وشەی «سلێمانی» ، توانی جێگەی وشەی «قەڵاچوالان» لە پلانی ژیانی تازەدا لەق بکات؟

ئێمە دەزانین لە فەرهەنگی کوردیماندا، ناو گرنگییەکی تایبەتی خۆی هەیە و تەپۆڵکە و بن پنجێک نییە ناومان نەنابێ، کە هەتا ئێستاش هەر بەو ناوانەوە دەناسرێنەوە. بەڵام خۆ قەڵاچوالان تەپۆڵکەیەک نەبووە، بەڵکو «پایتەختی بابان» و «شارێکی گەورە و گەشاوە بووە، مەڵبەندی زانین و زانایان بووە، پڕبووە لە مزگەوت و قوتابخانە و کتێبخانە و خانووبەرە و شوێنی تر» (٣). بەجۆرێک لەهەر لایەکی کوردستانەوە روویان تێکردووە، چاویان بەئاوەدانی و «شان وشکۆو نەریت»ی نەتەوەکەیان روون کردۆتەوە(٤). لەلایەکی ترەوە، کاتێک بابانییەکان کۆچ دەکەن ئەم مەڵبەندەی ئێستای سلێمانی «هیچ دێ یاخود ماڵ یا خانوو نەبوو»(٥) تا خەڵکی مەڵبەندەکە لە ناونانی شاردا بڕیاریان دابێ و ناوی مەڵبەندی خۆیان لەبەر خاتری کۆچی بەلێشاوی بابانیان گۆڕیبێ، یاخود ناوێکی تریان لێ نابێت. بەڵکو بابانییەکان خۆیان هەموو بڕیارێکیان لە دەستدا بووە. کەچی هێشتاکو، ناوە کۆنەکەی پایتەخت نابێتە ناو بۆ پایتەختی نوێ، وەک ئەوەی دانیشتوانی شاری کۆن ئەو ناوو ناوبانگەیان لەیادکردبێ کەپێشتر بەهۆی وشەی «قەڵاچوالان»ەوە بە قەڵەمڕەوی مەڵبەندەکەیان ڕەوا دەبینرا و مایەی شانازییان بوو، یان هیچ نەبێت ئەوەشیان بەناوەکە ڕەوا نەبینی بەهۆیەوە شاری تازە ناو بنێن: «قەڵاچوالانی تازە» ، یان «خواروو» ، یاخود «قەڵاچوالانی گەورە» و هی «بچووک» ، یان تەنانەت قەڵاچوالانی ئەو دیو گۆیژە و هتد.. کە هەموو ئەم ناو لێنانانە لە کۆمەڵی ئێمەدا باون و ڕەواجیان

هەبووە. بەڵام ئەمانە هیچیان روویان نەدا، چونکە دەبوو مەڵبەندی نوێ ناوێک بێت، هەم پەیوەندییە پیرۆزەکەی مرۆڤی کورد بەخاکەکەیەوە دەستنیشان بکات، هەم پەیوەندییە دنیاییەکەی. وشەی «سلێمانی»یش پڕ بەپێستی ئەم خواستە بوو. وشەیەک لە لایەکەوە حەزرەتی سلێمان پێغەمبەرمان دەهێنێتەوە یاد و لە لایەکەوە پەیوەندیمان بە«سلێمان»پاشای ئەو دەمەی والی-ی بەغداوە دەستنیشان دەکات و لەلایەکی تریشەوە، قارەمانی ویژدانی نەتەوەییمان و خودی سەرچاوەی بنەماڵەی بابان، واتە (بابا سلێمان)، نەمر دەکات.

ئایا بەڕاستی ئەم گۆڕانکارییە گرنگانە، کە تەنانەت لەسەر ئاستی زمانیشدا روویان داوە و وشە کەوتۆتە ململانێ لەگەڵ وشەدا، جگە لە هەوڵدانی مرۆڤی کوردیی دوای گواستنەوەی پایتەختی بابان بۆ ئەزموون کردنی شێوازێکی تر و جۆرێکی تری ژیان، چیی دیکەمان بۆ باس دەکەن؟ ئایا بەڵگەی ئەوە نادەن بەدەستەوە کە ئەو گواستنەوەیە هەر بە تەنیا گواستنەوەیەکی جوگرافیایی نەبووە، بەڵکو گواستنەوەیەک بووە لە زەینێکەوە بۆ زەینێکی تریش.

ئێمە لێرەدا بەبێ ئەوەی بمانەوێ بەهۆی باسکردنی رەهەندی ژیارییانەی باخ و گرنگیدانی مرۆڤی کورد لە سەردەمی سەرەتای عومری شاردا، یان بەهۆی تەفسیرکردنی شوێنە گشتی و یاریگا و بازاڕەوە، بۆ ئەو سەرەتایانە بگەڕێین کە بۆنی ئەوەیان لێدێ مرۆڤی ئێمە بەهۆیانەوە بایەخی بەخۆی دابێ. بەپێویستی دەزانین تەنیا لە ئاست دیاردەی ئەو ژمارە بەرچاوەی حەمامەکانی سلێمانی تەمەن(٣٦) ساڵدا هەڵوێستەیەک بکەین، چونکە هەم لەم رێگەیەوە دەکرێ شیکردنەوەیەکی دەروونی ئەنجام بدرێ و ببەسرێ بەمرۆڤی کوردی ئەوساوە، هەم رێگایەکی باشیشە بۆ گەیشتنەوەمان بەو پەیوەندییەی لە نێوان بونیادی شارستانی کۆمەڵی کورد و بونیادی قەسیدەی مەستوورەدا ئامادەیە.

مستەر ریچ ، هەر وەکو پێشتر هێمای بۆکرا لە ساڵی ١٨٢٠ دا لە

سلێمانی بووه کە تەمەنی ئەم شارە لەو ساڵەدا (٣٦) ساڵ زیاتر نەبووە. دیارە بەلای ئێمەوە ئەم تەمەنە گرنگە و پێویستمان بەوەیە کە خوێنەر لەم ئاستەوە بۆ تێبینییەکانمان بڕوانێ. هەروەکو جەمال بابانیش هێما دەکات، سلێمانی-ی ئەو سەردەمە پێنج حەمامی تیا بووە، بەپێی یادداشتەکانی ریچ تەنیا یەکێک لەو حەمامانە (حەمامی فاتمەخان) تایبەت بووە بەماڵی میر.

گرنگیی ئەم گەرماوانە لەو تەمەنە کورتەی شاری سلێمانیدا، بەتایبەتی لەو ئاستەدا دەردەکەوێ کە جگە لەوەی نیشانەی پاک وتەمیزییە و ئەمەش دەکرێ لەژێر کاریگەریی ئیسلامدا لێک بدرێتەوە چونکە ئایینی ئیسلام هەڵگری گوتارێکی روونە لەسەر پاکوخاوێنیی ئیماندار، بەڵام بەئاشکرا ئەوەش دیاری دەکات کە خەڵکی شار بەشێک لە کاتی خۆیان بۆ خزمەتکردنی لەشی خۆیان لە حەمامدا بردۆتە سەر. حەمام، لێرەدا شوێنێکە، کە مرۆڤ تیایدا زەمەن فەرامۆش دەکات و بەبێ هەستکردن بە تێپەڕبوونی کات، بەجەستەی خۆیەوە خەریک دەبێت. بەهەر حاڵ ئەم بۆچوونە چەندە سادە و ساکاریش بێت، لەوئاستەدا کە دەکرێ بۆ تەمەنی ئەوسای شارستانیەتی سلێمانی و سلێمانییەکان جێی تێبینی بێت، بەهای کەم نابێتەوە.

تەئکیدکردنەوە لەسەر پەیوەندیی حەمامەکان و گرنگیدانی مرۆڤی ئێمە بە لەشی خۆی، ئەوکاتە بایەخێکی گرنگتری دەبێت بەبیر خۆمانی بهێنینەوە، کە دروستکردنی حەمام بریتی نییە لە هەڵچنینی چوار دیوار و بەس، بەڵکو حسێب بۆ کردنی وردی گەلێک لایەنی دیکەی میعمارییە، تا حەمام وەکو(شوێنێکی تایبەت بەگرنگیدان بە لەش) لە شوێنەکانی دیکە جیابکرێتەوە. لێرەدا فیکرەی جیاکردنەوەی «شوێنێکی تایبەت» گرنگە لە شوێنە عامییەکان کە دەشێ سەرشۆرک و کەنار چەم و شوێنی دیکە بێتن.

سەرجەم ئەم گرنگیدانانەی کۆمەڵگای تازە لە سلێمانی-ی ئەوسادا بەسەراپای جەستەی خۆی، وایکردووە کە فەردیش خۆی لە ئاست جەستەی خۆیدا بە دەروەست بزانێت و گرنگیی پێبدات. ئێستا با بزانین چۆن ئەم

پەیوەندییەی نێوان کۆمەڵ و جەستەی شارستانی خۆی و، فەرد و جەستەی فیزیکیی خۆی، لە دەقی «مەستوورە»دا بەتایبەتی رەنگی داوەتەوە؟

یەکەم: قەسیدەی مەستوورە یەکەم قەسیدەی شاعیر نییە کە بۆ مەسەلەی جنسانی و وەسفی جەستەی ئافرەت و پیاو تەرخانی کردبێ، بەڵام،

دووەم: قەسیدەی مەستوورە لە (٤٩) بەیت پێکهاتووە و لە دیوانەکەیشیدا، دوای قەسیدەی «ئەلا ئەی نەفسی بووم ئاسا، هەتاکەی حیرصی وێرانە!» (لە لاپەڕە ٦٨٢، کە بریتییە لە (٧٤) بەیت) و قەسیدەی «ئەی ساکینی ریاضی مەدینەی مونەووەرە»، (لاپەڕە ٦١٥، کە بریتییە لە ٦٨ بەیت) دوور و درێژترین تێکستی نالییە.

سێیەم: بەوەشدا کەبابەتی قەسیدەکە زۆر تایبەتە و بریتییە لە وەسفکردنێکی دوور و درێژ و تا ئەندازەیەکیش زۆر بلێیانەی شاعیر، بۆمان دەردەکەوێ کە گرنگیدانی نالی بەئەندامێکی لەشی خۆی و لەشی «مەستوورە»، هەر مەبەستێکی شیعری نەبووە، ئەگەر ئەم مەبەستە شیعرییە دواجار لەلایەن مەبەستێکی دیکەوە، کە مەبەستێکی شارستانی و کولتوورییە، ئاوی نەخواردبێتەوە. بەڵام وەکو پێشتر روونمکردەوە، مەبەستە شارستانییەکە لە روخساری سەرەتایی شار و پێکهاتەکانیدا خۆی نواندووە و مەبەستە فەردییەکەی نالیش لە وەسفی ئەندامی جەستەی مرۆڤدا. ئەمەیش ئەو پرۆسەیەیە کە نالی-ی رۆشنبیر و بلیمەت لە سەردەمی خۆیەوە ئازایانە گواستییەوە بۆ گوتاری شیعری کوردیمان بەبێ ئەوەی، سەردەمی بۆ دەستنیشان بکا و ئەمەش ئەو جیاوازییەیە لە نێوان گوتاری تاکەکەس و گوتاری باوی کۆمەڵدا.

لێرەدایە کە ئێمە بەپێویستی دەزانین دووبارەی بکەینەوە، کە بەبێ تێگەیشتن لەو پرۆسە ژیارییەی دواجار شاری سلێمانی-ی بۆ کردینە دیاری و بەبێ تێگەیشتن لەو رۆڵەی شاری سلێمانی لە زەین و جیهانبینیی کورددا گێڕای، تێگەیشتن لە جیهانبینیی نالی، وەک بەرەنجامێکی فیکریی سەرەجەمی پرۆسەکە، مەحاڵە. پێشموایە ئا لێرەشدا دەکرێ پرسیاری ئەوە

بخرێته بەردەم: ئایا جیهانبینیی مرۆڤی هاوچەرخی کورد تا چ ئەندازەیەک درێژە پێدراوی گەشەسەندووی هەمان پرۆسەیە؟ ئایا جەستەی کۆمەڵی ئێمە بەهۆی چییەوە تەعبیر لە خۆی دەکات و خیتابی ئەدەبیمان چۆن دەتوانێ ببێتە دەربڕ و بەشێک لە جەستەی بە کیمیاوی سووتاومان؟

# باسی سێیەم

## لە ستاییشی «کەر» دا

(بە ئینسانکردنی حەیوان لە جیهانبینیی نالی دا)

(بۆ: مەحموود زامدار)...

## پێشەکی:

# «عاقڵ» و «کەر»

لە واقیعی هەموو کولتوورەکانی مرۆڤایەتیدا کەر ئاژەڵێکی بەکەمگیراوی بێزراوە. مرۆڤ بەدرێژایی مێژووی ئاگایی خۆی، لەوکاتەوە خۆی وەکو کائینێکی «عاقڵ» ناسیوە و دووچاری وەهمی خۆ بەگەورەترزانی بووە لەئاست گیاندار و سروشتدا، بەشێکی زۆری عەقڵی خۆی بەکارهێناوە تا خۆی لەوانە جیابکاتەوە و هەموو هەوڵێکیش بدات لە کەر نەچێت. کەر لەبەردەمی مرۆڤدا سنووری ناعاقڵی و دەبەنگی و بەهەموو شت رازیبوونە و مرۆڤ هەرچییەک بێت نابێت بهێلێت بچێتە، یان بخرێتە خانەی کەرەوە. گرێی نەبوون بە کەر، یاخود بەکەرنەبوون و وەک کەر لێنەهاتن و بە کەر بانگ نەکردن، هەڕەشەی نەنووسراوی هەر کولتوورێکە بۆ سەر ئەندامەکانی خۆی لەکاتێکدا ئەو ئەرکانە جێبەجێ ناکەن کە لێیان چاوەڕێ دەکرێت، یاخود وەکو ئەرکی دانپیانراو و پەسەندکراو پێناسە دەکرێن.

ئێمە لە زمانی رۆژانەی خۆماندا چەندین دەستەواژەمان هەیە کە لە پشتیانەوە ئەو هەڕەشەیە خۆی شاردۆتەوە و بە وشەی کەر و وەک کەر وایە و گوێدرێژ و کەرسیفەت و کەرتر و کەرەبەرەڵڵا و کەری لات و کەری گەڕ و کەری بار و کەری تەمەڵ و هتد... رازێنراونەتەوە. ئەم دەستەواژانە پێش هەموو شتێ رەنگدانەوەی ئاستێکی کۆمەڵایەتی و سیاسی و شارستانین کە هیچ بەهایەکی بۆ مرۆڤ و فەردانیەت تێدا نییە. هەروەها ئیشکردنی عەقڵ و تێڕوانینێکن کە یاسایەکی مەدەنییانەی نییە بۆ هەڵسەنگاندنی ئاکار و هەڵسوکەوتی ئەندامەکانی ناو کۆمەڵگاکەی. لێرەشەوە، ژیانی رۆژانەی

هەریەکێ لە ئێمە هەوڵدانێکی بەردەوامە تاکو کەسایەتی و جموجووڵ و چالاکییەکانمان لەبەر حوکمی ئەو دەربڕینە زمانی و نیشانە سایکۆلۆژییەکانیاندا هەڵنەسەنگێنرێت. ئێمە نابێت بهێڵین وەک کەر حسابمان بۆ بکرێت، نەک لەبەرئەوەی مافی ئینسانیمان پارێزراو بێت، بەڵکو لەبەر ئەوەی ئەو مافانەش لەدەست نەدەین کە پارێزگاریمان لێکردوون.

بەڵام کەر لە واقیعی کۆمەڵایەتیدا چییە بێجگە لە گیاندارێکی زەحمەتکێش و بێماف و ماندوو، کە بەدرێژایی ژیانی خزمەتی بەشەری کردووە و ملی چەوساندنەوەی لەبەردەمی زەبری دەسەڵاتی مرۆڤدا کەچکردووە؟ ئایا ناکرێت لەبەر رۆشنایی رەفتاری مرۆڤ لەگەڵ ئەم گیاندارەدا، گەلێ گرێی سایکۆلۆژی و کەسایەتیی خودی ئەو مرۆڤەمان بۆ دەرکەوێ؟ مەگەر مێژووی کەر چییە بێجگە لە مێژووی کەمتوانایی مرۆڤ بۆ بیرکردنەوەی لە ژیانی ئەم گیاندارە و مێژووی فەرامۆشکردنی مافەکانی ئەم گیاندارە لەچاو گیاندارەکانی تردا، بۆ نموونە ئێستر، ئەسپ و مایین کە نزیکترین ئاژەڵن لە کەرەوە، چ لە رووی خێزانەوەو چ لە رووی ژینەتیکییەوە!؟ ئەو هەموو مەراییەی ئینسان بۆ هێستری دەکات و ئەو هەموو پیاهەڵگوتنەی لەسەر ئەسپ و ئەو هەموو خاوێنی و بەرەکەتەی بە مایینی بەخشیوە لەچییەوە هاتووە، ئەگەر لەهەمان کاتدا لەسەر حسابی چەوساندنەوەی بەردەوامی کەرەوە نەبووبێ؟ بۆچی بەدیاری ناردنی ئەسپ لە سوڵتانێکەوە بۆ سوڵتانێک مایەی شانازیی بووە و بەدیاری ناردنی کەر مایەی شەرمەزاری و بەکەمگرتن؟ بۆچی سەر دیوارەکانی کۆشکی میر و بەگزادان و نەقشی سەر فەرشی هەڵواسراوی لادیواری دیوەخان و ڕاڕەوی سەراکانی سوڵتان بە دیمەنی ئەسپ و شێر و پڵنگ و هتد... رازێنراوەتەوە و کەر بەتەواوی تیایاندا نادیارە؟ ئایا بە راستی لەپشت هەموو ئەمانەوە ترس لە کەر، ترس لە ئیمازی مرۆڤ بۆ کەر و کەرایەتی، خۆی نەشاردۆتەوە؟ ئایا ئەوە عەقڵ نییە کە بەردەوام حوکمی کردووە مرۆڤ بەشێکی زۆری وزەی خۆی بۆ خۆ بەدوورگرتن لە کەر تەرخان بکات؟

بەکورتی: لە کوێدا عەقڵ ئامادە بووبێ، ترس لە کەر ئامادەبووە و لەوێشدا وێنەی مرۆڤ بۆ کەر وێنەیەکی خەراپ و بەکەمزانراو بووە، سنوورێکی دەروونی بووە بۆئەوەی بەهۆیەوە خۆمان لەسەرچاوەی ترسەکەمان جیابکەینەوە. کەریش لە واقیعدا هەر وەکو ئاژەڵە بێنازە بێ کەسایەتی و مەندەکە ماوەتەوە.

## دەقی قەسیدەی «کەر»

(١)هەی کەرێکم بوو، چ پەیکەر؟ طەی کەری هەوراز و لێژ
سینە پان و، مووچە کورت و، شانە بەرز و، گوێ درێژ

(٢)بن زک و جەبهەت سپی، کلک ئێستر و دامەن سیا
یەککە تاز و سێ بڕ و، دوو باد و، شەش دانگ و درێژ

(٣)کەللە وەک جەڕڕەی شەرابی پر نیشاط و تەڕ دەماغ
شێری نەڕ، ئاهوویی بەڕ، گورگی سەفەر، قەمچی نەچێژ

(٤)مل عەلەم، شیرین قەلەم، ئاهوو شکەم، مەیموون قەدەم
سم خڕ و کلک ئێستر و، مەنزل بڕ و، عارەق نەڕێژ

(٥)زەرق و زەڕڕاقیی وەکوو خاکستەر، ئەمما بێ غوبار
بەرق و بەڕڕاقیی وەکوو پیرۆزە، لاکین بێ کرێژ

(٦)سم وەکوو یەشم و، لە پەشم و تووکی پێ دا سەرنگوون
چاو وەکوو بیجادە یا دوو شەو چراغی شوعلە ڕێژ

(٧)گــــویَ دریَژیَ بـار و کـــــورتـان بەرز و، پـالاّنـی بـەزیَـن
چوست و وریـاتـر لـه گـــویَ کـــورتـانـی پالاّنـی و گـــیَـــژ

(٨)قــانیــعـی بابی ڕەضـــا و ڕاضی به پووش و دڕک و داڵ
ســـالیـکی صـــەبر و تـەحـــەمول، بـوردەبار و هیچ نەویَژ

(٩)عـاقـلـیَ بوو ناوی کـەر بوو، قـاطـیـعـی ڕیَگەی سـەفـەر
خـۆش سلووک تـر بوو لە صـەد ویَلـّداشی هەرزە و گـیَـژ و ویَژ

(١٠)(صــائم الدهر)ی بەڕۆژ، ئەمما بەڕۆژووی بیَ نیــیــەت
(قـــــائـم اللـیـل)ی سلـووک، ئـەمما سـلـووکـی بـیَ نـویَـژ !..

(١١)چەندە پیَم خـــۆش بوو زوبانی حــالـّی دەیوت «نالیــا»
هەردو حـــەیوانین، ئەتۆ گـــویَ کـــورت و ئەمنیش گـــویَ دریَژ

## بەشی یەکەم:

# مـێـژووی کـەر

کەر یەکێ لە کۆنترین ئاژەڵە ماڵییەکانە، لەوە ئەچێ مرۆڤ پێش شەش هەزار ساڵ بۆ یەکەمین جار لە خوارووی زۆنگاوی نیل، لە میسر، کەوتبێتە تێهەڵدان و چەوساندنەوەی ئەم ئاژەڵە. سەرچاوەکان ئەوە باسدەکەن کە هەر لە دێرزەمانەوە لەو ناوچەیەدا گوێدرێژی بەرەڵڵای ئەفریقایی ژیاون و مرۆڤی ناوچەکەش کەوتوونەتە گرتنەوە و دەستەمۆکردنیان. هەندێک لە ئاژەڵناسان رایان وایە ئەم جۆرە گوێدرێژە بە باوکی هەموو جۆرەکانی ئەم ئاژەڵە لە دنیادا دائەندرێت(١).

لە یۆنانی کۆندا، بەتایبەتی لە چاخی فەرمانڕەوایی «مایکینیەکان»ـەوە، کەر (onos) ئاژەڵێکی ناسراو بووە. لە چەند جێگەیەکی شیعرەکانی هۆمێری شاعیریشدا ناوی کەر و هێستر هاتووە(٢). نووسەرانی بابەتە کشوکاڵییەکان و مێژوونووسانی سروشت، گرنگییەکی زۆریان داوە بە باسکردنی خەسڵەتەکانی ئەم ئاژەڵە لە پەیوەندیی بە ژیانی مرۆڤەوە، ئەمە جگە لەوەی ناوهێنانی کەر لە حەکایەت، کۆمیدیا و پەندی پێشینانی گریکیدا رۆڵێکی گرنگی هەیە. وەک چۆن ئێمە ئێستا لە ژیانی رۆژانەی خۆماندا چەندین جار گوێمان لێدەبێت کە خەڵک بەیەکتر دەڵێن: رێوی، بەراز، گۆلک و هتد. ئەوە و وشەی «کەر»یش لەلای گریکەکان هەمان مانای میتافۆری هەبووە بۆ وەسفکردنی مرۆڤ و خەسڵەتەکانی. وێڕای ئەوەی کە یۆنانەکان لە بواری گواستنەوە، کشتوکاڵ و ئاشگێڕاندا سوودیان لە توانای گوێدرێژ وەرگرتووە، ئەوە تا ئەندازەیەکیش گۆشتەکەی خوراوە و شیرەکەشی وەک جۆرێ لە دەرمانی ئارایش و خۆ جوانکردن، بەکارهێنراوە(٣).

گوێدرێژ لە لای یۆنانەکان نەک هەر تەنیا وەک ئاژەڵێکی سیفەت گەمژە و «کەر» بیری لێکراوەتەوە، وەک سوکراتی ئەفلاتوون لە گفتوگۆی فایدۆن (پەرەگرافی: 81e 5) ئاماژەی بۆ دەکات.و سەرخۆشبوون و بەلەسەبوونی مرۆڤ دەشوبهێنێ بە سیفاتەکانی کەر، بەڵکو بە ئاژەڵێکی فزوولی، سەرنجڕاکێش و لەڕووی جنسیشەوە بە «ئیغراکەر» ناوی براوە. ژمارەیەکی زۆر لە نەخشی هەڵکەنراوی سەر پارەی ئەو سەردەمە، بەڕوونی خەسڵەتی ئیغراکەرانەی ئەم ئاژەڵە بە هۆی پیشاندان و بەرجەستەکردنی ئالەتە زلەکەیەوە دەردەخەن.

لە کاتێکدا کەر لەلای گریکەکان بەپلەی یەکەم توانای جنسی و ئەمجا بەهۆی میزاجە نا-مۆسیقاییەکەیەوە، سەودا و مامەڵەی خراپ بەبیر دەهێنێتەوە، ئەوە لەلای میسرییە کۆنەکان سیمبولی شەڕ و نەهامەتییە. لەلای یۆنانییەکانی شاری ئەسکەندەرییەش دەنگوباسی ئەوە هەبووە، کە گوایە یەهودییەکان خودای خۆیان لە شێوەی کەللەسەری گوێدرێژێکدا بەرجەستە کردووە. ئەم قسەیە هەر تەنیا زادەی وردە ناکۆکیی نێوان ئاینزا یۆنانی و یەهودییەکانی ئەو سەردەمە بێت، یاخود واقیعێکی مێژوویی، ئەوە هیچ لەو راستییە ناگۆڕێت کە تەورات و ئینجیل لە ئاستێکی نرخداردا باسی گوێدرێژیان کردووە(٤).

دەوروبەری چوارهەزار ساڵ پێش ئێستا، گوێدرێژە ماڵییە دەستەمۆکراوەکان دەبرێنە خوارووی ئەوروپا و لەوێشەوە بە تەواوی جیهاندا بڵاودەبنەوە. لە چاخەکانی ئەوروپای ناوەڕاستدا، کە سەردەمی زێڕینی خوداناسیی کلاسیکی و غەرقبوونی موفەسسیرە مەسیحییەکانە لە ناو تێکستە ئاینییەکاندا، کەر بەختی لەهەموو کاتێ زیاتر بووە: نرخێکی زۆریان بۆ داندراوە و تەنانەت جەژنێکی تایبەتییان بەناوی «ئاهەنگی کەران»ەوە بۆ گێڕاون(٥). بێگومان ئەمەش هەروەکو پێشتر نووسیم: لەبەر ئەوەی لە «تەورات»دا، گوێدرێژ وەکو ئاژەڵێکی گرنگ باسکراوە کە لەلای خودا شوێنێکی تایبەتی هەیە. لە نامەی دووەمی «پەترۆس»دا، ئایەتی {٢،

١٦}(٦)، تەورات ڕووداوێکمان بۆ دەگێڕێتەوە تیایدا هاتووە، کە چۆن گوێدرێژەکەی حەزرەتی «بیلیام» کاتێ لە ڕێگایدا بەرەو شا «بالاک» و لەدەرووی نێوان دوو شاخدا، سێ جار فریشتەی یەزدان دەبینێت و لە جێگەی خۆی دەوەستێت، بەبێ ئەوەی بلیام لەمە تێبگات. کاتێکیش فریشتەکە لە بیلیام دێتە گۆ، گلەیی و سەرزەنشتی دەکات و پێی دەڵێ: «ئەگەر ئەم حەیوانە گوێڕایەڵە نەدەبووە تکاکارت و یارمەتیدەرت، ئێستا ملت بەم شمشێرە پەڕێنرابوو چونکە تۆ فریشتەی یەزدانت نەبینی» (٧).

لێرەدا بە ڕوونی دیارە کە تەورات جگە لەوەی سیفەتی گوێڕایەڵی بە کەر دەبەخشێت، ئاواش پلەی بەرز دەکاتەوە بۆ سەرئاستی ڕزگارکەری مرۆڤ. بەو پێیەی حەیوانێکە دەبینێت و لە ئاست فریشتەی یەزداندا گوێ ناداتە فەرمانەکانی مرۆڤ.

## ئەدەب و کەر

جگە لە نیگارەکان، میناتۆرەکان، کتێب و نووسراوە مێژوویی و ئایینییەکان، لە ئەدەبیاتی گەلانیشدا کەر بەرجەستە بووە و باسیکراوە، بەڵام وەنەبێ لەوێش حاڵی باشتر بێت.

چیرۆکەکانی ئیزۆپ، کە یەکەمین کەسێکە حەکایەتی بچووک بچووکی سیحراوی لەسەر ئاژەڵان بۆ گێڕابینەوە، هەوڵدانی دوو هەزار و پێنجسەد ساڵی بەر لەئێستای مرۆڤن تاکو پتر لە ژیان و دیاردەکانی ناوی تێبگات. ئیزۆپ دنیایەکی سەرسووڕهێنەر و پڕ لە زیندوویی هەیە و بەشێوەیەک حەکایەتەکانی دەباتە ئاستێ، کە تا ئێستاش بەلامانەوە سەرنجڕاکێش بن. یەکێ لەو فیگەرانەی ئیزۆپ ئیشی لەسەر کردووە «گوێدرێژە» و حەکایەتی «کەر و هێستری لوتبەرز»، «ئەو کەرەی کەوڵی شێری کردە بەر» و «ئەو کەرەی خۆی دەرباز کرد» لە بەناوبانگترینی ئەو حەکایەتانەن(٨).

لەم حەکایەتانەدا کەر ئاژەڵێکی ماندووی سادەیە و ئەرکی خۆی بە زیادەوە جێبەجێدەکات و خۆی ناخاتە ڕیزی «هێسترە لوتبەرزەکان»ەوە کە

بەشانازییەوە دەچن بۆ بەرەکانی جەنگ و لەوسەرەوە بە لاتی و تێکشکاوی دەگەڕێنەوە، یان ئاژەڵێکە لە ژێر ستەم و جەوردا بیر لە گۆڕینی «ناسنامە»ی خۆی دەکاتەوە و کەوڵی شێر لەبەر دەکات، بەڵام ئاشکرا دەبێت و ریسوا دەکرێ؛ یاخود لەو کاتەدا دوو مرۆڤ دەبینن و دەکەونە شەڕ لەسەر ئەوەی کەرەکە بۆ کامیان بێت، ئەم «عەقڵی خۆی» دەخاتە کار و زیرەکانە فرسەت دەهێنێ و لە دەستیان رادەکا!

بەهەر حاڵ لەلای ئیزۆپ کەر بۆخۆی وەک ئاژەڵێک جێگەی مەبەست نییە، خودێکی نییە، بەڵکو فیگەرێکە، نموونەیەک و پارسەنگێکە بەدەست راوییەوە بۆ روونکردنەوەی پلەی دواکەوتنی عەقڵی مرۆڤ و نیشاندانی ملکەچی و هەندێجار یاخیبوونیش بەکار دەهێنرێت، بەبێ ئەوەی خودی ئەم ئاژەڵە ببێتە جێگەی سەرنجی ئیزۆپ.

کۆنترین دەقێکی نووسراوی ئەدەبی کە بەتەواوی بۆ کەر تەرخان کرابێ، یاخود باسی ئەم گیاندارەی تیا هاتبێ، بریتییە لە داستانی «مەسخبوونی لوکیوس» یان (Lukius` Metamorfose)ی نووسەرێکی نەناسراوی سەردەمی ئیمپراتۆریەتی رۆمانی. ئەوەی لەم بەرهەمە ماوەتەوە، بریتییە لە دوو دەستنووسی لەبەرانووسراو، یان کورتکراوەی بەرهەمە سەرەکییەکە، کە یەکێکیان بەناوی «کەری ئاڵتوونی»یەوە ناوبانگی رۆیشتووە و نووسەرەکەیشی ناوی «ئەپولیتووس» بووە. ئەپۆلیتووس نووسەرێکی رۆمانی بووە و لە ساڵی ١٢٥ی زایینیدا لە شاری «مداورۆج»ی جەزائیری ئێستادا، کە ئەو دەم لە ژێر دەسەڵاتی رۆمانییەکاندا بووە، هاتۆتە دنیاوە(٩). لە تەمەنی لاویدا هاتۆتە قورتوبە، کە ئەودەم سەنتەرێکی رۆشنبیری بووە و پاشان بەرەو ئەسینا رۆیشتووە تاکو «فەلسەفەی ئەفلاتوون، مێژووی سروشت، هەندەسە، ئەستێرەناسی، یاسا، مۆسیقا، شیعر» و لە هەمووشیان گرنگتر هونەری «رەوانبێژی» یان «ئاخاوتن» بخوێنێ.

بەسەرهاتەکانی ناو داستانی «کەری ئاڵتوونی» رەنگدانەوەی هەموو ئەم لایەنە زانستییانەیە و ئەنجامی سەفەرەکانی نووسەرن بە ناو مەڵبەندە

جیاوازەکاندا، وەک گوتاربێژێکی گەڕیدە و لێزان و خاوەن حیکمەت لە کۆکردنەوە و پێکەوە بەستنی مەبەستدارانەی ڕووداوەکان.

کورتەی ئەم نووسراوە دەگمەنە ئەوەیە، وەک نووسەرەکەی ڕاستەوخۆ نووسیویە: «خوێنەری هێژا: من لەم حەکایەتانەدا چەند بەسەرهاتێکی جیاواز پێکەوە کۆدەکەمەوە، تاکو بەجۆرێ دایانبڕێژمەوە کە جێگەی چێژ بینینی تۆ بێت. لێرەدا گوێ بیستی بەسەرهاتی مەخلووقاتی سەیر و سەمەرە و مرۆڤەکان دەبیت، کە چۆن بە سەرسووڕهێنەرترین شێوە مەسخ دەبن بۆ ئاژەڵ و دەشبنەوە بە خۆیان» (١٠).

یەکێک لەو مرۆڤانەش کە مەسخ دەبێ و دەبێتە گوێدرێژ، قارەمانی ڕۆمانەکە خۆیەتی و ئێمە هەموو بەسەرهاتەکان لە ڕوانگەی ئەمەوە گوێ بیست دەبین. قارەمانێ کە بە شێوە گوێدرێژە و بە بیرکردنەوە مرۆڤ و ئەمەش گێڕانەوەکانی هێندەی تر شیرینەکات.

هەر بەشوێنپێی کارەکەی «ئەپۆلیتووس»دا، نووسەرێکی دیکەی نەناسراو، هەستاوە بە کورتکردنەوەی هەمان داستان و لەهەمان کاتیشدا کەمکردنەوەی ڕەهەندە ئایینییەکەی، کە بەناوی «گوێدرێژێک»ەوە بە ئێمە گەیشتووە (١١). قارەمانی ئەم دەقە کورتکراوەیە، {بەڵام لە گەلێک ڕووەوە جیاواز لە دەقی «کەری ئاڵتوونی»} گەنجێکی دەوڵەمەندە بەناوی «لوکیوس»و خەڵکی شاری «پاترای» ڕۆمانییە. لوکیوس لەسەر سەفەری بازرگانییە و باوکی، (کە کابرایەکی سیاسەتمەدار و دەوڵەمەندە) داوای لێدەکات لە سەفەرەکەیدا نامەیەکی بۆ بگەیەنێتە یەکێ لە هاوڕێکانی کە لە شاری «هەیپاتا»ی جادووبازان و سیحربازانی وڵات دەژی. کاتێ لوکیوس دەگاتە ئەوێ و فریوی عەشقی کارەکەری هاوڕێکەی باوکی دەخوات، کە ناوی «پالایسترا»یە، تێدەگات کە ژنی کابرای خاوەنماڵ جادووگەرە و شەوانە بە هۆی خواردنەوەی شلەمەنییەکی گیراوەوە دەبێتە مەل و لەپەنجەرەیرا دەداتە شەققەی باڵ.

لوکیوس لاوێکی بیست ساڵانە و پڕە لەخەونی فڕین. لەگەڵ دۆستە کارەکەرەکەی ڕێکدەکەوێ، کە بۆ تاقیکردنەوەش بووە، ئەو دەرمانەی بۆ بدزێت و ئەویش بیخواتەوە و بداتە شەقەقەی باڵ. وەلێ دوای ئەوەی دەرمانەکە دەخواتەوە، بۆی دەردەکەوێ کە هەڵەیەک لەو کارەیدا هەیە، چونکە وردە وەردە سم و تووک و گوێ دەردەکات و دەبێتە گوێدرێژ بەبێ ئەوەی خەسڵەتە ئینسانییەکانی خۆی بۆ بیرکردنەوە و تێگەیشتن و بینین لەدەست بدات. تاقە ئومێدێ لوکیوس هەیەتی ئەوەیە، کە بەخواردنی گیایەک، کە «پالایسترا)»ی کارەکەر پێی گوتووە، دەبێتەوە بەخۆی. بەڵام بۆ بەختی ئەو، وەرزی پەیدابوونی ئەو گیایە هێشتا زۆری ماوە. ئیدی ئێمە لێرەوە لەناو بەسەرهاتە سەرنجڕاکێشەکانی لوکیوسی بەکەربوودا ڕۆدەچین: ئەم کاروان دەیداتە ئەویتر و ئەم خاوەن دەیفرۆشێ بەو کڕیار. سەیر لەوەدایە خەڵک هێدی هێدی لە کارامەیی ئەم گوێدرێژە بەئاگادێن و لە بۆنەی تایبەتیدا بەشداریی پێدەکەن و بەخششێکی زۆریش دەدەنە خاوەنەکەی. یەکێک لەو بۆنانە ئەوەیە کە لە کەرناڤاڵێکی جنسیدا لوکیوسی بەکەربوو دەبێت بچێتە لای ئافرەتێک و کاری وای لەگەڵدا بکات و بەهەرحاڵ لەگەڵ ئافرەتەدا زۆر خۆشی لێڕادەبوورێ!

بەسەرهاتی لوکیوس بەشێوەیەکی کامەران کۆتایی نایەت، بەڵام کۆمیدییانەیە. ئەو دوای ئەوەی دەبێتەوە بە مرۆڤ، دەڕواتەوە بۆلای هەمان ئافرەت کە لە کەرنەڤاڵەکەدا لەگەڵیدا ڕایبواردبوو. بەڵام ژنە دەستی بە ڕووەوە دەنێت و فڕێی داوێتە دەرێ، چونکە ئەو لوکیوسی تەنیا وەک «کەر» دەوێ نەک وەکو مرۆڤ، تەنانەت زۆریشی لەبەر گران دەبێ کە لوکیوس بۆتەوە بە خۆی و ژنە هەرەسێ نائومێدیش دەبێ!

وێڕای ئەدەبیاتی نوکتە و سەرگەرمی و بەیتە میللییەکان و ئەدەبی منالان، کەر لە لای نووسەر و شاعیرێکی وەک «لافۆنتین»یش جێگەی خۆی هەیە. لەو بەرهەمەیدا کە بەناوی «حەکایەتەکانی لافۆنتین»ەوە بە ئێمە گەیشتووە(١٢)، بەسەرهاتی دەیان کەری بارگران، لە خۆبایی،

لاساییکەرەوەی حەیوانەکانی دیکە (بەتایبەتی سەگ)، کەری لەبەرەی خۆ پتر قاچڕاکێشاو، حەسرەتخواردوو بۆ رۆژگارێ کە خاوەنێکی باشی هەبووە و هتد.. بەرچاو دەکەوێ، تا ببێتە عیبرەت بۆ ئەو مرۆڤانەی دەیانەوێ بەهۆی ناشکوریکردن، لاساییکردنەوەی خەڵکانی تر و نازکردنەوە خۆیان فەرز بکەن. کەر لەلای لافۆنتینیش بەهەمان شێوەی لای ئیزۆپ، معیارێک و فیگەرێکە تا مرۆڤ بە دوورەپەرێزیی لە رەفتارەکانی، هەوڵبدات لەڕیزی کەران حسابی بۆ نەکرێت!

خاڵی هاوبەش لەناو ئەو دەقانەدا کە ناوم بردن و چەندین دەقی دیکەی وەک کەرەکانی لای «مەلای مەشهوور و سەعدیی شیرازی و مامۆستا قانع»ی خۆشمان، ئەوەیە کە ببنە شوێنی دەرز وەرگرتن و لێوەفێربوونی مرۆڤ تاکو مرۆڤیش بەهەمان دەردی ئەو کەرانە نەچێت(١٣). لەناو ئەم دەقانەدا کەر وەک ئاژەڵێکی سەربەخۆی خاوەن سروشتێکی حەیوانیی تایبەت نەخراوەتە روو. خاوەنی ئێستاتیکای خۆی، میزاجی خۆی و زمان و خودێتیی خۆی نییە. کەر وەک بەشێ لە دنیای سروشت و تەنانەت وەک دروستکراوێکی یەزدانیی کە جێگەی شانازیی ئیماندار و نموونەی دەستڕەنگینیی خودا بێت، تەماشای نەکراوە. ئەم دەقانە ناتوانن وێنای ئێمە بۆ ئەم ئاژەڵە بخەنە ژێر پرسیارەوە و ناچارمان بکەن بەجۆرێکی دیکە بیری لێبکەینەوە.

## بەشی دووەم:

# بەدەنگهاتنی کەر

لەناو ئەو مێـژووەوە دواجـار کـەر بەدەنگ دێت، دێتـە زمـان و لە ڕێگەی لۆژیکی مرۆڤەوە، ئیعتـیبار بۆخۆی دەگێڕێتەوە و دەبێتە بابەتێکی گرنگ لە ئەدەبیـاتی جیدیی مـیللەتاندا. لە ئەدەبی کوردیدا نالی ئەو شاعـیـرە مەزنە مرۆڤدۆستەیە کە گوتاری هیومـانیستانەی خۆی بە ئاوڕدانەوە لە گیاندارێکی بە پەراوێزکراوی چەوسـاوە، هێندەی دیکە بەرفـراواندەکـات و بەم کـارەیشی خۆی لە گەلێک لەو شاعیرانەی خۆرهەڵات جیادەکاتەوە کە دەشێت لە بواری جوانکاریی شیعریدا بە مامۆستای ئەویان دابنێین. نالی شاعیری شوێندەست دیاری ئەو بـابەتانەیە کـە لە ڕەوتی شیـعـری کـلاسیکیـدا هێندە بایەخیـان پێنەدراوە. ئەو شیعری کلاسیکی لە کۆشکە شکۆدارەکانی خۆی، لە یاسا و بابەتە ئاشکراکانی خۆی، لەپانتاییە بەمیرات بۆجـێماوەکانی خۆی رزگـار دەکـات و ئاشنای دەکـات بە پانتـاییـەکـانی پەراوێز و ڕووبەرە حـەرام و بێزراوەکان، بەبێـئەوەی لەمکارەدا جوانکاریی شیـعری کـلاسیکیی بکاتە قوربانی.

لەپشت گـوتاری شیـعریی نـالییـەوە، مرۆڤێ دەبینین لەنێوان سروشت و جیـهانی کۆمەڵایەتیدا، لە نێوان ئاسمان و گەردوون و شتەکاندا دەژی، بەڵام ئەو ناتوانێ خۆی بێت، ناتوانێ تەحقیـقی خۆی بکات ئەگەر لەهەمان کاتدا توانای بەراوردکردنی خۆی، وەک سەنتەرێکی بیرکەرەوە، بە گیـاندارەکـانی دیکە نەبێت کە کەوتوونەتە دەرەوەی ئەو بەسەنتەربوونی مرۆڤە و بە کـائینی ناهۆشـیـار و ناهۆشـمـەند مـەحکوومکراون. نالی لە ڕێگەی بەدەنگهـێنانی کەرەوە، لەڕێگەی باسکردنی جوانی و میزاج و تواناکانی ئەم گیاندارە بێزراو

و مەحكوومكراوەوە، رادیكاڵترین جۆری هیومانیزم بەرهەمدەهێنێ: هیومانیزمێ كە توانای هەیە گەورەیی خۆی لە رێگەی بینینی بێزراو و فەرامۆشكراوەكانەوە بینا بكات، بەبێ ئەوەی شەرم لەمكارەی بكات.

** **

سەرەتای شیعرە ریوایەتئامێزەكەی نالی بە دەنگێ دەستپێدەكات كە دەنگی بڕوابەخۆبوون و دڵنیایی و مژدەهێنەرە. دەنگێكە هاتووە تا راشكاو و بڵند بێتە گۆ و سەرنجمان بەرەو ئەو بابەتە رابكێشێ كە شاعیر دەیەوێ ریوایەتی بكات، واتە بەرجەستەی بكاتەوە و بیشیعرێنێ. دەنگی «هەی..» دەنگی شادیێكە كە لە پشتییەوە ساتەوەختی گەیشتن بە راستییەک و ئاشكرابوونی نهێنییەک ئامادەیە و شاعیریش بەو راستییە گەیشتووە و ئەو نهێنییەی لێ ئاشكرابووە و ئێستاش هاتووە تا لەناو ئەو خۆشی و سەرسامییەدا بۆ ئێمە بدوێت. دەنگی «هەی» كلیلی تێگەیشتنە لەو گۆشەنیگایەی نالی لێیەوە ریوایەت دەكات و ئەم دەنگەش قورساییەكی زۆری هەیە لەسەر هەندێ لە بەیتەكان، كە پاشان دێمەوە سەر ئەم باسە.

ئەوەی لێرەدا گرنگە لەسەری بوەستین، نیوەی یەكەمی بەیتی یەكەمە كە پڕە لە دەلالاتی سەیر و گرنگ. وەک ئەوە وایە شاعیر لە مەجلیسێكا خۆی لەبەردەم كۆمەڵێ لە هاوەڵ و خەڵكانێكدا بینیبێتەوە، كە داوای سەلماندێكیان لێكردبێ و ئەویش بە گۆكردنی ئەو دەنگە هاتبێتە قسەكردن، یاخود بەوە دەچێ شاعیر لە دووڕرا دەركەوتبێ و نەیتوانیبێ ئەو خۆشی و كامەرانی و نەشئەیە كۆنترۆڵ بكا، كە لە ئەنجامی لێخووردبوونەوە شیعریەكانیەوە پێیانگەیشتووە و هاواری لەو مەجلیسە كردبێ: «هەی» بەواتای گوێڕادێرن و سەرنجبدەن، قسەكانتان ببڕن، ئەوا من هەواڵێكی سەیرم بۆ هێناون كە ئەنجامی ئاشكرابوونی نهێنییەكە و راستییەكتان بۆ بەیاندەكەم كە ناشێت لێی بێئاگا بین.

دەنگی «هەی» لێرە بەدواوە كاری خۆی دەكات و بێدەنگییەک بە دوای

خـۆیدا دەهێنێ و هەمـوو لە مـەلا خـدر رادەمـێنن. ئاخـۆ دیسـانەوە ئەم خانەقـانشـینە چ پرسـیـارێکی دیکەی شـیـعری لەلا دروسـتبـووبێ؟ لەناو ئەم فەزا کۆمـەڵایەتی و بێدەنگیـیـەدا، زەمینەی بەردەوامـبوونی شـاعـیـرەکەمـان لەسـەر قسـەکردن دەرەخسـێت و ئەویش وەکـو گوتاربێژەکـانی یۆنانی کـۆن، ئاگایانە و زیرەکـانە فەزای بێدەنگییـەکە دەقۆزێتە و بەردەوامیی وەردەگرێت تاکـو بە «قـووەتی حـیـکـمـەت، زۆرترین مـەعنایی گـەورە بە لەفظی کـەم و بچووک، ئەدا بکا» (١٤):

## (هەی.. کەرێکم بوو)

بەڵام ئایا خـەبەری ئەوەی «من»ی ناو دەقـەکـە کـەرێکی هەبووە، بەسـە بۆ ئەوەی گـوێگرانی ئەودەمـەی شـاعـیـر و ئێـمـەی خـوێنەر لە ئێـسـتـادا بمانەوێ بەردەوام لە بێدەنگیـدا بمێنینەوە و بەسـەرسـامـییـەوە گـوێبگرین؟ وەک ئەوەی شـاعـیـر لەگـەڵ درکـاندنی خـەبەرەکـەیدا ئەم پرسـیـارەی دەرک پێـکـردبێت و دەروونشـیـکـارانە تێگەیشتبێت لە ناوەرۆکی ئاشکرا و مەئلووفی خەبەرەکەی. لەوە ئەچێ نالی زیرەکـانە تێگەیشـتـبێ کـە راگـەیاندنی ئەوەی کـەرێکی هەبووە، هەر لەبنەمـادا نابێـتـە خـەبەرێکی سـەرنجڕاکـێش و سـەرسـامکەر. ئەمـەش لەبەرئەوەی وشـەی «کـەر» ناوێکی هێندە ئاشنایە و هێندە بەمـانا و وەسفی نێگەتیڤ بارگاوی بووە، کـە ئیدی هیچ تازەییەکی تیا نییـە تاکـو وەک خـەبەرێ رابگەیەنرێ، چونکە یەکێ لە خـەسـڵـەتە بنەمـایـیـەکـانی هەر خـەبەرێ بریتـیـیـە لەو تەکـانەی بەهۆی «تازەیی» و «نائاشنابوونەکـەیەوە»، دەیدات بە گـوێمـاندا. خـەبەر راگـەیاندنی رووداوێکە کـە سـەرسـاممان دەکـا و دەستـمان لەو شـتانە پێهەڵدەگرێ کە تاکو کاتی بیستنی خەبەرەکە پێیانەوە خەریکبووین.

دوای کردنەوەی دەرگـای قسـە، دەنگی ناوەوەی شیعرەکە، یاخود شاعیر، بۆ تاوێ دەوەسـتێ و رادەمـێنێ بەبێ ئەوەی خـەیاڵ و زەینی خـۆی لەژێر کـاریگەریی ئیـقـاعی گـۆکـردنی وشـەی «کـەر» رزگـار بکات، واتە هێـشـتـا

ئاوازی پیتەکانی («کاف»، «ـە» و «ر») لە گوێیدا دەزرنگێتەوە و هەر ئەم ئاوازەشە کە نالی لەو بارودۆخی وەستانە شیعرییە رزگار دەکات بەوەی کە وشەیەکی هاو مۆسیقای «کەر»ی بیر بخاتەوە کە وشەی «پەیکەر»ە!(١٥):
کەواتە هاوسەنگییەکە بەمجۆرە دەستەبەر دەبێ:

## هەی کەرێکم بوو، چ پەیکەر؟

لەم کارەشدا نالی پەیڕەوی لە «نیمچەڕێسا»یەکی زمان دەکات، کە مرۆڤەکان لە ڕێگەیەوە هەم مانایەک بەیاندەکەن و هەم بێمانابییەکیش. لەزمانی کوردیدا دەڵێین: (تەختە) و (مەختە)، (ئافرەت) و (مافرەت)، (حەج) و (مەج)، (پوور) و (موور)، (برا) و (مرا)، (سەرکردە) و (مەرکردە)، (حیزب) و (میزب)، (سەقافەت) و (مەقافەت)، (نووسەر) و (مووسەر) و بەوجۆرە.. وەکو دەبینین لەبەشی یەکەمی هەریەکێ لەم دەربڕینانەدا مانایەکی تەواو هەیە و لە بەشی دووەمیشدا کەمکردنەوەی مانا. هەموو ئەم دەربڕینانەش بەیانکەری حاڵەتێکی دەروونیی مرۆڤن بۆ ئاسانکاریی گفتوگۆ و ئاخاوتن لە فەزایەکی کۆمەڵایەتیی تایبەتدا. وەک ئەوەیە نالیش خۆی لە فەزایەکی ئەوتۆدا بینیبێتەوە کە ئیشتیاقی ئەو بۆ گەیاندنی خەبەرەکەی دەیخاتە سەر ڕێگای چوونە سەر ئەو «نیمچە ڕێسایە». بەڵام بەبێ ئەوەی بەشی دووەمی دەربڕینەکەی کەمکردنەوەی مانا بێت، بەڵکو پڕکردنەوەی مانای دەربڕینی یەکەمە. پڕکردنەوەی مانای وشەی «کەر»ە بە مانای «پەیکەر».

لەگەڵ ئەوەشدا ئاشکرایە نالی بەزمانی شیعر دەدوێ، شیعریش وەزیفەی دیکە بە زمان و وشەکان دەبەخشێ و تەنانەت شاعیر دەخاتە ناو داوی زمان و دەلالەتە هەمە چەشنەکانییەوە. نالی پاش ئەوەی بە راگەیاندنی خەبەرەکەی بێدەنگییەکی دروستکرد و بۆی ئاشکرابوو کە ئەو خەبەرە بەتەنیا ناتوانێ ئێمە وەکو گوێگر لە بێدەنگیدا بهێڵێتەوە، هەروەها تەماعی خۆیشی بۆ بەردەوامیی لە قسەکردندا، دەبوو خەسڵەتێکی نا مەئلووف و

چاوەڕواننەکراو بە کەرەکەی ببەخشێ، کە ئەویش «بەپەیکەرکردنیەتی» و لەم ڕێگەیەشەوە هەم خۆی بەرپرسیارکرد کە بەردەوامبێ لە وەسفکردنی ئەو کەرە پەیکەر ئاسایەدا، هەم ئێمەشی ناچارکرد لە چاوەڕوانیدا بمێنینەوە و بەردەوامبین لە گوێگرتن و خوێندنەوەی دەقەکەی.

بەم جۆرەش نیوەی یەکەمی بەیتی یەکەم دەبێتە کلیلی تێگەیشتن لەسەرجەمی شیعرەکە. لێرەدایە، کە نالی دەیەوێ بڵێت ئەو کەرەی ئەو هەیبووە کەرێکی ئاسایی نەبووە و بۆ سەلماندنی ئەمەشە داوامان لێدەکات بۆ وێناندنی ئەو کەرە، بیر لە «پەیکەر» بکەینەوە. بەمجۆرەش بۆ ساتەوەختێک و دیسانەوە لە ژێر کاریگەریی ئەو خرۆشە شیعرییەدا کە شاعیری هانداوە بۆ قسەکردن، نالی دژایەتییەک لە نێوان مانای وشەی «کەر» و «پەیکەر» دا دەهێنێتە دی: هەرچی وشەی «کەر»ە ئاماژەیە بۆ گیاندارێکی چوارپێ کە لە سروشتدا دەژی و خاوەنی گەلێ خەسڵەتی تایبەت بەخۆیەتی و لەهەمووشیان گرنگتر ئەوەیە دەجووڵێ. فۆرمی خۆی بەپێی حاڵەتە جیاوازەکان دەگۆڕێ و وزەی جەستەیی خۆشی تواناى ئەم جموجووڵەی بۆ دابین دەکات. لە کاتێکدا وشەی «پەیکەر» ناوە بۆ بەرهەمێکی کولتووریی کە دروستکراوی دەستی مرۆڤە و ئاوێنەی پلەیەکی جوانناسیی ئەو مرۆڤەیە و خودی پەیکەرەکەش توانایەکی نییە بیجووڵێنێ و فۆرمی خۆی جێگیرە و ناگۆڕێت مەگەر بە گواستنەوەی لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی دیکە. بۆیە لێرەوە تێدەگەین کە پێچواندنی «کەر» بە «پەیکەر» ناشێت هیچ بەڵگەیەکی هەبێت جگە لەوەی شاعیرەکەمان دەکەوێتە ناو تۆڕێکی زمانەوە، کە ناچاری دەکات لە ژێر کاریگەریی ئاوازی وشەی یەکەمدا، وشەی دووەمیش بدرکێنێ، بەبێ ئەوەی حسابی بۆ دژایەتیی مانای ئەم دوو وشەیە کردبێ.

بەڵگەیەکی دیکەی ئەم ڕاڤەکردنەم لە نیوەی دووەمی هەمان بەیتی یەکەمەوە دەهێنمە دەست کە تیایدا نالی لە ئاستی مانادا دەگەڕێتەوە بۆ وەسفی کەرێکی تایبەت نەک پەیکەر. واتە دەکەوێتە ژماردنی خەسڵەتی

ئەو گیاندارەی کە «طەی کەری هەوراز و لێژە، سینە پانە، مووچە کورتە، شانە بەرزە» و دواجاریش «گوێدرێژە»:

هەی کەرێکم بوو، چ پەیکەر؟ طەی کەری هەوراز و لێژ
سینە پان و، مووچە کورت و، شانە بەرز و، گوێ درێژ..

لێرەشەوە، واتە لە نیوەی دووەمی بەیتی یەکەمەوە تاکو نیوەی یەکەمی بەیتی نۆیەم و پاشان هەموو بەیتی دەیەم، نالی دەکەوێتە ناو چنینێکی زمانی وەسفی و بەراوردکارییەوە. دەکەوێتە ناو موبالەغەیەکی شیعرییەوە بە بێ ئەوەی بتوانێت لەم رێگەیەوە «نائاساییبوونی کەرەکەی» بسەلمێنێ و کرۆکی ئەو راستییەمان پێ بڵێت کە لەبەیانکردنی دەنگی «هەی» نیوە بەیتی یەکەمدا مژدەی پێ دابووین. ئەوەی نالی لە بەشێکی زۆری ئەم دەقەدا دەیکات، بریتییە لە وەسفکردنێکی لە رادەبەدەری «کەرە شیعرییەکەی» بەجۆرێ کە ئێمە نەتوانین لە بەشێکی زۆری ئەو وەسفانەدا کەری راستەقینە، کەرە بەرەڵڵا و بە ئەڵغام قاچپەڕیو و برینداربووەکانی ناو واقیعی خۆمان بناسینەوە.

نالی لەناو ئەو بازنەی وەسف و پیاهەڵدانەدا کە بەپشتیوانیی هونەرەکانی بەلاغە و تەکنیکی شیعری کلاسیکی بۆی مەیسەر دەبێ و (هەندێ کەس ئەمە بەراورد دەکەن بە وەسفی ئەو بۆ خۆشەویستەکەی خۆی و دواجار دێمەوە سەر ئەم لایەنەش)، بەردەوام درکاندنی «خەبەرە بنەڕەتییەکە» دوادەخات و خۆی لەناو پانتاییەکی زماندا گیرۆدە دەکات، کە هیچ پرسیارێکی گرنگ و مانایەکی قووڵ بەرهەم ناهێنێ و بگرە لەناو خۆدووبارەکردنەوەدا گیر دەخوات. من پێم وایە هەر ئەمەشە وادەکات زمان نەتوانێت هەستێ بە ئەرکە هەرە سەرەکییەکەی خۆی کە شکاندنی وێنای ئێمەیە بۆ ژیان و دووبارە سازدانەوەیەتی لە شیعردا. بۆیە ناهەقی ناکەم گەر بڵێم، نالی لە بەشێکی زۆری ئەم دەقەیدا، بەپێچەوانەی زۆربەی دەقەکانی

دیکەیەوە، زمان نەک وەکو ئیمکانێ دەبینێ بۆ تەقاندنەوەی مانا و لێرەشەوە زمان دەکاتە ئامانج بۆ بەرجەستەبوونی جیهانە شیعرییەکەی، بەڵکو لێرەدا زمـان دەکـاتە هۆکـارێکی مـەسـرەفکردن بەبێ ئەوەی تواناى بداتێ بۆ بەرهەمهێنانی مانای دیکە و بۆ ئاشکراکردنی نادیارەکان.

وەلێ مـادام شـیـعـر لە بنەمـادا تێکشـکاندنی وێنای ئێـمـەیە بۆ ژیان و شتەکان و پەیوەندییەکان و سروشت و گیاندارەکان و دروستکردنی دنیایەکی دیکەیە لەناو دەقدا، کە تیایدا هەموو شتێ جیاوازە، ئەوە ناکرێ ئەم کارەی نالی تەنیا ئامانجی ئەوەبێت کە وەسفی کەرێکمان بۆ بکات. چونکە ئێمە دەزانین لەبەردەم شاعیرێکداین کە خاوەنی جیهانبینی و سیستەمێکی گوتاری و لێخوردبوونەوەیە لەژیان و گەردوون و مرۆڤ. لەبەرئەوە ناشێت کارکردی زمان لەناو ئەم شیعرەدا تەنیا لە سەر ئاستی وەسفەکانی نالی بۆ کەرێکی تایبەت بچووکبکەینەوە. ناکرێت مانای سەرجەمی شیعرەکە لەبەر رۆشنایی رەهەندی گیانەوەردۆستی لە بیری نالیدا لێکبدەینەوە، بەڵکو پێویستە لە خەسڵەتەکانی جیهانبینیی نالییەوە بگەڕێینەوە بۆ مانا ئیحتیمالییەکانی ناو ئەم دەقە.

یەکێک لەو رێگایانەی من لێرەدا بۆ ئەو مەبەستە دەیگرمە بەر، بریتییە لە دۆزینەوەی شادێڕەکانی مانای دەقەکە و خستنەڕووی بوارێکی دیکەی خوێندنەوەی ئەم شیعرە بەوجۆرەی بتوانێ بیسەلمێنێ، کە نالی هەر تەنیا شـاعـیرێ نەبووە لەکـاتی دەسـتـبـەتاڵیـدا پەنای بۆ کـێش و قـافـیـە و خۆتاقیکردنەوە لەبواری رەوانبێـژیدا بردبێ، بەڵکو پێش هەمـوو شتێ ئەو مرۆڤێ بووە بە روئیا و جیهانبینییەکەوە رووبەڕووی جیهان و دیاردەکانی ناوی بۆتەوە. بەمانایەکی دیکە، ئێمە لەبەردەم شاعیرێکداین کە لە جیهان و مرۆڤ و گەردوون رادەمێنێ و پرسیار دەکات و دواجار لە رێگەی نووسینەوە ماتەریالیـەتێک بە جیهانبینی و بیرۆکە و پرسیارەکانی دەبەخشێت. بەڵام مەرج نییە لە کۆی ئەو تێکستانەی بەرهەمیان دەهێنێ ئەو جیهانبینییە هەمان ئاستی جوانکاری و پلەی مەعریفی و رۆچوونی قووڵ وەربگرێ، بۆیە

کاتێک ڕووبەڕووی دەقێکی دەبینەوە کە ناتوانێت لەو ئاستانەدا تینوێتیمان بشکێنێ، ئەوە ڕێگەی چارەسەر ئەوە نییە کە بەدگومان بین لەئاست سەرجەمی ئەو جیهانبینییەدا. بەڵکو گرنگ ئەوەیە لە ڕێگەی ئاشنابوونمانەوە بە خەسڵەتەکانی کۆی جیهانبینیی ئەو شاعیرە، لەڕێگەی قەرزکردنی ڕووناکییەوە لەو دەقانەی دیکەی شاعیر، کە بونیادی ئەو جیهانبینییەیان لەسەر وەستاوە، بتوانین تیشک بخەینە سەر ئەو شادێڕانەی کە دەشێت لەناو چەندین دێڕی ساکار و وەسفئامێزدا بیاندۆزینەوە کە زمانیان هێناوەتە سەر ئاستی بەکاربردنێکی ئامرازگەرایانە.

دۆزینەوەی ئەو شادێڕانە لەهەمان کاتدا کە پرۆسەیەکی ڕەخنەییە، ئاواش پرۆسەیەکە پێویستە تەی بکرێت بۆ دۆزینەوەی قوڵاییەکانی شاعیر لەناو پانتاییە چاوەڕواننەکراوەکاندا و ئاشکراکردنی ئەو گەوهەرەی کە شاعیر لە ریزی خشڵە ئاسایی و لە مس و فافۆن دروستکراوەکاندا دایناون. بەڕاستی دەشکرێ ئابڕووی سەرجەمی دەقێکی لاواز لەناو یەک دێڕی هەمان دەقدا بکڕینەوە.

لەم ڕوانگەیەوە ئەم دەقە بەهای خۆی سەبارەت بە جیهانبینیی شیعریی نالی و گرنگییەکەی لە بەرهەمهێنانی جیهانبینییەکی ئەوتۆدا، لە نیوەی بەیتی یەکەم و نیوەی بەیتی نۆیەم و سەرجەمی بەیتی یازدەهەمدا چەسپاندووە و من پێموایە بۆ تێگەیشتن لە ئاستە قووڵەکانی مانای ئەم دەقە پێویستە لەو دوو نیوە بەیتە و لە بەیتی کۆتایی ورد ببینەوە، کە لەهەمان کاتدا یەکێتییەکی ماناییش پێکدەهێنن بەبێئەوەی هەست بە چاوپۆشیکردن لەئاست دێڕەکانی دیکەدا بکەین. با ئەو دوو نیوە بەیتە و بەیتی کۆتایی بنووسینەوە و پاشان بەجیا و لە پەیوەندییان پێکەوە ڕاڤەیان بکەین:

**نیوەبەیتی یەکەم:**

{هەی کەرێکم بوو، چ پەیکەر؟}

**نیوەبەیتی نۆیەم:**

{عاقڵێ بوو ناوی کەر بوو،}

**بەیتی یازدەهەم:**

{چـــەندە پێم خـــۆش بو زووبانی حاڵی دەیوت «نالیا»
هەردو حەیوانین، ئەتۆ گوێ کورت و ئەمنیش گوێ درێژ.}

## هەی کەرێکم بوو، چ پەیکەر؟

لەم نیـوە بەیـتـەدا نالی نەک هەر بانگەوازی ئەوەمـان دەدات بەگـوێدا کـە خـاوەنی کـەرێـک بووە، بەڵکو نرخ و جـوانیی کـەرەکـەشی بە ئـامـاژەکـردن بۆ «پەیکەر» وەک قـیـاسـێک، دەسـتنیـشـان دەکـات. واتە مـەسـەلەکـە هەر بە بێگـیـانکردنی گـیـاندارێـک، یاخـود بە پەیکەرکـردنی ئاژەڵێـک دوایی نایە، بەڵـکو هەنگاوی یەکـەمـیش دەنێت بۆ بەرزکـردنەوەی ئاژەڵیش بۆ ئاسـتی مرۆڤ و ئەمەش لە چەند ئاستێکدا دەردەکەوێ.

**یەکەم:** پێش هەموو شتێ پێچوواندنـی کەرەکەی بە پەیکەر، گـواستنەوەی بووێکە لە دۆخی سروشتییەوە بۆ دۆخی کولتووری، ئەمەش لەبەر ئەوەی کەر وەک ئاژەڵێـک گـیـاندارێکە لەناو سـروشـتـدا، بەڵام کـاتێ کـەر دێـتـە ناو شـیـعـرەوە و رەگـەزی «ریـوایەت» دەبێـتـە هێـزی بەرجـەسـتـەکـردنەوەی ئەو گـیـانداره لەناو زمـاندا، ئەوە رێخـۆشکەرییـەکـیش دەکـرێ تاکـو دۆخی سروشـتیی ئەو ئاژەڵە ببێـتە دۆخـێکی کولتـووری کە ئەمـەش لەناو زمـان و پاشـان لە زاراوەی «پەیکەر»دا بەرجـەسـتـە دەبێت، چونکە ئێـمـە دەزانین چ پەیکەرسازی و چ «نووسین» دوو ئاستی پێشکەوتنی کولتووریی مرۆڤمان بۆ دەسەلمێنن.

**دووەم:** کاتێک نالی ئەم دۆخە لەسروشتەوە دەگوازێتەوە بۆ کولتوور، لە

کـــــەرەوە بۆ پەیکەر، ئەوە هەنگاویکیش دەنێت بۆ پێـــچـــواندن و نزیکخستنەوەی کەرە پەیکەرئاساکەی لە مرۆڤ، وەلێ دیسانەوە مرۆڤێکی بە کولتوورکراو کە پەیکەرە و پەیکەر دروستکردنیش دەلالاتی تایبەتیی خۆی هەیە کە بەلای منەوە دوانیان زۆر گرنگن: لە رووی ئایینییەوە پەیکەر هەم دابەزاندن و لاساییکردنەوەی سیمای وێناکراوی خواوەندەکانە لەسەر شێوەی مرۆڤ و بەرجەستەکردنەوەیانە لەسەر سیمای ئینسان، وەک ئەوەی لە مێژووی پەیکەرسازیی ئایینەکان و دواجار لە کولتووری رازاندنەوەی شاری یۆنانی و رۆمـــانیـــدا دەبیـــنین. پاشـــان لە رووی مـــێـــژووییـــەوە، پەیکەردروستکردن بۆ مـرۆڤ بریتییـە لە هەوڵدانێک بۆ گـرەو بردنەوە لە زەمەن، بەوەی مرۆڤە پەیکەربۆکراوەکە لەودیو سنوورەکانی زەمەنەوە، لەودیو تێپەڕینی ساڵ و سەدەکانەوە بەنەمریی بهێڵینەوە.

کەواتە ئێستا دەتوانین بڵێین، نالی بەم پێچواندنە زیرەکانەیە و لەرێگەی پرۆسەی گـواسـتنەوە لە دۆخی سروشـتییـەوە بۆ دۆخی کـولتووریی، چەند ئامانجێکی جێبەجێکردووە: یەکەم فۆرمێکی زمانیی تایبەت، واتە زمانی شیعر، بە کەر دەبەخشێت و ئەمەش دانپیانانێکی زیاترە بە بوونی کەر لە ناو ئەدەبدا، وەک ئاژەڵێکی بەکەم سەیرکراو لە کۆمەڵگادا، چونکە کەر دەکاتە کائینێک لەناو زماندا. دووەم: لە رێگەی نزیکخستنەوەی فۆرمی «کەر» لە فۆرمی «پەیکەر»ەوە، فۆرمی مرۆڤیشی پێدەبەخشێت و دەیکاتە هاوشانی ئەمەی دواییان. دواجار بەوەی نالی کەر وەک پەیکەر دەخاتە ڕوو، ئەوە پلەیەکی نەمربوونیشی بۆ دەستەبەر دەکات بەتایبەتی لە ئاستە کولتوورییەکەدا، چونکە وەک گوتمان لە رووی مێژووییەوە پەیکەرسازی بۆ مرۆڤ واتە نەمرکردنی ئەو مرۆڤەی کە شایانی نەمرێتییە و پێویستە لە رێگەی پەیکەرەوە بەرجەستەی بکەینەوە.

نالی لەم بەیتەدا و لە هەنگاوی یەکـەمـدا ناڵێت کـەرەکـەی ئەو لە جەوهەردا وەک مرۆڤ وایە و هاوتای مرۆڤە و شتی لەم بابەتە، چونکە گەر وای گوتبا، لە زیادەڕۆییەکی شیعری زیاتر نەدەبوو. بەڵام ئەو مەبەستێتی

بلێت و گوتووشیەتی کە لە رووی فۆرمەوە کەرەکەی لە شێوەی پەیکەردا بووە یان بەراووردی کردووە بە پەیکەر تاکو نزیکیشی بخاتەوە لە شکڵی کولتووریانەی مرۆڤ کە پەیکەرە.

بەبڕوای من هەموو ئەمانە سەرەتا و پێشەکین بۆ خۆڕزگارکردنی زیاتری شاعیر لە زمانی وەسفەکانی، کە لە بەیتەکانی دیکەدا نغرۆیان بووە، تاکو خۆی فڕێبداتە ناو باوەشی ماناوە و هێدی هێدی ئامادەمان بکا بۆ کێشە سەرەکی و کرۆکی مەبەستە شیعری و فەلسەفییەکەی و درکاندنی ئەو کەشفە شیعرییەی کە هەر لەسەرەتای بەیتی یەکەمەوە بەهۆی دەنگی «هەی»ەوە مژدەی پێدابووین.

نالی لە نیوەی بەیتی نۆیەمدا هەنگاوێکی دیکە لەو رازە نزیکمان دەخاتەوە و دەڵێت: ئەوەی پێشتر بە کەر و پەیکەر و طەی کەر و تادواییمان ناوبرد، تەنیا بە«ناو» کەرە، دەنا لە جەوهەردا عاقڵێکی خۆش سلووکترە لە سەد ئاواڵ و هاوڕێی گێژ و وێژ.

## عاقڵێ بوو ناوی کەر بوو

بەخشینی سیفەتی عەقڵ بە کەر، یان بە ئاژەڵ، جگە لەوەی سەندنەوەی بەشێ لەسەروەریی مرۆڤە کە بە تەنها کائینێکی عاقڵ ناوی رۆیشتووە، ئەوە بەرهەمهێنانی مانایەکی دژیشە بۆ چەمکی عەقڵ. چونکە پێشتر هەر عەقڵ لە پشت ناولێنانی زمانیانەی «کەر»ەوە ئامادەیە و ئەوە عەقڵە کە میکانیزمەکانی ئیشکردنی زمان دەبات بەڕێوە و وادەکات کە ئێمە لەناو زمانی کوردیدا بە گۆکردنی پێکەوەیی پیتەکانی (کاف و هاء و را) ئاژەڵێکی تایبەتیمان بیر بکەوێتەوە. نالی لێرەدا عەقڵی یەکەم کە ناوی «کەر»ی بەم ئاژەڵە بەخشیوە دەخاتە ژێر پرسیارەوە و سەر لەنوێ ئەم ئاژەڵە بەهۆی عەقڵێکی ترەوە، یان ئاستێکی دیکەی عەقڵەوە ناودەنێتەوە و دەیکاتە عاقڵ و ناوی «کەر» لە جەوهەرەکەی جیا دەکاتەوە و دەڵێت ئەم ئاژەڵە لەجەوهەردا عاقڵێکە و تەنیا بەناویا «کەر»ە. لێرەشدا ئاشکرایە

نالی «ناو» ناکاتە پارسەنگ بۆ ناسینەوەی شتەکان و بۆ دەستنیشانکردنی شوێنی بووەکان لە دنیادا. هەروەکو چۆن لە بەیتی حەوتەمیشدا دەڵێ:

گوێ درێژیٚ بار و کورتان بەرز و، پالانی بەزین
چوست و وریاتر لە گوێ کورتانی پالانی و گێژ

ئامادەیە جەوهەری مرۆڤ، کە کائینێکی گوێ کورتە، بە«گێژ و وێژ» پێناسە بکات، ئاواش لە نیوەی یەکەمی بەیتی نۆیەمدا بە راشکاوی ئامادەیە جەوهەری گوێدرێژ بە جەوهەرێکی عاقڵ ناو ببات و لەهەموو مانا پێشینەکانی بەتالّی بکاتەوە. لە راستیشدا نالی بەمکارەی دەکەوێتە ناکۆکییەوە لەگەڵ ئەو ریوایەتەی ئایینە تاکخوداکانی وەک یەهودییەت و مەسیحییەت و ئیسلام، کە دەڵێت: یەزدان لە شێوەی خۆیدا مرۆڤی خەڵقکرد و داوای لە حەزرەتی ئادەم کرد تاکو ناو لە گیاندارەکان بنێت و بەمەش جەوهەریان دەستنیشان بکات و ناو ببێتە قەدەری ئاژەڵیی ئەوان و لێرەشەوە سەروەریی مرۆڤ بالادەست بکات بەسەر ژیانی ئەوانەوە. هەروەها نالی ئەو پەیمانە هاوبەشەی ناو زمانێکی دیاریکراویش، لێرەدا زمانی کوردی، دەخاتە ژێر پرسیارەوە کە لەسەردەمێک لەسەردەمەکاندا هەستاوە بە دانانی سێ نیشانە (ک، ە، ر) بۆ ئاماژەکردن بە گیانەوەرێکی تایبەت کە دەشیا هەرناوێکی دیکەی لێبنرایە.

بەلام هەروەکو بینیمان ئەمانە هەمووی پێشەکییەکن بۆ ئامادەکردنی ئێمە و گوێگرەکانی ئەوسای شاعیر تا بتوانین خۆمان لەبەردەم ئەو تەکانە شیعری و کەشفی حەقیقەتەدا رابگرین، کە نالی پێی گەیشتووە و دەیەوێت لە رێگەی ئەم شیعرەوە بەئێمەشی رابگەیەنێ و ناچارمان بکات پرسیار لەئاست بوونی ئینسانییانەی خۆماندا بکەین و بەسەرجەمی ئەو ناسنامەیەدا بچینەوە کە تا ئێستا بۆخۆمانمان پێکهێنابوو، شانازیمان پێوە دەکرد و پێمانوایە هەرگیز گۆڕانی تێدا روونادات. وەک ئەوەی نالی بیەوێت بەم

شیعرەی ئەو پێناسە ئەرستۆییە بۆ شیعر بسەلمێنێ کە دەڵێت: شیعر باسکردنی ئەو ڕووداوانەیە کە دەشێت ڕوو بدەن.

ئێمە بینیمان، سەرەتا نالی کەری لە واقیعەوە گواستەوە ناو تێکست. بەمەش کەمێ ئیعتباری بۆ ئەو ئاژەڵە گێڕایەوە بەوەی کە کردییە ماددەیەکی ناو زمانێکی تایبەت کە زمانی شیعرییە. پاشان بەراوردی کرد بە پەیکەر، کە بەرهەمێکی کولتوورییە و ڕەنگدانەوەی ئاستێکی بەرزی هەستی جوانناسیی مرۆڤە لە ڕووبەڕووبوونەوەی لەگەڵ دنیادا و لە هەوڵدانیدا بۆ نەمرکردنی سیما و فۆرمی خۆی و خواوەندەکانی. بەمکارەیشی ویستی کەر بهێنێتە ریزی مرۆڤەوە. پاشان نالی هەستا سیفەتی «عاقڵ»ی بە کەر بەخشی و بەمەش خۆی خستە بەردەم ڕەتکردنەوەی دوو سیستەمی ناولێنان کە یەکێکیان ئایینی و ئەویدیکەیان کۆمەڵایەتی بوو.

ئەوەی نالی لە دوایین بەیتی شیعرەکەیدا دەیکات هەم درێژەپێدەری ئەو هەنگاوانەیە و هەم ڕاگەیاندنی ئەو مژدەیەشە کە لە ڕێگەی کەشفەکەیەوە بۆی ئاشکرا بووە. نالی دوای ئەوەی لە نیوە بەیتی نۆهەمدا سیفەتی «عاقڵ»ی بە کەرەکەی بەخشی، ئێستا لە بەیتی یازدەهەمدا «زمان»یشی پێدەبەخشێت بەو پێیەی زمان ئاوێنەی عەقڵ و لەهەمان کاتیشدا ناسێنەری عەقڵە. کەواتە کەرەکەی نالی نەک هەر کائینێکی عاقڵە، بەڵکو قسەکەریشە و بە زمانێکی حاڵی و ڕەوانیش دێتەئاخاوتن:

چەندە پێم خۆش بو زوبانی حاڵی دەیوت «نالیا»
هەردو حەیوانین، ئەتۆ گوێ کورت و ئەمنیش گوێ درێژ

مانایەکی دیکەی ئەم دێڕە شیعرە ئەوەیە کە دەڵێت: جیاوازیی نێوان حەیوان و ئینسان جیاوازی نییە لە نێوان عەقڵ و نا عەقڵ و لە نێوان زمان و بێزمانیدا. واتە جیاوازی نییە لە جەوهەردا، بەڵکو جیاوازیی ئێمە لە فۆرم و شێوەدایە. جیاوازییە لەئاستی ئەو سیستەمە کۆمەڵایەتییەدا کە

یەکێکمانی لەسەر ئاستی شێوەیەوە بە «گوێدرێژ» ناوبردووە و ئەوی دیکەشمانی هەر لەسەر هەمان ئاستەوە بە «گوێ کورت» ناوناوە. نالی لێرەوە دەگاتە پێناسەیەکی جەوهەری بۆ حەقیقەتی بوونی خۆی کە هیچ جیای ناکاتەوە لە حەقیقەتی بوونی کائینەکانی دیکە، تەنانەت بێزراوترینیشیان لەلایەن عەقڵەوە، کە «کەر»ە! بۆیە نالی دڵی خۆشە و سادەترە لە هەر کاتێ، چونکە چیدی خۆی (بەپێی حاڵەتە شیعرییەکەی) وەک سەروەرێک بەسەر شتەکان و بووەکانی ناو جیهانەوە نابینێت، بەڵکو خۆی لەناو شتەکان و لە کەنار بووەکانی دیکەدا دەبینێت و گوێناداتە ئەو گوتارە ئایینی و ئایدیۆلۆژی و فەلسەفییانەی کە بوونی ئینسان دەکەنە سەنتەر و بوونی کائینەکانی تریش بە بوونێکی پەراوێزی و کەم بایەخ تەماشا دەکەن.

لێرەوە نالی جیهانبینییەکی پێچەوانەی جیهانبینیی «دیکارت»ی بەرهەمدەهێنێ کە تیایدا ئاگایی و بیرکردنەوەی مرۆڤ دەبێتە سەنگی مەحەک بۆ بوون و بۆ بەسەنتەرکردنی ئینسان لە گەردووندا: «من بیردەکەمەوە، کەوابێ هەم».

نالی هەر لەسەرەتاوە بە پێچەوانەی دیکارتەوە بیردەکاتەوە: ئەو لە رێگەی بە پەیکەرکردنی کەرەوە هەوڵی بە ئینسانکردنی حەیوان دەدات و پاشان لە رێگەی بە حەیوانکردنی مرۆڤ و پێبەخشینی عەقڵ و زمانەوە بە کەر، حەیوان دەکاتە خاوەنی خودێتی و سۆبژێکت، چونکە ئەو کەرەی کە بە زمانێکی روون و ئاشکرا بە شاعیر دەڵێت: «نالیا: هەردوو حەیوانین..» کەرێکە خاوەنی سۆبژێکتی خۆیەتی، کەرێکە بیر دەکاتەوە و ئەو راستییەش کە بە نالیی ئینسانی دەڵێت، ئەنجامی ئەو بیرکردنەوەیەیە. نالی لەوەدا لە دیکارت جیا دەبێتەوە کە وەک دیکارت حەقیقەتی بوونی خۆی لە ئەنجامی بیرکردنەوە و ئاگایی خۆیەوە ناهێنێتە دەست، بەڵکو لە رێگەی بینینی ئەویتر و لە زمان ئەویترەوە بەو حەقیقەتە دەگات، کە ئەویش بوونی حەیوانییانەی خۆیەتی. هەروەها لێرەدا نالی جارێکی دیکە جیاوازیی نێوان مرۆڤ و ئاژەڵ دەباتەوە سەر فۆرم نەک سەر جەوهەر، واتە ئەوان لە جەوهەردا

هەمان شتن وەلێ لە شێوەدا یەکێکیان گوێ کورتە و ئەویدیکەیان گوێدرێژە.

** ** **

بیری شاعیرانەی نالی بیرێکی یەکسانخوازە نەک جوداخواز، بیرێکە لەسەر بنەمای خۆ بەیەکسان تەماشاکردنی مرۆڤەوە لە ئاست گیانەوەرەکان و بووەکانی تردا ئیشدەکات، نەک لەسەر خۆ بەرزکردنەوە لە ئاستیاندا. نالی دڵخۆشیی خۆی لە ئەنجامی سەروەریی خۆیەوە بەسەر کائینەکانی ترەوە بەدەست ناهێنێت، بەڵکو لەوەدا دەیبینێت کە خۆی لەبەرامبەریاندا بە یەکسانی ببینێت و لە زمان و کۆژانیان تێبگات و لەم رێگەیەشەوە زیاتر لە خودی خۆی تێبگات. نالی لە رێگەی پێچواندنی «کەر» بە «پەیکەر» و پاشان لە رێگەی عەقڵبەخشین و هێنانەزمانی حەیوانەوە «خود»ێک بە حەیوان دەبەخشێت و ئەوجا ئەو خودە بەرز دەکاتەوە بۆ پلەی ئامادەیی «ئەویتر» لەبەردەم «من»ی دەقە شیعرییەکەیدا. بەم پێیە نالی لە حەیوان «ئەویتر»ێک دروست دەکات و لەم رێگەیەشەوە بەشێک لە حەقیقەتی خۆی لە ئامادەیی و حزووری حەقیقەتی ئەویتردا دەبینێت. هەروەها شاعیرەکەمان ئامادەیی خۆی لە بەرامبەر ئامادەیی حەیوانێکی دیکەدا بە ئامادەبوونێکی نیسبی دەقەبلێنێ (چونکە «ئەویتر» مافی ئاخاوتنی هەیە و مانای خۆی هەیە لەسەر شتەکان و بەمەش مانای شاعیر دەبێتە مانایەکی نیسبی). بەمکارەیشی ئاشکرای دەکات کە جەوهەری مرۆڤ بۆ ئەو، لەم شیعرەدا، جەوهەرێکی نەگۆڕ و رەها نییە کە مرۆڤ لە فۆرم و عەقڵ و زمانەوە دەستی کەوتبێ، بەڵکو جەوهەرێکی هاوبەشە و لەگەڵ حەیوانەکانی تردا بەشیکردووە و ئەمەش نالی دڵخۆشدەکا و بە پرتاو لە حوجرەکەی وەدەردەکەوێ بۆ ناو هاوەڵ وئاشناکانی و هاواریان لێدەکات تاکو گوێی بۆ رادێرن.

بەڵام ئایا بەراستی حەیوان بیردەکاتەوە؟ کەر قسان دەکا؟ بۆچی نالی ئەم راستییە، (واتە راستیی حەیوانیبوونی خۆی) لەسەر زمانی کەرەوە

دەبیستێت؟ بۆچی نالی حەق بەخۆی دەدات نوێنەرایەتیی کائینێک بکات کە ئێمە دەزانین تاکە پەیوەندیی پێیەوە پێش هەموو شتێ پەیوەندیی ئینسانە بە ناخی خۆیەوە. چونکە ئێمە دەزانین ئەوەی قسە دەکات نە نالییە و نە حەیوانە، بەڵکو زمانە و لە زماندایە ئێمە گوێمان لە دەنگی حەیوان دەبێت و دەشزانین کە زمان، بەتایبەتی زمانی نووسین دیاردەیەکە تایبەت بە دنیای مرۆڤەکان؟ لێگەڕێن لە بەشێکی دیکەدا بۆ وەڵامی ئەم پرسیارانە بگەڕێین.

## بەشی سێیەم:

# بیرکردنەوە لـە حەیوان

بیهێنەرەوە پێشچاوی خۆت کە هەندێ نانی رەق لە تەشتێکدا و چەند توێکڵە شووتییەک لە تەشتێکی تردا بۆ مانگایەک دادەنێین و هەر زوو بۆمان دەردەکەوێ پەلاماری ئەوەی دووەمیان دەدات. بەڵام مانگاکە هەڵنابژێرێ. ئەگەر سەگێکی بەرەڵڵا لە جادەیەکی قەرەباڵغ پەڕییەوە و لەژێر تایەی سەیارەکاندا نەفلیقایەوە، بەمانای ئەوە نییە ئەو سەگە بەباشی حساب و ئیحتیاتی خۆی وەرگرتووە، ئەگەر لە چەقی جادەکەشدا، لەسەر خەتی ناوەڕاست وەستا، بەمانای ئەوە نییە دەیەوێ چاوێ بە بارودۆخەکەدا بگێڕێتەوە، چونکە سەگ بارودۆخەکان هەڵناسەنگێنێ. هەروەها ئەگەرچی تووتی رستە لەدوای رستە فێر دەبێت و لەبەر دەیانڵێتەوە، ئەمە بەمانای ئەوە نییە تووتی قسان دەکا!

پرسیاری سەرەکی ئەوەیە: ئێمە چۆن دەزانین کە ئەم ئاژەڵ و باڵندانە لەنێوان شتێک و یەکێکی تردا هەڵنابژێرن، چۆن دەزانین ئەوان حسابی بارودۆخەکان ناکەن و چۆنیش دەزانین کە قسان ناکەن و بیرناکەنەوە؟ رەفتاری مانگاکە لەبەردەم نانەڕەق و توێکڵەشووتییەکاندا لە هەڵبژاردنێک دەچێت، وەستانی سەگەکە لە پیاچوونەوە و هەڵسەنگاندنێکی بارودۆخەکە دەچێت و ئایا مەگەر قسەکانی تووتییش لە وشە و رستەی مانادار پێکنەهاتوون؟

راستییەکەی ئەوەیە ئێمەی مرۆڤ هەردەم لە خودی خۆمانەوە لە بوونەوەرەکانی دیکە تێدەگەین، ئێمە خۆمان لە سیما و رەفتاریاندا دەبینینەوە، بەتایبەتیش لە سیما و رەفتاری ئەوانەیاندا کە دەستەمۆمان

کردوون، چونکە باش دەیانناسین و لێمانەوە نزیکن. ئەگەرچی چارلز داروین (١٨٠٩-١٨٨٢) لەکۆتایی سەدەی رابردوودا بڕوای وابوو کە حەیوانەکان لە رێگەی دەنگیانەوە تەعبیر لە هەستەکانیان دەکەن(١٦). بەکورتی: مرۆڤ توانا و میزاج و سیفاتەکانی خۆی دەگوێزێتەوە بۆ سەر رەفتاری حەیواناتەکانی تر، بەتایبەتی کاتێ بە «تووڕە»، «شادمان» و «بێزار» وەسفیان دەکات. هەروەها جاری واهەیە خۆشمان لە سیمای گژوگیا و رووەکەکانی تریشدا دەناسینەوە، بەتایبەتی کاتێ دەبینین لە گەرمەی نەشونمادا وشک هەڵدێن و ئەمەش بەوە لێکدەدەینەوە کە باش خزمەت نەکراون، نازیان نەکێشراوە و ئاگامان لێیان نەبووە. ئیدی لێرەوە ئاسانە لەناو گۆرانی و شیعرەکاندا و لەدوای نائومێدبوونمان لە عەشق و پەیوەندییەکان، خۆمان بە «گوڵی ژاکاو» «لاولای سیسبوو»، «خونچەی نەپشکووتوو»، «گوڵی بەجێماو»، «پووشی زەردهەڵگەڕاو»، «پەڕی دەم با»، «لقی شکاو»، «درەختی تەنیا»، «دارستانی خەم» و دەیان دیمەنی دیکە بچوێنین.

هەرچۆنێ بێت، ئێمە لە تێگەیشتنی خۆمان لە ئاژەڵە ماڵی و رووەکەکان دڵنیاین و دەزانین کە ئەوانە بەجۆرێک لە جۆرەکان بیردەکەنەوە و هەستدەکەن و دڵخۆش و دەردەدار دەبن، بەڵام ئەی بۆچی هەمان دڵنیایی لەئاست پڵنگ و بەرازەکێوییەکاندا، لە ئاست ورچ و گورگەکاندا، لە ئاست مار و کرمەکاندا هەست پێناکەین؟ رێک ئا لێرەدایە کە دەردەکەوێ تێگەیشتنی مرۆڤ لە حەیوانات و سروشت هەمیشە تێگەیشتنێکی بەرژەوەندخوازانە و سنووردارە و مەبەستێکی تایبەتی لە دواوەیە: هەموو لە خەمی فەوتانی ئاسکەکان، «ئەو رەگەزە دەگمەنە»دان، کەچی دەبێت کەو و پۆڕ و ماسییەکان ساڵانە راوبکرێن و شەوانە لە قەسسابخانەکانی شاردا، کاتێ هاوولاتییان لەخەودان، بە دەیان حەیوان بەتەور لەسەریان بدرێت تاکو بۆ سبەی بێگۆشت نەبین!

لە دنیای خودی مرۆڤەوە ناشێت لە دنیای ئاژەڵ حاڵی ببین. حەیوانەکان

یەکتری دەخۆن و پارچەپارچە دەکەن بەبێ ئەوەی دووچاری خۆخواردنەوە ببن و ویژدانیـان بکەوێتـە عـەزابەوە و هەست بەگـوناه بکەن. حـەیوانات هیچ مۆراڵێک و قیەمێکی ئەخلاقییان نییە، هەر لەبەرئەوەش هیچ یاسایەکی ئەخلاقی و مۆراڵێک پێشێل ناکەن. ئەوان هیچ نەریت و کۆمەڵگایەکیان نییە، هەربۆیەشە هەرگیز روونادات نەوەیەک لە ئاژەڵان بەجۆرێکی جیاواز لە باوو باپیرانیان بژین. بیرکردنەوە لەوەی لەجیهانی ئاژەڵاندا ناکۆکی بکەوێتە نێوان دوو نەوەوە، نەوەیەک شـۆڕش بکا بەسـەر شـێـوازی ژیانی نەوەیەکی دیکەدا، لە کۆمیدیایەک زیاتر نابێت. بەکورتی حەیوانەکان مێژوویان نییە و هەموو ئەمەش پێماندەڵێت: کە ئاژەڵەکان ناتوانن پەیوەندییان هەبێ بەوەی کە هەیە، واتە حەیوانات ناتوانن بیر بکەنەوە.

بەڵام گەیشتن بەم راستییە زۆر یارمەتیمان نادات، کاتێ مرۆڤێک دێت و بە ئازارەوە پێماندەڵێ: «حەیوانێکی هەبووە، بیری کردۆتەوە..» ولاخدارێ پێماندەڵێ کە هێسترەکەی خۆی بینیوە «گریاوە» و دواجار لە خەرەندێوە «خۆی فرێداوەتە خوارەوە». منالێک پێماندەڵێ: جوجکەکانی پێیان وتووە دانەوێڵـەمان بۆ رۆکە» و دواجار شاعیرێکیش دێت پێماندەڵێ کە گوێی لێبووە کەرەکەی پێیگوتووە «هەردوو حەیوانین» و هیچ جیاوازیمان نییە ئەوە نەبێ تۆ گوێ کورت و منیش گوێدرێژم!

** **

هەستکردن بە هاودەردی لەگەڵ ئەو گیاندارە بەستەزمانەدا کە هەمان جەوهەری حەیوانیی ئێمەی هەیە، ئەو ئاگاییەمان لەلا دەخولقێنێ کە ناچارمان دەکا مل بۆ گەلێک شت بدەین و بۆ ساتێ بێینە سەر ئەو بڕوایەی کە: بەڵێ، دەشێت حەیوانەکان بیر بکەنەوە. ئیدی لێرەدا بەتەواوی نازانین مانای بیرکردنەوە بە دەقیقی چی دەگەیەنێ؟ ئەمەیان کێشەیەکی هێندە گەورە نییە.

ئەگەر حەیوانات بەو بیرۆکانەیان دەزانی کە لەبارەی ئەوانەوە لەسەری

ئێمەدان، تێر پێمان پێدەکەنین و لێرەشەوە دەورەکان بەتەواوی هەڵدەگەڕانەوە: چونکە پەیوەندیی مرۆڤ لەگەڵ حەیوانەکاندا بەزۆری لەسەر یەک بنچینە بەندە، کە ئەو بنچینەیەش پەنجەنومای «بەپایەدارمانەوەی سەروەرایەتیی مرۆڤ» دەکات. کاتێ راوچی بۆ تەنگکردنی ئاژەڵە گۆشتخۆرەکان و ترساندنی دڕندەکان لە پێش وەرزی راوکردندا، ئەوە دەکات کە دەیکات، بۆ ئەوە نییە تا باڵندە و ئاژەڵەکانی دیکە لەو دڕاندانە بپارێزێت، بەڵکو بۆ ئەوەیە خۆی راویان بکات. بۆ ئەوەیە خۆی جێگەی حەیوانە گۆشتخۆرەکان بگرێتەوە و لاساییان بکاتەوە. ئەو بەبێ ئەوەی بەخۆی بزانێت بەمکارەی جێگەی دڕندەکان دەگرێتەوە. فیلەکانی سێرک لەسەر دوو قاچ رادەوەستن، هێسترەکان سەما دەکەن و سەگە ئاوییەکان تۆپ تۆپێن دەکەن. بەمجۆرەش ئێمە ئاژەڵەکان ناچار دەکەین لە خۆمان بچن، چونکە ئێمە خۆمانمان لەواندا ناسیوەتەوە. راستە دەشێت ئاژەڵەکان لەو بارودۆخانەدا کە لاسایی مرۆڤ دەکەنەوە، وەڵامی «پێویستیی ئینسان» دەدەنەوە بەوەی گوێی لێبگیرێت و ملکەچیی بکرێت و ئەمەش چێژێکی پێدەبەخشێت. بەڵام پێموایە هۆی سەرەکیی هەر لەوەدا نییە کە مرۆڤ چێژ لەو ئاغایەتییەی خۆی بەسەر ئاژەڵەکانەوە دەبینێت، بەڵکو هۆی سەرەکیی کاتێ دێتە دەست کە حەیوانەکان دەگەنە سەر سنوورە کۆمیکییەکان و تەنانەت سەر ئەو سنوورانەی کە لاساییکردنەوەکەیان لە مەترسی نزیکیان دەخاتەوە. ئەوە حەزی ئێمەیە و دڵخۆشکردنی ئێمەیە بە بینینی ساتەوەختی تێکشکانی حەیوانەکان، بە سەرنەکەوتنیان لە ئەنجامدانی لاساییکردنەوەکەیاندا، کە وامان لێدەکات لەئاست رەفتارە نائاساییەکانیاندا سەرمان بسوورِمێ و بە کەوتنەخوارەوەیان لەسەر پەیژە و تەنافەکانی سێرک، بدەینە شریخەی پێکەنین و چەپڵە لێدان.

بۆچی ئاژەڵەکان لەکاتی لاساییکردنەوەی مرۆڤدا گاڵتەجارانەو پێکەنیناوی دێنە پێشچاو؟

یەکێک لەوەڵامەکان ئەوەیە کە بڵێین: ئێمە بەو ئاژەڵانە پێدەکەنین کە دەیانەوێ ببنە مرۆڤ، چونکە باش دەزانین کە هەوڵدانەکەیان مەحکوومە بە تێکشکان، دەزانین کە ئاژەڵەکان مرۆڤ نین و ئەم دوانە جیاوازییان هەیە. ئێمە بەو هێسترەی ناو سێرک پێدەکەنین کە لە وەڵامی پرسیاری «دوو و سێ» چەند دەکات، پێنج جار سەر رادەوەشێنێ. تەنانەت ئەوپەڕی بەرگریکەرەکانیش لە توانای حەیواناتەکان بۆ بیرکردنەوە، کاتێ ئەم بارودۆخە دەبینن، دەست لە بیروڕای خۆیان دەکێشنەوە بۆ ئەوەی بڵێن: هێسترەکانی سێرک قسان دەکەن و دەزانن کە سێ و دوو دەکاتە پێنج و سەر راوەشاندنەکەیان نیشانەی وەڵامی ئەوانە!

* * * *

یۆنانە کۆنەکان مرۆڤیان وەک بوونەوەرێک پێناسە دەکرد کە خاوەنی «لۆگۆس»ە، لەم حاڵەتەشدا چەمکی لۆگۆس چەندین مانای هەیە: زمان، هزر و ئاوەز و تاد. لە بنەڕەتدا وشەی لۆگۆس(logos) لە وشەی لیگۆ (lego)وە هاتووە، کە مانای وتن، بیرکردنەوە، یاخود ژماردنیش دەدات بەدەستەوە. دیارە کەس نایەوێ بڵێت حەیوانات توانای قسەکردنیان هەیە، بەڵام زۆرن ئەوانەی دەڵێن کە ئاژەڵ بیر دەکەنەوە. کێشەکە لەوەدایە قسەکردن و بیرکردنەوە هەر یەک شتن، یاخود سەر بەهەمان توانا و میکانیزمی هزرین و هەردووکیان کردەیەکی لۆگۆسین. پرسیار لەوەدایە بۆچی ئەمرۆ خەڵکانێکی زۆر هەن کە بڕوایان وایە حەیوانات توانای بیرکردنەوەیان هەیە، کەچی هەرگیز دان بە توانای هیچ ئاژەڵێکدا نانێن بۆ قسەکردن؟ ڕەنگە لەبەر ئەوەبێت کە ئەمڕۆ لایەنگیریی بۆ بیرکردنەوە زۆر بەربڵاوتر بێت لە لەلایەنگیری بۆ قسەکردن.

## بەشی چوارەم:

# کەری ناو مرۆڤ، مرۆڤی ناو کەر

سەبارەت بە پەیوەندیی ئەم شیعرەی نالیی مەزن بە دنیای ئاژەڵەوە، ناکرێت هەر وەکو لایەنگیری ئەو بۆ حەیوانێکی بەنەفرەتکراوی بێزراوی پلەنزم تەماشای بکەین، چونکە «سیحر و حیکمەت»ی شیعرەکە لە ژێر زەبری ئەم مانایەدا بەتاڵ دەبێتەوە.. شیعریش جوانیی خۆی لەوەدا بەدەست ناهێنێ کە لەسەر پانتایی نووسراو دەیلێت، هێزی بەیانکردن لە شیعردا سەرجەمی هێزی ئەو شیعرە نییە و قسەی شاعیریش هەر لەناو چوارچێوەی ئەو مانایانەدا بەند ناکرێت کە بەیانیکردوون. شیعر لۆژیکی خۆی هەیە، میکانیزمی خۆڕووتکردنەوەی خۆی هەیە و سات و زەمەنی خۆی هەیە کە جیایە لەو سات و زەمەنەی شیعرەکە وەک دەقێ بەرجەستە دەکا. نالی بۆخۆی تەواو ئاگایە بەرامبەر بەو رەهەندەی شیعر کە خۆی لە سەر پانتایی کاغەز نادات بەدەستەوە و هەمیشە پێش بەرجەستەبوونی نووسراوییانەی شیعرێک، بارودۆخێکی دیکە هەیە کە دەشێت ناوی بنێین شیعر لە ئاستی «رووداودا»، رووداویش ئەو قۆناغەی سەرهەڵدانی شیعرە کە بۆ شاعیران خۆشیان روون نییە (١٧)

لەسەرەتای دیوانی نالیدا بەیتێک هەیە کە ئەو بێتواناییەی شاعیر لە ئاست بەیانکردنی ساتی رووداوی شیعریدا دەردەخات و نالی دەڵێت: ئەوە حیکمەتی شیعرە ناهێڵێت رووداو بەیان بکرێ و بەرجەستە بکرێ. حیکمەتی شیعر خۆی رێگرە لە بەردەم بەرجەستەکردنی رووداوە شیعرییەکەدا، هەروەکو چۆن بۆ دروستکردنی ژیانێک پێویستمان بە دڵێکی بەهێز هەیە، واتە بێهێزیی دڵ وەک سەرچاوەیەک بۆ پایەدارکردنی ژیان،

خۆی لە خۆیدا ڕێگرە لەبەردەم ئامادەکردنی ئەو هێزەدا کە ژیان دروستدەکا، یان «ئینشای دەکا»:

«نالی» نییەتی سیحری بەیان، حیکمەتی شیعرە
ئەمما نییەتی قـــــووەتی دڵ، قودرەتی ئینـــــشا

من هەرگیز نامەوێ مانای شیعرەکەی نالی لە «هەستی بەرزی ئەودا بۆ دڵسووتان بە گیانەوەران» (وەک ماموستایانی مودەریس لە لێکدانەوەکەیاندا، لاپەڕە: ٢٢٨- ٢٢٩ی دیوانی نالیدا، دەفەرموون) قەتیس بکەم، چونکە بێگومانم لە هەبوونی ئەو هەستە بەرزە لەلای شاعیرەکەمان، بەڵام ئەوەی سەرنجم رادەکێشێ هەستی دڵسووتانی شاعیریشە بە لاوازیی مرۆڤ کە هەمیشە وادەزانێت «سەروەری گیاندارەکانە» و نالی لێرەدا ئەو سەروەرییە دەخاتە ژێر پرسیارەوە.
بەلایەکی دیکەدا، ئەوەی نالی دەیەوێ لە زمان کەرەکەیەوە بیڵێ، لە راستیدا خۆزگە و تەمەنناى خۆیەتی بۆ هێنانەکایەی هەستێکی ئینسانیی «گونجاو»، نەک «ئینسانییەتێکی سەروەر». چونکە ئەوەی نالی لە زمان کەرەکەیەوە دەیڵێت، نەک هەر حەقیقەتی جیهانی ئاژەڵ نییە، بەڵکو تەمەننای نالی و خۆزگەیەتی بۆ بەدەنگهاتنی ئاژەڵ لە ئاست دنیای مرۆڤدا. نالی لە خۆیەوە، لەناخی خۆیەوە دەڕوانێتە حەیوان و رەنگە بیەوێت بە مرۆڤ بڵێت، تەنانەت کەریش لەجەوهەری حەیوانیانەیدا وەک خۆت وەهایە، ئیدی چ پێویست دەکات تۆ لافی خۆ بەگەورەزانی و فیز بەسەر کائینەکاندا لێبدەیت بەناوی عەقڵەوە لەکاتێکدا عەقڵ ناتوانێ سنوور بۆ دڕندەییەکانت دابنێ؟ من پێموایە ئەمە ساتەوەختی تووڕەیی شاعیرێکی هەست ناسکە لەئاست دنیایەکدا کە مرۆڤەکانی لە ژیانێکی تەبا نامۆ بوون و فۆرمی ئینسانییان چیدی پاساوی ئینسانییەتیان ناداتەوە (هەروەکو چۆن دەشێت ئەمە ساتی تووڕەیی ئێمەش بێت لە ئینسانییەتی خۆمان کە ناچارمان دەکا

ئەم تەئویلە بۆ دەقەکەی نالی بکەین). ستراتیژیی نالی لەم شیعرەدا، دابڕ نییە لە کۆی ستراتیژیی جیهانبینیی نالی لە تێڕوانینیا بۆ مرۆڤ و لە رەخنەگرتنیا لە ریاکاری و سۆفیگەرایی و چاوبەستکردن و درۆکردن و دوو روویی. نالی وەک ژیاندۆستێک، وەک مرۆڤدۆستێکی رەخنەگر، چاو لەو هێزە شەڕانییانەی ناخی ئینسان ناپۆشێت کە مرۆڤایەتیی مرۆڤ پێشێل دەکەن. ئەو لەیەک کاتدا جوانییەکانی ژیان و مرۆڤ دەکاتە ماددەی شیعری و هێندەی دیکە جوانیان دەکات [کە بەشێکی زۆری شیعرەکانی شیعری دڵداری و وەسفین و ئەمەش بەڵگەیەکی چاکە بۆ ژیاندۆستی و جیهان ویستییەکەی ئەو](١٨). لەهەمان کاتیشدا دزێوییەکانی ژیان و کەمتەرخەمییەکانی مرۆڤ دەداتە بەر تیری رەخنە و بەسانایی لێیان خۆش نابێ.

بۆیە من پێموایە نوسینی شیعرێ بۆ کەر، بەپلەی یەکەم نیشانەی دروستبوونی هوشیاریی نییە لەئاست گیاندارانداا، نیشانەی دەرکردنی مانیفێستێک نییە بۆ بەرگریکردن لە حەیوانات، هێندەی ئەوەی نیشانەی رەخنەیە لە کەمتەرخەمیی مرۆڤ لەئاست چەسپاندن و سەلماندن و گەشەدان بە ئینسانیەتی خۆی. نالی ئەرکی «بوون بە ئینسان» لە ئاستە فۆرمالیستییەکەیدا نابینێت، واتە بەلای ئەوەوە هەر تەنیا بەس نییە لەسەر دوو پێ بڕۆین، دوو دەستمان هەبێ، «صائم الدهر»، «قائم الليل»بین و گوێمان کورت بێت. نالی لەسەر بنەمای فۆرمی جەستەوە پێناسەی ئینسان ناکات، دەبێ لەجەستەدا ئینسانیەت هەبێ. ئەو ئینسان هەر لە روانگەی خولقەتەوە، کە روانگەیەکی ئایینییە، نابینێ کە بۆ یەکجار و بۆ هەمیشە وەک ئینسان هاتبێتە دنیاوە؛ بەڵکو ئەو وەزیفەی «بەئینسانبوون» دەگێڕێتەوە بۆ جەوهەرێکی حەیوانییانە، کە لەگەڵ هەموو حەیواناتی تردا هاوبەشین. کەواتە ئینسانبوون لای نالی بریتییە لەتێگەیشتن لەمانای ئەو جەوهەرە هاوبەشە، وەک سەرەتایەک بۆ هەنگاونان بەرەو ئینسانیەت، نەک دڕندەییکردن لە پێستی مرۆڤدا.

لەپشت ئەم شیعرەوە رووداوێک هەیە، کە شیعرەکە بەرجەستەی نەکردووە تاکو ئێمە ناوەڕۆکی شیعرەکە بە گەڕانەوە بۆ ئەو رووداوە شیبکەینەوە. ئەوەی شیعرەکە بەرجەستەی کردووە بریتییە لە پرۆسەیەک کە تیایدا حەیوان دەکرێتە ئینسان، کەر دەبێتە عاقڵ، بێزمان زمانی دەپژێ. هەموو ئەمەش بوارمان دەداتێ کە بڵێین: ساتی بە ئینسانبوونی حەیوان لەم شیعرەدا، بەڵگەیە لەسەر توورەیی شاعیر لە چۆنێتی ئیشکردنی ئینسانەکان بە عەقڵ و بە ئینسانییەتی خۆیان. کاتێ کەر دەبێتە عاقڵ، بەمانای ئەوەیە شاعیرەکەمان نائومێدە لە ئاست وەزیفەی ئینسانیانەی عەقڵدا و ئینسان بە شایانی ئەو ئیمتیازە نازانێ کە عەقڵی هەبێت، بۆیە ئەم توانایەی لێدەستێنێتەوە و دەیبەخشێتە حەیوانێک کە ئینسانەکان بە«هەموو عەقڵی خۆیانەوە» بە «کەر» ، واتە «بێ عەقڵ» ناویان ناوە. هەروەها کاتێ زمان بە بێ زمان دەبەخشێت، دیسانەوە ئیمتیازێکی دیکە لە ئینسان دەستێنێتەوە کە توانای قسەکردنیەتی لەسەر ژیان و دیاردەکانی، بەڵام کاتێ زمان لە وەزیفە سەرەکییەکەی لادەدات و مرۆڤ ناتوانێ لەبارەی ژیانی خۆیەوە، خودای خۆیەوە، دەوروبەری خۆیەوە بدوێت؛ شاعیر تەمەننا دەخوازێت کە ئەو زمانە بۆ حەیوان بایە تاکو راستییەکانمان بۆ بەیانبکات. وەک ئەوەی بیەوێ بڵێت: ئەگەر زمان بە حەیوانەوە دەبوو، دەبووە زمانی راستیی گوتن و رۆشنگەری و هوشیاری و تاد.

بەپێچەوانەی سیمای شیعرەکەوە کە هەندێجار لە کۆمیدیا نزیکدەبێتەوە، ئەوە پێموایە بونیادی شاراوەی ئەم شیعرە لە بارودۆخێکی ماندوویی شاعیرەکەیەوە بەدەست توندوتیژی و گرژی و فشاری ژیانی کۆمەڵگاوە هەڵقولا بێت. رەنگە بەردەوام دووبارەبوونەوەی هەندێ رەفتار و گوفتاری ماندووکەر لە ژیانی کۆمەڵایەتیی نالیدا، هۆی هەرە سەرەکیی سەرهەڵدانی ئەم شیعرە بووبێت. بۆ بەڵگەی ئەم قسەیەش، جگە لەوەی دیوانی نالی پڕە لەو شیعرانەی کە تیایاندا رەخنەی توند ئاراستەی ئاستەکانی نەزانی و کەمتەرخەمی و سستی و بێموبالاتیی دەستە و توێژەکان دەکات؛ لەو

میکانیزمەشەوە دەهێنم کە لەم شیعرەدا ئیشی پێکراوەو دوو لایەنی وەرگرتووە:

**یەکەم: بە مێیینەکردنی نێر و**

**دووەم: سڕینەوەی زەکەر**

## یەکەم) بە مێیینەکردنی نێر

ئەگەر لایەنی یەکەم وەربگرین، واتە بە مێینەکردنی نێر، ئەوە هەر زوو بە وەسفەکانی شاعیردا تێدەگەین، ئەو کەرەی باسی دەکات دەبێت «نێرەکەر» بووبێت، نەک «ماکەر»! بەڵام سەیر لەوەدایە لە زۆربەی ئەو خەسڵەت و وردەکاری و تەشبیهاتانەدا کە وەسفەکانی لەسەرەوە بینا دەکا، خەسڵەتی (مێیینە و نەرم و نیان و شیرین) زاڵ دەبن و لێرەشەوە هەندێ لە نووسەران باشیان پێکاوە کە دەڵێن: وەسفەکانی نالی بۆ کەرەکەی نزیکدەبنەوە لە وەسفی ئەو بۆ دڵدارەکەی(١٩). بەڵام من لە راڤەکردندا لەو نووسەرانە جیا دەبمەوە و پێموایە ئەو وەسفانەی نالی، گرنگییان لەوەدا نییە کە وەسفی دڵدارەکەمیان بیر بهێننەوە، بەڵکو لە بنەمادا پەیوەندیی هەیە بە «جیهانبینیی شاعیرانەی نالی»یەوە، کە زۆربەی کات شتەکان لە دۆخی مێیینەیی خۆیاندا دەبینێ و بەردەوام هەوڵدەدات جیهان و دەوروبەر و دیاردەکان و سروشت و تاد... بەمێیینە بکات و ئەمەش پەیوەندییەکی پتەوی بە ئامادەیی بەردەوامی پرنسیپی «نا-توندوتیژی»یەوە هەیە لە دنیای شیعری نالیدا. نالی بەپلەی یەکەم شاعیری عەشق و ژیانە و ئەمەش لەو هەموو شیعرانەیدا دەردەکەوێ کە بۆ مرۆڤ و سروشت و شتەکانی نووسیون. شاعیرێ لە بیرکردنەوەیدا لە سروشت گەیشتبێتە ئەوەی هێندە بەڕوونی بڵێت:

«کانی دەزێن بە ئاو و، درەخت ئاوسن بە با
شایی بەهارە، بولبولە داماد و غونچە بووک»

ناتوانێت جیهان لە رەگەزە توندوتیژی و سیما گرژەکانی رووت نەکاتەوە

و ڕەگەزی نێرانەی جیهان ڕەش نەکاتەوە. لێرەوە وەسفەکانی شاعیر بۆ کەرەکەی چەندە لە ئاستی مانادا کەمبایەخن، کەچی بۆ خوێندنەوەی کۆی جیهانبینیی ناتوندوتیژانەی نالی و، لەوەدا کە هەوڵدانی ئەون بۆ بە مێیینەکردنی نێر، بایەخی تایبەتییان هەیە. سەیر لەوەدایە نالی لەم وەسفانەدا بۆ نێرەکەرەکەی هێندە خۆی دەدات بەدەست شەپۆلەکانی بەمێیینەکردنەوە، کە ئیدی یەکێک لە ئەندامە هەرە گرنگەکانی کەری لەبیر دەچێتەوە کە حەیتە گەورە و سەربە گوێەندەکەیەتی! و لێرەشدا دەگەینە سەر باسکردنی لایەنی دووەمی میکانیزمی ناو شیعرەکە.

## دووەم) سڕینەوەی زەکەر

نالی لە وەسفی «سەر و کەللەو سینەی پان»ی کەرەکەیەوە دەستپێدەکا، تاکو دەگاتە «سم و پێی لە تووکدا شاراوەی». کەچی زەکەری کەر، (کە لە رووی ئەفسانەیی و مێژووییەوە بۆتە هۆی ئەو هەموو ناوبانگ و گوێەندنانەوەیە بۆی)، لە بیر دەکات!. ئەم لە بیرکردنە هەر هۆیەکی لەپشتەوە بێ و هەرچۆنێک لێکی بدەینەوە، ناتوانێت بەشێک نەبێ لە پڕۆسەی «ڕەتکردنەوەی توندوتیژی» لە ڕێگەی فەرامۆشکردنی زەکەرەوە. زەکەر یەکێکە لە ڕەمزەکانی زەبر و لێدان و توندوتیژی و تەنانەت لە مەیدانی پێکهەڵپڕژانی کۆمەڵایەتیدا کاتێ کەسێک هینەکەی کەر ڕەوانەی دایک و خوشکی یەکێکی تر دەکا، ئەوە ڕاددەی ئەو توندوتیژی و تووڕەییەش کەشفدەکا، کە ئەو کەسە بەرامبەر کەسی بۆ ڕەوانەکراو هەیەتی.

نالی لە دنیایەکدا ئیشدەکات کە دنیای شیعر و بەرهەمهێنانی جوانی و مانایە، ئەم دنیایەش جێگەی بەرجەستەکردنی خەسڵەتی توندوتیژیی نێرانەی تیا نابێتەوە و شەپۆلی ئەو وەسفانەش بەجۆرێ لەگەڵ خۆیان بردوویانە کە زەکەر وەک ڕەمزی توندوتیژی لەیاد بکا. دیارە ئەمەش پەیوەندییەکی پتەوی هەیە بە خۆزگەی نالییەوە بۆ سڕینەوەی توندوتیژی لە هەموو دنیادا و تەمەننای ئەوە بۆ دروستکردنی جیهانێکی تەبا، کە تیایدا

ئینسان و حەیوان یەک جەوهەریان هەیە و هیچیان لەجەوهەردا لەویتریان لەپێشتر نین. لێرەوە وەسفەکانی نالی بۆ کەر، دواجار لەناو نەرمییەکی سەرسوورهێنەری ئەوتۆدا ئارام دەبنەوە، کە نالی-ی شاعیر توانای هەبێ لە «زمانی کەر» تێبگات و هیچ سنوورێک لە نێوان حەیوانیەتی ئینسان و عاقڵێتیی حەیواندا نەمێنێت.

بۆ زیاتر سەلماندنی ئەو دوو میکانیزمەی پێشتر، کە نالی بەهۆیانەوە نەرمییەک بەوەسفەکانی دەدات، لە شیعرەکەدا میکانیزمێکی دیکەش هەیە، کە بریتییە لە بەوشەکردن و بەزمانکردن و لەوێشەوە بە مەفهوومکردنی «دەنگ و زمان»ی کەر: نالی یەکێ لە خەسڵەتە هەرە بێزارکەرەکانی کەر، کە«زەڕین»ە و ئیقاعێکی نا مۆسیقایی هەیە، دەکاتە «رستەی زمانیی» و دەیخاتە سەر «ریتمی قسەکردن» و ئاخاوتنی ئینسان. لە راستیدا نالی بەهیچ شێوەیەک نایەوێ لە شیعرەکەیدا دەنگی ناسازی کەرمان بەبیر بهێنێتەوە، بەڵکو کاتێ ئاوڕ لەم لایەنە دەداتەوە، دەنگی زەڕین «تەرجەمەی سەر زمانی ئاخاوتن» دەکات و دەڵێت: {چەندە پێم خۆش بوو ***زوبانی حالی*** دەیوت: «نالیا»}، کە دیارە ئەمەش لە هەڵبژاردنێکی ئاگایانەی شاعیر دەچێت بۆ بەرجەستەکردنی ئەو دەنگە، لەکاتێکدا دەیتوانی لە میانەی وەسفەکانیدا بۆ کەر، سیفەتێکی تایبەتیش بە دەنگی زەڕینەکەی ببەخشێ و ئەویشمان لێبکاتە نەغمەیەکی خۆش.

## بەشی پێنجەم:

# بیرکردنەوە بە شیعر

پرسیاری گرنگ لەم بەشەدا ئەوەیە، ئایا ئەگەر بمانەوێ لە چوارچێوەی کێشەکانی ئێستاماندا بیر لەم شیعرە بکەینەوە و بیری پێبکەینەوە، واتە ئاسۆی دەقەکە لە ڕێگەی خوێندنەوەیەوە، ببەستین بە ئاسۆی دنیای خۆمانەوە، پێویستە چ ڕێگایەک هەڵبژێرن؟ ئایا دەتوانین ئەم دەقە وەک ڕوانگەیەک، وەک (پرسپێکتیڤ)ێک بەکار بهێنین بۆ تێگەیشتنێکی زیاتر لە ئێستای خۆمان؟ بەمانایەکی دیکە دەپرسم: ئایا شیعر دەتوانێت ئیزافەیەک بخاتە سەر دنیای بیرکردنەوە و ئاسۆی ژیان و بوونمان؟

لێرەدا نامەوێ سەبارەت بە «شیعر و بوون»، بە «شیعریبیەتی بوون» و «عەقلانیەتی شیعر» و ئیلتیزامی شیعر بە بوونێکی بەهادارانەی ئینسانییەوە بدوێم. ئەم باسەم لە شوێنێکی دیکەدا خستۆتەڕوو(٢٠). بەڵکو هەوڵدەدەم لەسەر ئاستی دوو ڕەگەزەوە کە پێکهێنەری بنەڕەتیی شیعرەکەن، واتە ڕەگەزی «خوازە، یان میتافۆر» و ڕەگەزی «فەنتازیا» وەڵامی بەشێکی ئەو پرسیارانەی پێشوو بدەمەوە و بۆ ئەمەش پشت دەبەستم بە بیرکردنەوەی فەیلەسوفی فەرەنسی «پۆڵ ریکۆر» لە تێگەیشتنیدا بۆ ڕەگەزی میتافۆر و فەنتازیا.

ریکۆر لە میانەی بیرکردنەوە فەلسەفییەکانیدا لەمەڕ زمانەوە، لەوە تێگەیشت کە نەک هەر دەبێ تێگەیشتنی فەلسەفییانەی بونیادگەری لە زمان ڕاستبکرێتەوە، بەڵکو کەوتە ڕەخنەگرتنیش لە سەرجەمی ئەو نەرێتەی ناو کولتووری فیکریی خۆرئاوا کە تیایدا هەوڵدەدرێت زمانی میتافۆریانەی

پشت بەستوو بە وێنەسازی، بچووکبکرێتەوە بۆ سەر ئاستی زمانێکی بێمانا و بێبایەخی رازاندنەوەی دەقەکان. ئەمەش ریکۆری بەرەو رەخنەیەکی قووڵ لە نەریتی هونەری رەوانبێژیی تەقلیدی (فن الخطابە) برد، کە لە کتێبی «میتافۆری زیندوو»، یان «ئیستیعارەی زیندوو»دا (١٩٧٥) رەنگیدایەوە و پاشانیش لە هەندێ وتاریدا گەڕایەوە سەر ئەم مەسەلەیە(٢١).

لەم کارانەدا ریکۆر دەیەوێ بڵێت، تەنیا ئەو میتافۆرانە بە زیندوویی دەمێننەوە، واتە دەتوانن شتێکی زیاتر لە مانای حەرفیی دەقەکان بخەنە روو، کە وەسفێکی دیکەی دنیا دەکەن و سیمای هەمەڕەنگیی جیهان بەشێوەیەکی تر پێشکەش دەکەن. بەمجۆرەش دەقی میتافۆری، دەبێتە دەقێکی لاساییکەرەوە، واتە «میمیسیس» بەوجۆرەی کە ئەرستۆ لە کتێبی «شیعر»دا باسی دەکا: میتافۆر ئەو شتە پیشاندەدات کە دەیناسین و هەر بەو جۆرەش لەمیانەی پیشاندانەوەیدا مانای نوێ بە هەمان شت دەبەخشێت. کەواتە میتافۆر هەر بەتەنیا دووبارە نووسینەوەیەکی نومایشیی، یاخود وێنەیی نییە کە مەسەلەیەکمان بە وشەی دی بۆ باسبکا، بەڵکو جۆرێکی تازەی تێگەیشتنە لە خۆمان و لە جیهان و شتەکان. هەرئەوە دووبارە ناکاتەوە کە پێشتر دەیزانین، بەڵکو ئاماژە بۆ ئیمکانی تازەی تێگەیشتنیش دەکا.

کتێبی «میتافۆری زیندوو» هەوڵدانێکی سەرنجڕاکێشە بۆ بەکراوەیی هێشتنەوەی تێگەیشتنی مەعریفییانە لە جیهان و بوون، نەک هەر بەهۆی بیرکردنەوەی «عەقڵانییانەی رووتەوە»، بەڵکو بەهۆی «شیعر و هونەر»ەوە. لەخودی خۆیدا میتافۆر دەچوێندرێت بە شیعر، یاخود بە میناتۆری هەمەڕەنگ دەچوێندرێ و مرۆڤیش لە رێگەی زمانی شیعرەوە فەنتازیای خۆی گەشە پێدەدات و دنیای خۆی میناتۆریزە دەکا بەجۆرێ کە مەوداکانی ژیانی بەرفراوان و هەمەڕەنگ بن. ریکۆر لە شوێنێکدا گوتوویە: «بە گۆڕانکاریی لە فەنتازیادا، مرۆڤ بوونی خۆی دەگۆڕێت»(٢٢). ئەم بڕوابوونە بەوەی کە وێنەکانی زمان و فەنتازیا دەتوانن تێگەیشتنی مرۆڤ لە

هەلومەرجەکانی ژیان و ئیمکانەکانی گەشە پێبدەن، خاڵێکی گرنگە لە هەر هەوڵدانێکی تیۆرییانەدا بۆ تێگەشتن لە شیعر و بەستنەوەی ئاسۆکانی دەقی شیعریی بە ئاسۆی جیهانی خۆمانەوە، کە ئەمەش مەسەلەیەکی گرنگی فەلسەفەی تەئویل و هێرمێنۆتیکای (گادامێر)ە.

* * * *

ئێستا دەمەوێ بڵێم: دەقی ئەم شیعرەی نالی وەک زۆربەی هەرە زۆری شیعرەکانی دەقێکی میتافۆری، یاخود ئیستیعارییە(٢٣). بەڵگەش بۆ ئەم قسەیە ئەوەیە کە بگوترێ: پێش هەموو شتێ ئەم دەقە دەقێکی «شیعری»یە و لە «زمان»دا بە ئێمە گەیشتووە و میتافۆریش شێوەیەکە لە شێوەکانی ئیشکردنی زمان. کەواتە شیعرەکە بەڵگەیەک نییە لەسەر رووداوێکی مێژوویی، یان کۆمەڵایەتی و سیاسی، بەڵکو بەڵگەیە لەسەر «ئیشکردنی فەنتازیا» و لێرەشەوە بەتەواوی پێناسەکەی ریکۆری لەگەڵدا دەگونجێ، چونکە دەقێکە خوڵقاوی فەنتازیایە و پەیامەکەشی: گۆڕینی وێنای مرۆڤە بۆ کەر، کە لێرەدا وشەی «کەر» هەم فیگەرێکی ئیستیعارییە بۆ حەیوان بەتایبەتی و هەم فیگەرێکیشە بۆ سروشت بەگشتی، چونکە وەک پێشتر نووسیم، پرۆسەی ئیشکردنی ئەم شیعرە گواستنەوەی سروشتییە بۆ کولتووری، قابیلبوونی عەقڵە بۆ بێعەقڵ و پێبەخشینی زمانە بە بێزمان، کە پێشتر بە دوور و درێژی لەم لایەنانە دووام.

بەواتایەکی دیکە: ئێمە دەتوانین لەم روانگەیەوە و لەسەر بنەمای ئەم شیعرەوە، یاخود لەسەر پوختەی گوتاری ئەم دەقەوە، باس لە تێڕوانینی فەلسەفییانەی شاعیرەکەمان بکەین سەبارەت بە سروشت و حەیوان و مرۆڤ. واتە ئەم دەقە وەک بەڵگەی «بیرکردنەوەی شاعیرانەی ئینسان لە دنیا» تێبگەین کە لەهەمان کاتیشدا دەتوانین بەراوردی بکەین بە بیرکردنەوەکانی دیکەی مرۆڤ لەناو مێژووی فەلسەفەدا سەبارەت بە سروشت و حەیوانات و پەیوەندیی مرۆڤ پێیانەوە. ئەم شیعرە بەڵگەیە لەسەر

بیرکردنەوە لە جیهان بەهۆی فەنتازیاوە، نەک عەقڵی پەتییەوە. واتە بەشداریکردنی فەنتازیایە لە فراوانکردنی ئاسۆکانی ژیان و رەخنەیە لە سیستەمەکانی دیکەی تەفسیرکردنی دنیا. جۆرێکی تازەی تێگەیشتنە لە خۆمان و لە جیهان. هەر ئەوە دووبارە ناکاتەوە کە پێشتر دەیزانین، بەڵکو ئاماژە بۆ ئیمکانی تێگەیشتن و زانینی تازەش دەکا. وەک ریکۆر دەڵێ، ئەمجۆرە دەقانە هەوڵدانێکی سەرنجراکێشن بۆ بەکراوەیی هێشتنەوەی تێگەیشتنی مەعریفییانە لە جیهان و بوون، نەک هەر بەهۆی بیرکردنەوەی عەقڵانییانەی رووتەوە، بەڵکو بەهۆی شیعر و هونەرەوە. سروشتی میتافۆرییانەی ئەم جۆرە دەقانە هەر لە حەرفەکانیاندا نییە، بەڵکو دەتوانن شتێکی زیاتر لە مانای حەرفیی دەقەکان بخەنەروو، چونکە وەسفێکی دیکەی دنیا دەکەن و سیمای هەمەڕەنگیی جیهان بەشێوەیەکی تر پێشکەش دەکەن.

هەموو ئەم خەسڵەتانەش لەناو دەقەکەدا، هانمان دەدەن تاکو بەشێوەیەکی وردتر ئەو جیهانبینییانە دەستنیشان بکەین کە جیهانبینیی ناو دەقەکە لەسەر سروشت و حەیوان، بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ رەخنەیان لێدەگرێت. ئەگەر وەکو لەم لێکۆڵینەوەیەدا بۆمان ئاشکرابوو، ئەم دەقەی نالی ئەنجامی بیرکردنەوە بێت لە مرۆڤ و بەرهەمهێنانی هیومانیزمێکی رادیکاڵ بێت لەناو زمانی کوردیدا، کە تیایدا ئینسان بەپێچەوانەی سیستەمە باوەکانی بیرکردنەوە و تیۆری خوڵقەتی ئایینی، نەک هەر بە سەنتەر و سەروەر ناکرێت، بەڵکو دەشخرێتە ریزی حەیواناتەکانی تر و وەک هەر حەیوانێکی دیکە تەماشای دەکرێ، ئەوە شتێکی ئاشکرایە کە جیهانبینیی ناو دەقەکە وەک رەخنەیەکی ناڕاستەوخۆی لێدێت لە جیهانبینیی میکانیکییانە و ئامرازگەرایانە، کە دوو ئاراستەی فیکریی ناو مێژووی فەلسەفەن لە تێڕوانینی مرۆڤدا بۆ سروشت و حەیوانات.

بۆیە لێرە بەدواوە دەمەوێ، ئەگەرچی بەکورتیش بێت، کەمێ لەسەر تێڕوانینی ئامرازگەرایانە بۆ سروشت بوەستم تاکو زەمینەیەکی پتر ئاشکرا بۆ

تێگەیشتن لە شیعرەکەی نالی، وەک رەخنەگرتن لەو جیهانبینینییە بێتە ئاراوە. پێموایە ئەمە خاڵێکی نوێیە کە ئێمە دەتوانین لە شیعری کلاسیکی کوردییەوە، ئامرازی رەخنەگرتن لە ئاراستەیەکی فیکری فەلسەفیی خۆرئاوا بەدەست بهێنین. رەنگە هۆی هەرەسەرەکیی ئەم هەوڵدانەش گیرۆدەیی ئێستامان بێت بەدەست هەمان جیهانبینیی ئامرازگەرایانەوە لەناو کۆمەڵگە و کولتووری خۆماندا. بەخۆڕایی نییە ئەم شیعرەی نالی خۆی بەدەستەوە دەدات تاکو بەوبارەدا بیخوێنینەوە، چونکە کۆمەڵگای کوردی ئەمڕۆ زیاتر لەهەر کاتێ گەشەی داوە بە بیری ئامرازگەرایانە لەبارەی سروشت و حەیواناتەوە. چیدی دیاردەکانی گۆشتخواردنی بە لێشاو، زیادەڕۆیی لە سەربڕینی حەیوانات و پەلەوەر و راوکردن، بەڵگەی برسێتیی ئەم نەتەوەیە نین، یاخود پێویستییەکی فیسیۆلۆژی و تەندروستییانە نین، بەڵکو ئەنجامی گەشەسەندنی ئەو تێڕوانینە ئامرازگەرایانەیە لەسەر سروشت و حەیوانات، کە پێیوایە هەموو شتێ، هەموو زیندەوەر و دیاردەیەکی سروشتی لە خزمەت و لە پێناوی سەروەریی مرۆڤدایە. لێرەوە تێدەگەین بۆچی مرۆڤی ئێمە پتر لەهەر کاتێ پەلامارانە بۆتە گۆشتخۆرێکی سەرسوورهێنەر، چێشتخانەکانی ئێمە کێبەرکێیانە لەسەر ئەوەی کامیان ژمەگۆشتی زۆر لەبەردەمی میوانەکانیاندا دابنێن و قەسسابخانەکانی ئێمە شەوانە بۆچی بەسەدان حەیوانی هەمەجۆریان تێدا سەردەبڕدرێ و میواندارییەکانی ناو ماڵی کوردی بوونەتە خۆکوتانێکی بەپەلە بۆ ئەوەی هەموو دەعوەتێکی باش و «شەرافەتمەندانە» لە رازاندنەوەی سفرەیەکی پڕ گۆشتدا بچووک بکەنەوە، بەبێ ئەوەی هیچکامێ لەمانە بەرەو تێگەیشتنێکی دیکە لە حەیوانات و بەرەو بیرکردنەوەمان بەرێت لە گیانەوەرەکانی تر. ئێمە تەنیا مەسرەفدەکەین و تەنیا قوربانیمان دەوێ بۆ بەردەوامیی خۆمان لە رێگەی گۆشتەوە.

## تێڕوانینی ئامرازگەرایانە لە سروشت

مێژووی فیکر بۆمان دەگێڕێتەوە کە مرۆڤ بە درێژایی ژیانی خۆی بۆ تەفسیرکردنی پەیوەندیی نێوان خۆی و سروشت و حەیوانەکانی تر، پەنای بۆ چەند سیستەمێکی لێکدانەوە، یاخود تێڕوانین بردووە. یەکێک لەو تێڕوانینانەش ئەوەیانە کە شیعرەکەی نالی رەخنەی لێدەگرێت و رەتیدەکاتەوە. لێگەڕێن کەمێ بڕوانینە ئەو ئاراستەیەی کە بە «تێڕوانینی ئامرازگەرایانە لە سروشت» ناوبانگی دەرکردووە و چەند بیرمەندێکی بەناوبانگیشی راپێچی ناو غەفڵەتەکانی خۆی کردووە(٢٤).

مرۆڤ لە هەموو سەردەمەکانی ژیانیدا ناچار بووە بەمەبەستی دابینکردنی بژێویی خۆی، سوود لە سروشت وەربگرێت و کاری تێدا بکا و دەستبخاتە شێوەی بەڕێوەچوونیەوە. ئەم پرۆسەیە کە پێیدەگوترێ پرۆسەی بەرهەمهێنانی ماتەریاڵی، شتێک نییە چاوی لێبپۆشرێت و لەپەیوەندیش بەمکارەوە سروشت هیچ شتێ نییە بێجگە لە ئامراز و هۆکارێک. لەم روانگەیەوە مرۆڤ ناتوانێ تێڕوانین و تێگەیشتنێکی ئامرازگەرایانەی بۆ سروشت و هەرچی لە سروشتدایە، نەبێت.

بەپێی تێڕوانینی بێغەل و غەشی ئامرازگەرایانە بۆ سروشت، ئەوە سروشت بە هەموو مانایەکی بریتییە لە ئامرازێک لە خزمەتی بەرژەوەندییەکانی مرۆڤدا. سروشت خۆی لە خۆیدا هیچ نرخێکی نییە، نرخی سروشت تەنیا بەوەدا دەستنیشان دەکرێ، کە تاچەندێ ئامرازێکی پێویستە بۆ ژیانی مرۆڤ. ئەم قسەیە هەر تەنیا سروشتی بێگیان ناگرێتەوە، بەڵکو رووەک و حەیواناتیش دەگرێتەوە، کە لە پێناوی مرۆڤدا دروستبوون. هەر لەم تێگەیشتنەشەوەیە کە لە رۆژگاری ئەمڕۆدا بە حەیوانە ماڵییەکانی وەک مانگا، مریشک و کەر و وڵاخەبەرزەکانی دیکە دەگوترێ: هۆیەکانی بەرهەمهێنانی کشتوکاڵی! بەهەمان شێوە، ئەم تێڕوانینە، سروشت بە شوێنی سەرگەرمی و کات بەسەر بردن، واتە بە هۆکارێکی خۆ سەرقاڵکردنی مرۆڤ دادەنرێ لە کاتی دەستبەتاڵیدا.

مەرج نییە تێڕوانینی ئامرازگەرایانە، سروشت وەک مەتریالێکی بێبایەخ تەماشا بکات. چونکە مرۆڤ توانای هەیە بەرژەوەندییە ئایندەییەکانی خۆی ببینێت و سەرچاوە سروشتییەکان بەجارێ کوێر نەکاتەوە. ئەمە جگە لەوەی سنوور هەیە بۆ ئەوەی تا چەند دەتوانین سروشت و ژینگە پیس بکەین و دەشزانین لە کوێدا هارمۆنیا و هاوسەنگیی ئۆرگانییانەی ژیان تێکدەچێت.

تێڕوانینی ئامرازگەرایانە لە سروشت لەسەر جیاکردنەوەیەکی بنەبڕی نێوان مرۆڤ لەلایەک و باقی هەموو سروشت لەولای ترەوە، بەندە. لە روانگەی مێژووی ئایدیاکانەوە ئەم مەسەلەیە پەیوەندیی هەیە بە کەم تەماشاکردنی بووە خاکییەکان، بەتایبەتیش بە جەستە و کارکردەکانی، کە مەسیحییەت بە درێژایی سەدەکان کاری بۆ کردووە. تێگەیشتنی ئامرازگەرایانە رەگی خۆی دەباتەوە سەر تەورات، بەتایبەتی لە داستانی خولقەتدا کە تیایدا هاتووە: یەزدان لەسەر وێنەی خۆی بەشەری دروستکرد و رێگەی پێدا سەروەری گشت دروستکراوەکان بێت. بەمکارە مەسیحییەت لە فیکری ئەوروپیدا برەوێکی زۆری بە پرۆسەی کەم تەماشاکردنی بووە زەمینییەکان و سروشت بەگشتیی دا و لێرەشەوە تێدەگەین بۆچی بناغەی تێڕوانینی ئامرازگەرا لە رێنیسانسەوە هێندە پتەو بووە، بەتایبەتی کاتێ ئەم بناغەیە پشتی بەستووە بە تێگەیشتنێکی تەکنۆ/زانستی بۆ سروشت و مرۆڤ. یاخود دەتوانین بڵێین: بەتایبەتی لەو سەردەمەوە کە تێگەیشتنی زانستییانەی پشتی بە تەکنەلۆژیا بەستوو بۆتە تاقە تێگەیشتن لە سروشت، ئەوە ئامرازگەرایی بەردەوام گورزی خۆی لەو سروشتە وەشاندووە(٢٥).

کەواتە تێدەگەین بۆچی هەمیشە تێگەیشتنی ئامرازگەرایانە لە سروشت گرێدراوە بە تێگەیشتنێکی میکانیکییەوە لە هەمان بابەت. راستییەکەی ئەوەیە زۆر پێش ئەوەی زانستی سروشت توانا سەرسوورهێنەرەکەی لە بەکارهێنانی تەکنیکدا بخاتەڕوو، زانای ئینگلیزی فرانسیس بیکۆن (١٥٦١-١٦٢٦) توانیبووی بیرۆکەی تێگەیشتنی ئامرازگەرایانە لە سروشت لەسەر ئیقاعێکی تەکنەلۆژی دابڕێژێ. ئەو گوتبووی: «زانست

دەسەڵاتە»(٢٦) و ئەمەشی بەو جۆرە لێکدەدایەوە کە بڵێت: ناسینی یاساکانی سروشت پێشمەرجن بۆ ئەوەی مرۆڤ بتوانێ دەستبخاتە کاروباری سروشتەوە و ناچاری بکا بەو جۆرە بێت کە مرۆڤ خۆی دەیەوێ. دیارە بیکۆن بیری لەوە کردۆتەوە کە بە ناسینی یاساکانی سروشت، واتە بە دەسەڵات پەیداکردن بەسەر سروشتدا، ئیدی مرۆڤ مافی هەموو جۆرە دەستێوەردان و بەکارهێنانێکی ئەو سروشتەی دابینکردووە.

لە سەردەمی زێڕینی تێگەیشتنی میکانیکییانەدا لە سروشت، واتە لە سەدەی حەڤدەهەم و هەژدەهەمدا، پەیوەندیی مرۆڤ بە سروشت و ئاژەڵەکانەوە، پەیوەندییەکی ئامرازگەرایانەی رووت بوو، کە تیایدا گیاندارەکان وەک مەکینەیەک تەماشایان دەکرا. فەیلەسووفی فەرەنسی، دیکارت (١٥٩٦- ١٦٥٠) دەیگوت، حەیوانات جۆرێکن لە مەکینە، هاوار هاوار و قیژەقیژەکەشیان نەک هەر تەعبیر نییە لە ئازار و دەرد، بەڵکو دەبێت وەک دەنگی لێدانی زەنگی سەعات گوێبیستی بین و هیچیتر(٢٧).

بەلای دیکارتەوە جگە لە «ئاگایی مرۆڤ»، ئیدی هەموو دیاردەکانی دیکەی ناو واقیع دیاردەی میکانیکین، کە تەنیا لە جیسمی مەتریاڵی بزواو پێکهاتوون و بەیەکدا دەدرێن. واتە هەموو زیندەوەرەکان جگە لە مرۆڤ، بریتین لە ئامێری میکانیکی و سیستەمی بایۆلۆژیاش لە سیستەمێکی میکانیکی زیاتر هیچیتر نییە. دیکارت هێندە لەم تێگەیشتنەی خۆی دڵنیایە کە بتوانێ بڵێت، تەنیا مرۆڤ، یاخود تەنیا ئاگایی مرۆڤە کە هەڵدەستێ بە نواندنی چەند چالاکییەکی سایکۆلۆژییانە. حەیوانات ئامێرێکی میکانیکی زۆر ئاڵۆزن بەبێ هیچ پەیوەندییەک بە دنیای ئاگاییەوە و هەر لەبەر ئەوەشە کە ناتوانن هەست بە ئازار و دەرد و خۆشی بکەن. بەمانایەکی دیکە، قیژەی ئاژەڵێک لەئازاردا وەک لێدانی زەنگی سەعاتێکە بە دیوارەوە.

هەڵبەتە ئەم تێڕوانینە ئامرازگەرایانەیە لە سروشت و حەیوانات لەگەڵ تێڕوانینی هەموو کولتوورەکاندا وێکنایەتەوە. هەموو کولتوورەکان لەبەر هۆی

ئایینی، یان ئەخلاقی و یاسایی بێت، وەک یەک تەماشای هەموو حەیواناتەکان ناکەن. لە زۆربەی کولتوورەکاندا جۆرێ لە ڕێزگرتن هەیە لەئاست هەندێ ئاژەڵ و باڵندەدا، کە ئەم ڕێزگرتنەش بۆ نموونە لە یاسای پاراستنی ئاژەڵان، لە جۆری سەربڕین و سزابڕینەوە بۆ ئەوانەی بە شێوەیەکی ناشرین هەڵسوکەوت لەگەڵ حەیواناتدا دەکەن، ڕەنگیداوەتەوە. ئەو ئاژەڵانەی ئەمجۆرە یاسایانە دەیانگرێتەوە، وەک هۆکارێک یان وەک ئامرازێک تەماشا ناکرێن، ئەگەرچی بەهای ئەمان لەچاو ئەو نرخەدا کە بۆ مرۆڤ دادەنرێت زۆر کەمترە. مەڕ و مانگا لەلای کورد هەرچەند پیرۆز و بەنرخ بن، هێشتا نرخی مرۆڤێکیان پێنابەخشرێت، با ئەو مرۆڤە کەمئەندامیش بێت.

گرنگیدانی فەیلەسووفانی سەردەمی ڕۆشنگەریش بە توانای زانستە سروشتییەکان، هەر بەلای تێگەیشتنێکی ئامرازگەرایانەدا دەیشکاندەوە. ئیمانوئیل کانت (١٧٢٤-١٨٠٤) کە یەکێک بوو لە ڕۆشنگەرە هەرە عەقلانی و وردبینەکان، ڕستەیەکی گەلێ گرنگی بۆ سەر بیری مرۆڤدۆستیی ئەورووپی زیادکرد: «هەرگیز بۆمان نییە تەنیا وەک هۆیەک مامەڵە لەگەڵ مرۆڤدا بکەین، بەڵکو دەبێت هەمیشە مرۆڤ ئامانجی مامەڵەکردنەکەمان بێت» (٢٨). تێگەیشتنێکی دیکە لەم ڕستەیە ئەوەیە کە بگوترێ: جگە لە مرۆڤ، بۆمان هەیە لەگەڵ هەموو شتێکی دیکە تەنیا وەک هۆیەک مامەڵە بکەین و لێرەشەوە جارێکی دیکە سەروەریی مرۆڤ بەسەر هەموو گیانەوەرەکانی دیکەوە، وەک ئەوەی لە کتێبی تەورات و ئینجیلدا هاتبوو، جەختی لەسەر دەکرایەوە، بەڵام ئەمجارەیان بە زمانێکی فەلسەفی.

یەکێک لە ئەنجامە خراپەکانی ئەم تێڕوانینە ئامرازگەرایانەیە بۆ سروشت و بووەکانی ناوی ئەوەیە، کە مرۆڤ هەرگیز ڕێگا بەخۆی نەدات لەبەر خاتری سروشت خۆی، سنوورێ دابنێ بۆ سوود وەرگرتنی لەو سروشتە. بەمانایەکی دی، تەنیا ئەوکاتە مرۆڤ دەست هەڵدەگرێ لە بەکارهێنانی سروشت کە زیانی تیا بێت بۆ خۆی. کاتێک مریشکەکان بەو هەموو ناز و گرنگیپێدانەوە بەخێو دەکەین، مەبەستمان نرخدانان نییە لەسەر مریشک

وەکئەوەی کە لە سروشتدا هەیە. بەڵکو بۆ ئەوەیە هەرچی زووترە قەڵەو بێت و سەری ببڕین. یاخود لە سەردەمێکدا کە دەتوانین دوورترین ڕێگا بەهۆی هۆیە تەکنەلۆژییەکانی گواستنەوەوە ببڕین ئیدی ژمارەی کەرە بەرەڵڵا و وڵاخەبەرزە بێخاوەن و بەرەڵڵاکراوەکان پتر دەبێت، چونکە تەنیا لەبەر خاتری پێویستییەکانی مرۆڤ، حساب بۆ گیاندارەکانی دیکە دەکرێ وماڵی دەکرێن، کاتێ هۆی خێراتر و بەهێزتر پەیدا دەبن، ئیدی ئەوانەی پێشتر «ماڵی»مان کردبوون «بەرەڵڵا» دەکەین. لەنێوان ئەم دوو پرۆسەیەشدا، واتە لەوێوە کە مرۆڤ مێژوویەکی دوور و درێژی لەگەڵ ماڵیکردنی ئاژەڵ و باڵندەکان هەیە و لەو ساتەوە کە ئیدی پێویستیی پێیان نامێنێ و بەرەڵڵایان دەکاتەوە ناو سروشت، بێوەفاییەکی نەبڕاوەی مرۆڤ ئامادەیە، کە ئەمەش لەو خۆ بەسەروەر زانینەیەوە هاتووە کە نالی لە شیعرەکەیدا رەخنەی لێدەگرێ.

* * * *

لە راستیدا ئەگەر بشێت وەک چەمکێکی فیکری باس لە ئاراستەیەکی مرۆڤدۆستی لە شیعری نالیدا بکەین، ئەوە ئەم ئاراستەیە جۆرێکی زۆر تایبەتە و لەزۆر خاڵدا لەو ئاراستەیە جیا دەبێتەوە کە لە تێڕوانینی ئامرازگەرایانەدا، کە وەکو گوتم: ئاراستەیەکی بەرهەمهاتووی ناو فیکری خۆرئاوایە، بەرجەستە بووە.

پێش هەموو شتێک نالی لەم شیعرەدا قایل نییە بە جیاکردنەوەی سنوورێک لە نێوان سروشت (کە تایبەت بێت بە حەیوانات) لەلایەکەوە و سروشت (وەک شوێنی ژیانی مرۆڤ) لەولای ترەوە. ئەمەشمان بەلای کەمەوە لە سێ ئاستدا بۆ ئاشکرا دەبێت: یەکەم، لەو گواستنەوەیەدا کە پێشتر ناوم نا «گواستنەوە لە سروشتەوە بۆ کولتوور» و پاشان «بەئینسانکردنی حەیوان» لە ڕێگەی ئەو گواستنەوەیەوە، کە پێویست ناکات چیدی لەسەری بڕۆم. دووەم: حەیوان لێرەدا ئامراز و هۆکار نییە و نرخی خۆی وەک بوونێک لە

خـۆیدا هەڵگرتووە، نەک بەوەدا کـە تا چەندێ خزمـەتی مـرۆڤ دەکـا، واتە جەوهەری کەر وەک حـەیوانێک (لە سـروشـتـدا) بەهۆی سـوودەکـانییـەوە بۆ مـرۆڤ بەدەست نەهاتووە و سێـهـەم: کـەر وەک گـیـانەوەرێکی سـروشـتی، یەکسـان دەکرێتەوە بە گـیانەوەرێکی دیکەی سروشتی کە ئینسـانە. کەواتە بەپێـچـەوانەی بیـری ئامـرازگـەراوە، کـە دێت مـرڤ لەلایەک و سـروشت و بووەکانی لەولای ترەوە بەشێوەیەکی رەها لێکدی جیا دەکـاتەوە، نالی دێت ئەم دوو لایەنە تێکەڵ دەکاتەوە بەیەکتر و لەنرخیشیاندا یەکسـانیان دەکاتەوە بەیەکدی، چونکە هەردووکیـان بە پێی جـەوهەری «حـەیوانیی» خـۆیان سـەر بەیەک سروشتن.

هەروەها نالی لە شیـعـرەکەیدا ئەو هاوکـێشـەیەی فـرانسـیس بیکۆن کە دەیگوت: «زانست دەسەڵاتە» ، هەڵدەگێڕێتەوە بۆ هاوکێشـەیەکی دیکە، کە دەڵێت: زانست کـامـەرانی و بەخـتـیـاریـیـە لە رێگەی ئەو تێگەیشتن و رۆشنگەرییەوە کـە سـەبارەت بە شـتـەکـان و دیاردەکـان پێمـاندەبەخشـێت و ئیزافـەی دەکـاتە سەر کـۆی مـەعریفـەمان لەسەر دنیـا و خـۆمان و شـتـەکان. لێرەدا زانست و زانین هۆیەک نییـە بۆ دەستبەسـەراگرتن و کۆنتـڕۆڵکردن، بەڵکو رێگایەکـە بۆ تێگەیشتن و رۆشنگەریی زیاتر. ئەو رۆشنگـەرییـەی نالیی خـۆشبـەخـتکردووە و شـتـەکـانی بۆ روونکردۆتەوە ئەوەیە کـە «پلە و توانای تێگەیشـتنی ئینسـان» بەرز دەکـاتەوە تا سـەر ئاسـتی تێگەیشتن لە حـەیوانەکـانی دیکە و بەمـەش «سنووری تێگەیشتن» بەشێوەیەکی گشـتی، بەرفـروان دەکات. لە ئەنجامی ئەمەشەوە، شـاعیـرەکەمـان هەم خـۆی و هەم حـەیوانێکی دیکە بەجۆرێکی تر کـەشفـدەکـاتەوە، پاشانیش لە ئاکـامی ئەم کـەشفکردنەوەیەدا بە زانینێکی دیکە دەگـات کـە یەکسـانبـوونی خـۆیەتی لە جەوهەری «حەیوانیەت»دا لەگەڵ کەر.

نالی لەگەڵ تێڕوانینی ئامرازگەرایانەی کانت و دیکارتیشدا بۆ سروشت و حەیوانات، دەکەوێتە ناکۆکییەوە، چونکە نە خۆی تەسلیمی مرۆڤپەرستییە سنووردارەکەی کانت دەکـات و تیـۆلۆژیا بەرهەمدەهێنێتەوە و خـۆی بەدەست

ریوایەتی ئایینیی خوڵقەتەوە دەدات، نە وەکو دیکارتیش «ئاگایی» دەکاتە پارسەنگی جیابوونەوەی ئینسان لە حەیوان. نالی لەلایەکەوە، (وەک لە شوێنێکی دیکەی ئەم باسەدا بینیمان) «خود» دەبەخشێتە حەیوان و ئەم خودە حەیوانییەش خودێکی ئاگا و قسەکەرە و جەوهەری بیری شیعرەکەش هەر لەسەر زاری ئەم «خود»ەوە بە ئێمە دەگات: «هەردو حەیوانین، ئەتۆ گوێ کورت و ئەمنیش گوێ درێژ».

ناکرێ لێرەدا راناوی تاکی قسەکەر کە بە «ئەمن» تەعبیری لێکراوە، راناوی قسەکەرێکی ئاگا نەبێ، چونکە خەبەری «هەردوو حەیوانین» و گوزارەی «ئەتۆ گوێ کورت و ئەمنیش گوێ درێژ» لەسەر بنەمای جیاکردنەوەی «من»ی قسەکەر و «تۆ»ی قسەبۆکراوەوە هاتووە، کە ئەم جیاکردنەوەیە لەهەمان کاتیشدا هەڵگری ئاستێکی ئاگاییە لەسەر جیاوازیی ئەو «من» و «تۆ»یە وەکو دوو یەکەی سەربەخۆی زیندوو. ئەمە جگە لەوەی نالی بە هیچ جۆرێک حەیوان وەکو ئامێرێکی ئاڵۆز نابینێ و بگرە لە ئاستێکی ئەوتۆدا دەیبینێ کە بە «زمانێکی حاڵی» هەستیاریی خۆی بۆ ئینسان دەردەبڕێت.

بەڵام دیسانەوە دەمەوێت بڵێم، لەدوای هەموو ئەم تەئویلانە ئێمە هێشتا لەبەردەم دەقێکی نووسراوداین و هەرچی پێمان گەیشتووە و دەتوانین تەئویلی بکەین، شتێکە لەسەر کاغەز پێمان گەیشتووە. لەبەرئەوە هەر گوتنێ لەمبارەیەوە بە هەڵواسراوی و لە ژێر گوماندا دەمێنێتەوە، یەک شت نەبێ، ئەویش ئەوەیە کە ئێمە سەروکارمان لەگەڵ دنیای شاعیرێکدا هەیە کە بەچەندین فرسەخی زەمەنی لێمانەوە دوورە، بۆیە بەهیچ شێوەیەک ناتوانین بانگەشەی ئەوە بکەین، کە خوێندنەوەکانی ئێمە بریتین لە بەرهەمهێنانەوەی حەقیقەتی دنیای ئەو شاعیرە. لە راستیدا هەر هەوڵدانێکی ئێمە بەئاراستەی بەرهەمهێنانەوەی حەقیقەتی دەقی شاعیرێکی وەکو نالی، چ سوودێکی نابێت ئەگەر لەهەمان کاتدا نەمانەوێ لەو رێگەیەوە دنیای

خۆشمان بەرهەمبهێنینەوە. بۆیە کاتێ من دەنووسم، ناکرێ ئەم شیعرەی نالی وەکو مانیفێستێک لە پێناوی گیانەوەردۆستیدا بخوێنینەوە، مەبەست ئەوە نییە هێزی شیعرەکە لەم پێناوەدا لاواز بکەم. بەڵکو دەمەوێت جەختبکەمەوە لەسەر ئەو جیهانبینییە شیعرییەی کە لێرەدا بە پلەی یەکەم لەسەر ئینسان بەرجەستە بووە و لەگەڵ جیهانبینیی ناو دەقەکانی دیکەی هەمان شاعیردا وێکدێتەوە.

کەواتە ئێستا کاتی ئەوە هاتووە بڵێم: نالی لەئەنجامی بیرکردنەوە لە ئینسان، بیر لە حەیوان دەکاتەوە و لەوێشدا حەیوانێک هەڵدەبژێرێ کە مرۆڤ توانایەکی زۆری عەقڵیی خۆی بەکار هێناوە تاکو لەو نەچێت و بەو بەراورد نەکرێت و بەناوی کەرەوە بانگ نەکرێ! کەچی نالی ڕێک دێت لە دژی ئەم توانا عەقڵییە ئیشدەکات و عەقڵێکی دژ دەخاتە کار، نەک هەر تەنیا بەمەبەستی بەئینسانکردنی حەیوان، بەڵکو زیاتر بەمەبەستی پێبەخشینەوەی ڕەهەندی ئینسانییانە بە مرۆڤ. ئەمەشمان لەو خاڵانەدا بۆ دەرکەوت کە مرۆڤدۆستیی نالی لەو مرۆڤدۆستییە جیا دەکەنەوە، کە لەسەر دیدێکی ئامرازگەراوە دروستبووە و بەهۆی پشت بەستنی بە تەکنەلۆژیا و ئامێر، پەیوەندیی نێوان ئینسان و سروشت و ئینسان و بوونەوەرەکانی دیکەی ناو سروشت ئاڵۆز دەکات و دواجار بەیەکتریان نامۆ دەکا.

لەدوای ئەم شیعرەوە هیچ خۆش نییە ئینسان بێت و دنیات پڕکردبێ لە توندوتیژی و باروت و ئەڵغام، چونکە هەموو ئەمانە نیشانەی بێ عەقڵییەکی کوشندەن، نیشانەی نائامادەیی عەقڵێکی دژن، ئەوکاتەش کێ سنووری نێوان کەر و عاقڵ، مرۆڤ و حەیوان دیاری دەکات؟ کەس بەتەما نەبێت چیدی لەم زەمانەیەدا کەرە بەرەڵڵاکان بێنە گۆ و ئێمەش لە زمانیان حاڵی ببین، چونکە چیدی گوێیەکی بیسەر نەماوە تێیان بگات و ئەوانیش تاسەر ئێسقان بە تەقینەوەی ئەڵغامەکان بریندارن و بستێ سەوزاییش نەماوە بۆنی باروتی نەگرتبێ و پڕ نەبێت لە پارچە تەل و لەگەڵ هەر پارووێ گژ وگیادا مشتێ قاپۆڕی فیشەک نەچێتە گەروویانەوە. گومانم هەیە لەوەی

چیدی کەرەکان جەوهەری حەیوانیی خۆیان لەگەڵ درندەیی ئینساندا بەش بکەن، رەنگە ئەوکاتانەی حەیوانەکان بیرمان لێدەکەنەوە، لەبەر خۆیانەوە، بەقێزەوە لەرستەیەک زیاتر هیچیترمان پێنەڵێن: مرۆڤ بەم هەموو عەقڵەوە لە چ تەنیاییەکی کوشندەدا دەژی!

**کۆپنهاگن، هەولێر: ١٩٩٧-٢٠٠٠**

# شاعیرێک لەنێوان دوو تێکشکاندا

ئەو دەوروبەرەی نالی تیایدا گەشەی کردووە، لە مەنهەجدا پاشەڕۆژێکی روونی بۆ مرۆڤی کورد لەبەرچاو گرتبوو. ئەمارەتی بابان وەک یەکێ لە دوا ئەمارەتەکان و بنکەی دەسەڵاتداریتیی کورد، ئالێرەدا چەند قات گرنگیی بەخۆیەوە دەگرێت. چونکە بە نەمانی ئەم دەسەڵاتە کوردییە، دەسەڵاتی ناوچەیی و بێگانەکان، گەر تا ساتەوەختی بابان ناڕاستەوخۆ لە قەڵەمڕەوە کوردییەکاندا رۆڵێکیان هەبووبێ، ئەوا بە لەناوچوونی بابان راستەوخۆ بەتۆپزی دێنە ناوەوە و کەوشەنان دەشکێنن.

هەر رەنگە ترسیش بووبێت لە دەسەڵاتە راستەوخۆکانی بێگانە کە وایان لە مرۆڤی ئێمە کردبێت پابەندی دەسەڵاتی خۆیی بن. واتە کۆنەستی مرۆڤی کورد، بەتایبەتی لەدوای سەردەمی حوکمداریتیی عەبدولڕەحمان پاشادا (١٧٨٩-١٨٢٣) پێشبینییەکی لەبابەتی هاتنەوەی دەسەڵاتی راستەوخۆی بێگانەدا کردبێت، کە دواجار ئەم پێشبینییە لە ئەفراندنی هاوپەیمانییەکی نهێنیی کورداندا، یاخود ئەگەر بمانەوێ بە زمانی ماکس ڤیبەر بدوێین، لە هێنانە کایەی هاوپەیمانییەکی نادیاردا دەورێکی گرنگی دیتووە. پێدەچێت ئەمە یەکێک بێت لە خاڵی ئەو جیاوازییانەی لەنێوان بیرکردنەوەی سیاسیی دەسەڵاتی خۆیی ئەو دەمەو عەقڵی سیاسیی ئێستاماندا هەیە. بە زمانێکی دیکە، ئەگەر ترس لە هێزی بێگانە و بەرەنگاربوونەوەی دەبێتە هۆی بەهێزکردنی هاوپەیمانیی نادیاری کورد، ئەوا لە جیهانی ئەم سەردەمەی ئێستادا، لەگەڵ ئامادەبوونی مەترسیی راستەو/ناڕاستەوخۆی بێگانەیش، عەقڵی سیاسیی ئێمە نەیتوانیوە هەستی ئەو هاوپەیمانێتییە نادیارە بەپێی هەلومەرجی ئێستا پتەو بکات و رۆحێکی هاوچەرخانەی بکاتەوە بەبەردا.

ئەگەرچی ئێمە دەزانین لەسەردەمی نێوبراودا (عەبدولڕحمان پاشا)

ململانێ و ناکۆکی و ناتەبایی لەنێوخۆی دەزگای دەسەڵاتدا بەردەوامە، بەڵام ئەم ململانێ و ناتەباییە نابێتە هۆی لەبیرکردنی دەسەڵاتی بێگانە و نەبانبوونی کوردان لە دەسەڵاتی خۆماڵی. بەڵگەی ئەم سەرنجەمان لەو دەربڕینەی «ئەدمۆنز»ەوە دێتە دەست کە بەماوەیەکی زۆر، پاش نەمانی دەسەڵاتی ناوبراو نووسیویەو دەڵێت:

«... وەک دیارە حوکمەتی عەبدولڕەحمان پاشا، تا رۆژگاری ئێمەش درێژەی هەیە و وێڕای ئەو کەندوکۆسپانەی لێیان رەتبووە هێشتاش لە زەین و بیرەوەریی خەڵکی ناوچەکەدا وەک دەورانی سەربەخۆیی کورد یادی دەکرێتەوە» (١).

شتێکی ئاشکرایە ناکۆکیی نێوخۆی میرەکانی بابان نەدەبووە هۆی مەترسی خستنەوە و لەناوبردنی ئەو ناسنامەیەی کورد تا ئەوەدەمە بۆخۆی دروستی کردبوو. بەڵام دەسەڵاتێکی دەرەکی ترسی هەرچی زۆرتر لەنێوبردنی ئەو ناسنامەیەی دەخستە دڵەوە. بۆیە لە ناخی مرۆڤی ئێمەدا هەر میرێکی بابانی دەسەڵاتی گرتبێتە دەست (ئەگەرچی ئەم دەسەڵات بەدەستهێنانە لەسەر حسابی بەقەڵبەدادانی میری پێشوویشەوە هاتبێ) جیاوازیی نەبووە و دواجار جێگەی پەسەند بووە. ئەو دەسەڵاتگرتنەدەستە رەوەندێک نەبووە تێکشکانی ناوەوەی مرۆڤی کوردی بەدوادا بێت. دیارە لەبەرامبەر ئەم دۆخەدا کۆتاییهاتن بەدەسەڵاتی خۆیی و جێگرتنەوەی لەلایەن هێزی بێگانەوە، ئەو رەوەندە بووە کە هەرەسی بە ناوەوەی دەروونی ئینسانی کورد هێناوە.

ئەم هەرەسە بەپلەی یەکەم هەرەسهێنانێکی فەرهەنگی بووە، تێکشکانێک بووە مرۆڤی کوردی لە ناسنامە تازەکەی (ئەو ناسنامەیەی پاش چەندین سەدە لە دوای هاتنی ئیسلام و تێکشکانی یەکەم ناسنامە هاتە ئاراوە)، نامۆ کرد. بەڕای کەسانێکیش دەبێت ئەو ناسنامەی یەکەمە لە چوارچێوەی ئایینی زەردەشتیدا بۆ کورد پێکهاتبێ. با کەمێ لەسەر ئەم خاڵە بوەستین:

زەردەشتیەت خۆی لە بنەمایدا سەرجەمێک و پێکهاتەیەک بووە لەو ئایین و بیروباوەڕانەی هەر لە مێژەوە دەنێو گەلانی ئێراندا برەویان هەبووە. واتە وەک (ڤالتەر هێنینگ) دەڵێت : سێ رەگەزی دیکەی ئایینیش لە پێکهێنانی زەردەشتیەتدا رۆڵی گرنگیان گێڕاوە(٢). بۆیە ئەگەر لەسەر ئەوە ڕێکەوتین کە زەردەشتیەت یەکەم ناسنامەی کولتووری ئێمەی لێکەوتۆتەوە؛ دەبێ ئەوەشمان لەلا روون بێت کە هەمان ئایین ناسنامەی کولتووریی گەلانی دیکەی ناوچەکەشی پێکدەهێنا و کاتێ ئەم ئایینە (بەپێی مێژووی ئەفسانە و حەماسی) لە سەردەمی خوێنرێژێکی وەکو (گوشتاسپ)دا بووە ئایینی رەسمی، ئەوا بەیەک چاو مامەڵەی لەگەڵ ئەو گەلانەدا پێکراوە.

کەواتە دەبێت بە گرنگیپێدانەوە پەنجەنومای ئەوە بکەین کە بەهاتنی ئیسلام و سەپاندنی ناسنامەی بوون بە مسوڵمان، کورد دوو باجی لەلایەن دەسەڵاتی دەرەکییەوە لێسەندرا. یەکەمیان باجی جیابوونەوە بوو لە گەلانی ناوچەکە، دووەمیشیان باجی بەخودنامۆبوونی کوردبوو لە ئاست فەرهەنگی هاوبەشی خۆیی و ئەو گەلانەدا، کە ئەو فەرهەنگە هاوبەشەش زەردەشتیەت بوو.

پێدەچێت گرنگیی ئەم ساتەوەختە لەوەدا بێت کە کورد پێویستیی بە چەندین سەدە هەبوو تابتوانێت جێگرەوەیەک بۆ دابڕانەکەی خولق بکاتەوە و لەهەمان کاتیشدا پرۆسەی جیابوونەوە لە گەلانی دیکەی ناوچەکە بەردەوامبێت. ئەو جێگرەوەیە کە دوای ئەو ماوە زۆرە کورد بۆخۆی دروستیکرد لە پێکهێنانی ئەو ئەمارەت و حوکمە ناوچەییانە (بەڵام خۆماڵییانە)بوون، کە ئەگەرچی لە ژێر دەسەڵاتی ئایدیۆلۆژیای ئیسلامدا کاریان دەکرد، بەڵام توانییان ئەو خەمی بێ پشت و پەناییە لەلای ئینسانی کورد بڕەوێننەوە. دیارە ئەمەش خەمێک بوو لەدوای دابڕبوونی ئەم میللەتە لە ناسنامەی هاوبەشی یەکەمی؛ دووچاری ببوو.

** ** **

گرنگیی بەردەوامبوونی دەسەڵاتە کوردییەکان لێرەدا دەردەکەوێت کە چۆن (بەچاوپۆشینیش لە ئیسلامێتییان) جارێکی دیکە لە زەین و فەنتازیای تێکشکاوی کورددا، هێزی بڕوابەخۆبوون و هەستانەوەیان دروستکردەوە. بێگومان دەشێت لەو قسانەی سەرەوە ئەنجامی ئەوە بهێنرێتە دەست و بگوترێ: کەوابێ دەبوو ئیسلام بهاتبا تاکو کورد لە ناسنامەی خۆی، یاخود لە گرنگیی ئەوە ئاگادار بێتەوە کە پێویستە ناسنامەی سەربەخۆیی هەبێت. دیارە ئەم ئاکامە تائەو ئاستەی بۆ دژایەتیکردنی فەرهەنگی هاوبەشیی کورد لەگەڵ گەلانی دیکەی ئێرانیدا بەکار بهێنرێت و ئایینی ئیسلام و هاتنی بۆ ناو ئێمە بە هێزێکی رزگارکەر لەقەڵەم بدات، ئاکامێکی راستە. بەڵام بەلای منەوە، هاتنی ئیسلام و ئامادەبوونی لە کۆمەڵی ئەو دەمەی ئێمەدا شێوازێکی داگیرکارانەی هەبووە و لێرەیشەوە وەکو هێزێکی داگیرکار لە ناسنامەی پێشووی خۆمانی ئاگادار کردووینەتەوە. بۆیە ئەوەی لێرەدا بەلای منەوە گرنگە خودی پرۆسەی ئاگاداربوونەوەکەیە، نەک ئەوەی کێ و چ هێزێک ئاگاداری کردووینەتەوە.

ئاراستەی ئەم ئاگاداربوونەوەیە خەسڵەتێکی ئایندەخوازانەی تێدا بەدی دەکرێت نەک خەسڵەتێکی رابردووخوازانە، بابزانین چۆن؟

مەبەستم لەخەسڵەتی ئایندەخوازانە لەجەوهەری پرۆسەی ئاگاداربوونەوەکەدا، ئەوەیە کە خودی ئاگاداربوونەوەکە مرۆڤی کوردی دنە نەدا تاکو هەوڵبدات ناسنامە لەدەستچووەکەی بەدەست بهێنێتەوە و وزەی خۆی بۆ زیندووکردنەوەی بەهایەکی لەدەست دەرچوو تەرخان بکات و لە سەرابیی نۆستالیژیادا ئاوارە ببێت. بەڵکو خەسڵەتی ئایندەخوازانەی ئاگادارکردنەوەکە، هێزی رەتکردنەوەی یەکجارەکیی ناسنامەی یەکەمیشی لە خۆیدا شاردبۆوە. هیچ دوور نییە ئەمە لەبەر ئەوە بووبێت، کە کورد چیدی بڕوای بە ناسنامەی هاوبەش نەمابێت و جۆرە هەوڵدانێک بووبێت بۆ سنوورکێشان و خۆ جیاکردنەوە. هەروەها تێکەڵبوونی زەردەشتیەت لەگەڵ دەسەڵاتی سیاسیی فەرمانڕەوا و لەو رێگەیەشەوە بەشداریکردن لە

سەرکوتکردنی خەڵکانی هەژاری ناوچەکەدا (کە ئەمە بەتایبەتی لە سەردەمی فەرمانڕەوایی هەخامەنشیان و ساسانیەکاندا دەبینرێ)، بەجارێ دڵی کوردیان لەو ناسنامە فەرهەنگییە هاوبەشە ڕەش کردبێت و چیدی وەکو ناسنامەیەک تەماشای نەکردبێ و بەشوێنی شانازی پێوەکردنی خۆی نەزانیبێت.

بەڵگەی ئەو لێخوردبوونەوەیەی پێشوو لە چاوگێڕانەوەیەک بە مێژووماندا خۆی پتەوتر دەکا: شایانی باسە ئێمە تا ڕۆژگاری ئەمڕۆ بەڵگەی ئەوتۆمان بەدەستەوە نییە باسی ئەوەمان بۆ بکات مرۆڤی کورد حەسرەتی بۆ «ڕۆژە خۆشەکان»ی خۆی لەپێش هاتنی ئیسلامدا خواردبێ. بەڵام با خێرا ئەوەش بڵێم کە نەبوونی بەڵگەیەکی ئەوتۆ نیشانەی ئەوە نییە ئیسلام بووە جێگرەوەیەکی ڕۆحی و فەرهەنگیی وەها پتەو کە هەموو نارەزاییەکی لای ئینسانی کورد کوشتبێت و وەڵامی هەموو خواستە فەرهەنگییەکانی دابێتەوە. چونکە ئیسلام خۆی لەسەر بنەمایەکی داگیرکارانەی هاوکات بە سووتاندن، لەناوبردن و شێواندنی ناسنامەی یەکەمی ئێمە هاتە ناوەوە. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ڕەوەندی ئاگادارکردنەوە، گیانی ڕەتکردنەوە (رفز) لای کورد پتەو دەکات و بەو ئاکامەی دەگەیەنێت، کە دەشێت کورد لەبەر دوو هۆ لەژێر سایەی ئایینی ئیسلامدا، چاو ببپۆشێ لە ناسنامەی یەکەمی هاوبەشی خۆی کە زەردەشتیەت بووە. هۆی یەکەم: لەبەر ئەوەی ناسنامەی یەکەم ناسنامەیەکی «هاوبەش» بووە و هۆی دووەمیش لەبەرئەوەی زەردەشتیەت ببووە «ئایینی دەسەڵات». چونکە خاڵی خۆ جیاکردنەوە لە پانتایی زەردەشتیەتدا بۆ کورد زۆر لاواز بووە، ئەمە لە کاتێکدا کورد ویستوویەتی خەسڵەتی جیابوونەوە لە خەسڵەتی ناسنامەی هاوبەش (لەسەر ئاستی ناسنامەی فەرهەنگی) بەهێزتر بێت.

نابێت ئەو شیکردنەوەیەی پێشوو وەها لێکبدرێتەوە کە ئێمە دەمانەوێ بڵێین ئیسلام خاڵی جیابوونەوەی پتەوکرد و کوردیش ئەمەی وەکو «هەنگ دۆزینەوە لەدارا» تەماشا کردووە. چونکە دواجار ئیسلامیش لەبەستنەوەی

کورد بەگەلانی ترەوە هەمان رۆڵی بینی کە پێشتر زەردەشتیەت سەبارەت بە کورد بینیبووی. بەڵام ئیسلام بۆ کورد خەسڵەتێکی تریشی (جگە لە ئاگادارکردنەوە) تێدابوو، کە هەوڵدەدەم لێرە بەدواوە سەرنجی بۆ رابکێشم.

بەپێی مێژوو، هەموو هەوڵدانی مرۆڤی ئێمە لەدوای هاتنی ئیسلامەوە بۆ کوردستان، رەگەزێکی هەوڵدانی بۆ پێکەوەنانی دەسەلاتگەلێکی خۆماڵیی تێدا بووە. ئەگەرچی دواجار ئەو دەسەلاتانە لە رووی ئایینی و لەوێشەوە لە رووی ئیدارییەوە گرێدراو بوون. لێرەدا نابێت رۆڵی ئاگایی کورد و پلەی گرنگیپێدانی ئەو ئاگاییە بە رۆڵی «خاک»ـەوە لەیاد بکرێت. ئاگایی بەرامبەر بە خاک و مانەوەی کورد لەسەر خاکی خۆی، هەمیشە لە قەبووڵکردن، یان نەکردنی دەسەلاتی بێگانە و هەبوونی ناسنامەی هاوبەش گرنگتر تەماشای کراوە. کورد لێرەوە یەکێکە لەو نەتەوانەی کە لەبەر مانەوەی لەسەر خاک، چاوپۆشی لە زۆر مافی دیکەی خۆی کردووە و بە راستی میللەتێکی «خاکی»یە! بۆیە پابەندی و گرێدراویی دەسەلاتە کوردییە خۆماڵییەکان بە چەقێکی دەسەلاتی هێزی بێگانەوە، پرسیاری ئەوتۆی لە زەینی کورددا سەبارەت بە قۆناغی هاتنی ئیسلامیش دروستنەکردووە و ویژدانی مرۆڤی ئێمەی نەخستۆتە عەزابەوە.

هەوڵدان بۆ پێکهێنانی دەسەلاتی خۆماڵی (وێرای گرێدراویی ئەو دەسەلاتەش)، لەو سەرچاوەیەوە ئاوی خواردۆتەوە کە، ئەوەی هاتۆتە خاکی کوردەوە لە رێگەی زەبروزەنگ و دەسەلاتەوە هاتووە. بە دەربڕینێکی دیکە دەتوانین بڵێین، هاتنی داگیرکارانەی دەرەوە بۆتە هۆی ئەفراندن و گەشەپێدانی حەزی داگیرکارانە لەناوەوەشدا. یاخود دەسەلاتی دژی لەدەرەوە هاتوو (کە لە نموونەکەی ئێمەدا ئیسلامە) بۆتە هۆی پتەوکردنی دەسەلاتی دژ لە ناوەوە، کەئەمەی دواییان بریتییە لەو ناسنامە تازەیەی مرۆڤی کورد لەدوای هاتنی ئیسلامەوە هەوڵی بۆ پێکهێنانی داوەو دواجار لە شێوەی ئەمارەتە کوردییەکاندا شوێنی بۆ کردۆتەوە.

بەم پێیە بوونی ئەمارەتەکان، لەگەڵ مانەوەشیان لەناو بازنەی دەسەلاتی

ئیسلامدا، پەیوەندیی بە حەزی تاکەکەسیی میرە کوردەکانەوە نەبووە، بەڵکو پەیوەندیی هەبووە بە جێبەجێکردنی میکانیزم و پوختەی ئەو پەیمانە نادیارە بەکۆمەڵییەی کورد لە ئاست دوو فاکتەردا: یەکەم، رەتکردنەوەی بیری گەڕانەوە بۆ «ناسنامەی یەکەمی هاوبەش»، واتە زەردەشتیەت، ئەویش لەبەر هۆی هاوبەشیبوون و بەرەسمی بوونی ئەو ئایینە. دووەمیش: لە دژی دەسەڵاتداریێتیی راستەوخۆی سەردارە مسوڵمانە بێگانەکان و قاییلبوون بە میرانی کورد و قەڵەمڕەوی دەسەڵاتیان، ئەمەش بەچاوپۆشین لە گرێدراوەیی و ئاژاوەی نێوخۆییان لەسەر میرایەتی.

بەڵگەی ئەو تەئویلانەی پێشوو تەنیا لە شیکردنەوە و چاوگێڕانەوەیەکی ورد بە خەباتی مرۆڤی کورد دژی دەسەڵاتی بێگانەدا، دێتە دەست. هیچ یەکێ لە بزووتنەوەکانی کورد لەساتەوەختی دوا ئەمارەتی کوردییەوە، واتە لەساتەوەختی «تێکشکانی دووەمەوە» بۆ ئەوە نەهاتوون، بۆ نموونە: زەردەشتیەت بکەنەوە ناسنامەی رەسەنی کورد. بەڵام هەردەم خەسڵەتی زیندووکردنەوە و گەڕانەوەیان بۆ «ناسنامەی دووەم»، واتە بۆ ئەو ناسنامەیەی کورد لە چوارچێوەی ئەمارەت و دەسەڵاتی خۆماڵیدا بەرجەستەی کردبوو، تێدا دەبینرێت.

** ** **

لەدەستدانی یەک لەدوای یەکی ئەمارەتەکان، مرۆڤی کوردی بەجارێ بێئومێد و بێچارەنووس کرد.ناڵەی ئەم مرۆڤە بە درێژایی دوو/سێ سەدەی رابردوو، هەردەم ناڵەبووە بۆ ئەو نیشانە و سیمبولەی لەدوای (تێکشکان/ رەتکردنەوە یان جودابوونەوە) لە ناسنامەی یەکەمی هاوبەشەوە، لە رێگەیەوە خۆی پێناسە دەکرد.

لەڕاستیدا خەسڵەتی ئایندەخوازانە لە جیهانبینیی ئێمەدا پاش لەدەستدانی ناسنامەی یەکەم، بەشێوەیەک لەشێوەکان مرۆڤی کوردی لە ریشەکانی رابردووی فەرهەنگیی رەسەنی خۆی داماڵیوە. ئەگەر خەسڵەتی

ئایندەخــوازی لەدوای هاتنی ئایینی ئیــســلامــەوە نەبایەتە یەکێ لەخەسڵەتەکانی دنیابینیی کورد، بێگومان ئێستا نەرێتە فەرهەنگییەکانی ئەو ژینگەیەی زەردەشتیەتی تێدا لەدایک بوو (بەحوکمی ئەوەی کوردیش لەهەمان ژینگەدا ژیانی بەسەر دەبرد) بەشێوەیەکی پتەوتر لە جیهانبینیی ئێمەدا ئامادە دەبوون و ئەو بۆشایی بێناسنامەییە لە ساتەوەختی هاتنی ئیسلام و پاشان لەساتەوەختی رووخانی دوا ئەمارەتی کوردییەوە، هێندە پتەو لە بیر و عەقڵماندا ئامادە نەدەبوو.

راستە ئێمە بە رمانی دوا ئەمارەت جارێکی دی لە ناسنامەی خۆمان ئاگادار بووینەوە، بەڵام هەرگیز بیرمان لەوە نەکردەوە بەو ئاسانییەی کە ناسنامەی هاوبەشیی یەکەمان لە پاش پرۆسەی ئاگاداربوونەوە، رەتکردەوە، ناسنامەی دووەمیشمان توورِ هەڵدەین. چونکە ئەمەی دواییان بەهەر حاڵ شتێ بوو توخمی خۆماڵییانەی پێوە بوو. ئەنجامی بەرەنگاربوونەوە و هەوڵدان بوو، شتێک نەبوو مەحکووم کرابێتین بە قەبووڵکردنی و هتد. هەر بۆیەشــە هەتا ئێــســتــاش نرخی ئەوەی هەیە وەکــو بەڵگەی هەبوونی «هاوپەیمانێتیی نادیاری کورد لەگەڵ خۆی» ئاورِی لێبدرێتەوە. ئەمەش لەگەڵ هەمــوو ئەو زانیارییانەی کە لەسەر شێوەی بەرێوەچوونی ئیداریی ئەو ناسنامەیە لەبەردەستماندان و ئاشکرای دەکەن کە هێندەش لە رووی سیاسییەوە تۆکمە و بێ کێشە نەبووە، بەڵام هێشتا بەهای خۆی وەک بەڵگەیەک بۆ هەوڵی خۆ ئیدارەکردنی کورد و بەخۆماڵیکردنی ناسنامەکەی، نەدۆرِاندووە.

ئەگەر جورئەت بەخۆمان بدەین و ئەو دراوانەی پێشوو بە خوێندنەوەی ئێستای جیهانبینی مرۆڤی کورد لەژێر کاریگەرێتیی پرنسیپی «هاوپەیمانێتیی نادیار»دا بهێنینە مەودای کارپێکردنەوە، (لەهەمان کاتیشدا گومانمان لەئاست پلەی زانستیبوونیاندا نەدۆرِێنین) ئەوا دەتوانین بەکورتی دوو خەسڵەتی دووبارەوە بوو، دەستنیشان بکەین.

ئەگەر کورد لەبەر خەسڵەتی «هاوبەشیبوون» و «تێکەڵاوبوون»ی

زەردەشتیەت بە سیاسەت، توانیبێتی لە پرۆسەی ئاگاداربوونەوە و لەوێشەوە ڕەتکردنەوەی ئەو ناسنامەیەی تێپەڕ ببێت، ئەی داخۆ بە چ مەرجێک ئەم ماوە دوورودرێژە چوارچێوەی کولتووری ئیسلامی پەسەند کردووە، کە هەردوو خەسڵەتی پێشووی بە نیسبەت کوردەوە تێدایە؟

دەتوانین ئەم پرسیارە پڕ مەترسییە بەشێوەیەکی دیکەش دابڕێژین و بڵێین: ئایا بوونی بزووتنەوەیەکی ئیسلامی لە کوردستاندا نیشانەی هەبوونی ریشەی کوردانەی ئەم ئایینەیە لە ناخی مرۆڤی ئێمەدا وەک وزەیەکی رۆحی و خۆماڵییانە، یاخود لەسەردەمی هەڵگەڕانەوەمان لە ئیسلام مەترسییەکی چاوەڕواننەکراو یەخەمان دەگرێت؟ ئایا لە کۆنەستی مرۆڤی کورددا، سەرەداوی یاخیبوون لەم ئایینە، بەتایبەتی لەشێوازی ئەمڕۆیدا بوونی نییە، کەتەنیا بەهەلێکی وەدەستهاتوو (لە نموونەی وەک سەربەخۆییەکی رەهادا کە کورد خاوەنی وڵات و دەوڵەتی نێونەتەوەیی خۆی بێت) ڕەتی بکاتەوە و خۆی لێجیابکاتەوە و ئایین ڕەوتی ئاسایی خۆی، واتە وەک تەقسێکی کۆمەڵایەتی و دینی وەربگرێتەوە؟ واتە کورد بکەوێتە سەر ڕێگای پێکهێنانی ناسنامەیەکی سەربەخۆ و ئیسلام تەنیا یەکێک بێت لە پایەکانی ناسنامەی فەرهەنگیمان و هەمان چارەنووسی تووش ببێت کە زەردەشتیەت لە پانتایی عەقڵی مرۆڤی ئێمەدا تووشی هات؟

خەسڵەتی دووەم کە من بەدرێژکراوەی هەمان خەسڵەتی یەکەمی دەزانم، لەساتەوەختی دروستبوونی دەسەڵاتی خۆماڵییەوە سەبارەت بە گرێدراوەیی ئەم دەسەڵاتە بە بێگانەوە هاتۆتە کۆنەستی مرۆڤی کوردەوە. مرۆڤی ئێمە نە لەسەردەمی ئەمارەتەکان و نە لەسەردەمی هاوچەرخیشدا پرسیاری گەورەی لەبەرامبەر وابەستەیی سیاسی و ئیداریی دەسەڵاتی خۆماڵییەوە لەلا دروستنەبووە. لەبەرامبەر ئەمەشدا عەقڵی سیاسیشمان لەئاستێکی وەهادا نەبووە بتوانێت ئەو بارودۆخە شیبکاتەوە. بۆیە تەماشا دەکەین ئەم میکانیزمە بەردەوامە و تەنیا جیاوازییەک لەوەدایە کە ئێمە ناچارین پنتی وابەستەبوونەکانمان بگۆڕین و هیچیتر. بەڵام ئایا لە بارودۆخی تێکشکانی

سێهەمدا، کە شتێکە دەبێت نەهێڵێن رووبدات، کورد پرسیار لەچی دەکات و پێوانەی هەڵسەنگاندنەکانی بە چ بارێکدا دەگۆڕێت و چۆن بڕیاری ئایندەی خۆی دەدات؟

ئێستا بەدوای ئەو رۆچوونەدا دەگەڕێمەوە سەرەتای باسەکە و سەرهەڵدانی زاتێکی وەکو نالی دەبەستمەوە بە تێکشکانی دووەمەوە: نالی باشترین بەڵگەیە بۆ وێرانبوونی ناخی مرۆڤی کورد لە دوای تێکشکانی دووەم و بەرەنجامی بەئاگاهاتنەوەی دووەمانە. ئەو رۆحێکی سەرگەردانە کە پاش ئاگاداربوونەوەی یەکەم، توانیی بە ئومێدی ئایندەوە بژی و لەپاش تێکشکانی دووەمیش بوو بە دوو بەشەوە: بەشی یەکەمی ئەو رۆحە سەرگەردانە «دڵبەخۆخۆشکەرێکی مەستە» و شانازی بە رۆژە خۆشەکانییەوە دەکات و جیهان لەشێوەی کەرنەڤاڵێکدا دەبینێ. بەشی دووەمیشی، نەفسێکی بێدەنگە کە «خەمی خۆیی و خەمی هەموو عالەم» دەخوات و حەسرەتی بۆ رۆژگارە خۆشەکان تێکەڵ بە خوێنی بووە و جاروبار لەپەناوە ئاوا دێتە گۆ:

لە سندووقی پڕی سینەم بترسە
کە ئاگر بەر بداتە تەخت و تابووت

**کۆپنهاگن: ١٩٩٣**

# پەراوێزەکانی چەمکی میتۆلۆژیا و جیهانبینیی نالی

## پەراوێزو سەرچاوەی بەشی یەکەم:

١- کاسیرر، ارنست. زبان و اسطوره، ترجمه محسن ثلاثی، چاپ اول ١٣٦٧ تهران.ص ص٤٠-٤٦ .

٢- هەمان سەچاوەی پێشوو. لێرەدا پێویستە بڵێم: کاسیرەر وەکو فەیلەسووفێکی نیوکانتی ناسراوە، بۆیە پێویستە خوێنەر ئاگاداری ئەوە بێت کە لێکۆڵینەوەی ناوبراو لە میتۆلۆژیا بە پێی مەنهەجێکی رەخنەییە.

3) Mircea Eliade: Myten om den evigetilbagekomst. Munksgaard, Copenhagen, 1996.

هەروەها:

هووك، صوئيل هنري. منعطف المخيلة البشرية- بحث في الاساطير. ترجمة: صبحي حديدي. الطبعة الاولي ١٩٨٣ اللاذقية. ص٩ و ص١٤ .

٤- اليادة، ميرسيا: المقدس و الدنيوي، رمزية الطقس والاسطورة. ترجمة: نهاد خياطة. الطبعة الاولى ١٩٧٨، دمشق. ص ص. ٩٠-٩١ .

٥- اليادہ، مرچا: چشم اندازهاي اسطورہ. ترجمه جلال ستاری. زمستان ١٣٦٢ تهران. ص.ص ١٤-١٥ .

٦- داریوش شایگان، بت های ذهنی و خاطره ازلی. چاپ اول ,٢٥٣٥ سپهر تهران ص ١٠٥ .

٧- هەر ئەوێ.

٨- «لاوۆتسۆ» دامەزرێنەری ئایینی (تائۆ)= Tao لە سەدەی شەشەمی بەر لە زایین دا

ژیاوە بە روونی هێمای بۆ ئەم گەڕانەوەیە کردووەو دەڵێت: «بووە جۆراو جۆرەکانی گیتی سەرجەم دەگەڕێنەوە بۆ لای رەگوریشەی خۆیان. چونکە گەڕانەوە بۆ رەگوریشە خۆدۆزینەوەیە لە ئارامیدا، خۆ دیتنەوەش لە ئارامیدا، گەیشتنە بە یاساو رێکخستن، یاسایش، رێگەیەکە بۆ نیشتەجێ بوون و جێگیری، دیارە جێگیربوونیش رۆشنایی و ئیشراقە». بڕوانە سەرچاوەی پێشوو ل ١٦٩ .

٩- کارەساتی «کەربەلا» کە شیعەکان یادی دەکەنەوە، نموونەیەکی زیندووی ئەو خۆبەستنەوەیە بە رۆژگارو سەردەمی پیرۆزەوە تا بەو جۆرە ئامادەبوونی خۆیان لە کارەساتەکەدا پیشان بدەن و ئەم سەردەمەش لەگەڵ ئەوێ دەمدا گرێ بدەن. بڕوانە مقدمەء بر فلسفەای از تاریخ. ص ٨١-١٣٢ . (پەراوێزی سێیەمی ئەم باسە).

١٠- سەرچاوەی پێشووتر، لاپەڕە ١٤٤ .

١١- هەر ئەوێ ل. ١٧٥ .

١٢- هەمان لاپەڕە.

١٣- لە کتێبی «ریگ ڤیدا»دا، دوای ئەوەی پووروشا (Puroshah)وەکو سەرچاوەی هەموو بووەکان ناسدەکرێ و لەلایەن خواوەندەکانەوە دەکرێتە قوربانی، ئەندامەکانی لەشی لێک جوێ دەکرێنەوە، دەستەی «بەرەهمەن»ەکان، کە پارێزەری «یاسای پیرۆز»ن لە دەمیەوە دروست دەبن، چونکە دەم جێی هاتنە دەرەوەی «گوفتاری پیرۆز»ە. جەنگاوەرەکانیش بەو هۆیەوە نوێنەرایەتی هێزە دونیاییەکان دەکەن، لە قۆڵ و بازوویەوە دروست دەبن. چینی بازرگان و پیشەسازەکانیش لە ڕانەکانیەوە. هەرچی خزمەتکار و بەردەستیشن لە پێیەکانیەوە دەخوڵقێن.

ئیدی بەو جۆرە: لە بیرو ئەنێشەیەوە، مانگ دروست دەبێ، خۆر لە چاوانی، لە هەناسەیەوە خواوەندی با دروست دەبێت. سەریشی دەبێتە ئاسمان و خوارەوەیشی زەویی لێ دروست دەبێت... (بڕوانە سەرچاوەی سەرەوە، ل.١٨٤).

هەروەها

Mirca Eliade:

Det religiose Ideers historia(2) Pa dansk: Vag Duekila 1983.

١٤- داریوش شایگان: سەرچاوەی نێوبراو ل١٩٣ . ئاینزای شیعە ئەم تاجە نوورینە لەشێوەی «مانگ»ێکدا بە دەوری سەری ئیمامی عەلیدا دەنەخشێنن.

## پەراوێزو سەرچاوەی بەشی دووەم:

١- بڕوانە: سەجادی، عـلاءالدین: مێـژووی ئەدەبی کـوردی، ١٩٥٢ چاپی کتێبـخانەی (سەیدیان) ل:٢٢٩-٢٣٣ . پێویستە ئەوە بگوترێ کە ئێمە داستانەکەمان بە کورت کراوەیی و بەرێنووسی باو نووسیوەتەوە.

٢- وشـەی (کـەیغـان)=(کـیـغـان) ئـەگەر لە ڕەچەڵەکدا تورکی نەبێت، ئەوە لـەگەڵ وشـەی (King)ی ئینگلیزییەوە نزیکییەکی تێدا بەدی دەکرێت.

٣- لادانی ڕووپۆش یاخـــود هەڵدانەوەی پەردە لەســـەر نهـــێنی و نەزانراو، لە زۆربەی ئەفسانەو داستانی میللی-ی گەلاندا ڕەنگی داوەتەوە. نزیکترین سەرچاوە لە ئێمەوە شانامەی فیردەوسییە. لەم داستانەدا، «گردافرید» لەگەڵ «سهراب»دا دەکەوێتە جەنگەوەو لەدوای هێنان و بردنی زۆر، ئەوجا سهراب دەتوانێ زرێکەی تێکشکێنێت و نهێنی گردافرید ئاشکرا بکات:

چو امد خروشان به تنگ او درش/ بجنبید و برداشت خود از سرش

رها شد ز بند زره موی اوی/ درفشان چو خورشید شد روی اوی

بدانست سهراب کو دختر است/ سرو موی او در افسرست.

بڕوانە ژۆل مـول: (شـاهنامـە فـردوسی-چاپی مـوسکو) بەرگی دووەم، ل٨٤ (لە بەیتی ٢٧بەرەودوا).

ترجمه جهانگیر افکاری چاپی سێیەم تاران ١٣٦٣

٤- بڕوانە: هەڵکەوت حەکیم: «چەند سەرنجێکی سەرەتایی دەربارەی دروستبوونی شاری سلێمانی» گۆڤاری (هیوا) ژ٢، مایسی ١٩٨٤ ل ٧٣ بۆ ٨٠ .

٥- لێرەدا ئێمە مەبەستمان لە ناوهێنانی (سلێمان) مەدلوولی ناوەکەیە، واتە ئەو مانایەی کـە وشەی (سلێـمان) دەلالەتی لێ دەکا... دەکرێ ئەم سلێـمان پێـغـەمـبـەرە بکەینە سلێـمان پاشا...هتد. ئەم سەرنجەمان لەسەر بنەمای میتۆدی مێرسیا ئێلیادە بۆ چەمکی (Helline-مقدس) سەرچاوە دەگرێ... ئەلیادە بڕوای وایە لە جیهـانبینی مرۆڤی ئایینییەوە، هەموو شتێک لایەنی پیرۆزیی(Hellie) خۆی هەیەو ئەم لایەنەش دەلالەتی تازە بۆ زمان قایل دەبێ. لێرەدا وشەی (سلێمان) هەر ناو نییە بۆ کەسێک، بەڵکو یادهێنانەوەی هەندێ شتی دیکەشە.

## پەراوێزو سەرچاوەی بەشی سێیەم:

(١) مەلا کەریم محمدی: نالی لە کلاورۆژنەی شیعرەکانیەوە. بەغدا ١٩٧٩، ل ٥٤

(٢) بڕوانە ئەو هەوڵە شایانەی جەمال بابان لە گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق (دەستەی کورد)دا، بەرگی ١٦-١٧-١٩٨٧: (نەخشەی شاری سلێمانی لەسەردەمی بابانەکاندا لەگەڵ ناوی حاکم و موتەسەرڕیفەکان) ل(٩١-١٣٥).

(٣) فرهنگ معین: ص ٢٦٥٥-٢٦٥٦. جلد دوم:(د-ق)

(٤) باشلار، گاستون:(روانکاوی اتش) بە تایبەتی ئەو پێشەکییە شایانەی جلال ستاری بۆ ئەو کتێبەی نووسیوە. ل ٣٥.(چاپی یەکەم-تهران ١٣٦٤)

(٥) دیوانی نالی. لێکۆڵینەوەی مەلا عبدالکریمی مدرس و فاتح عبدالکریم بەغدا ١٩٧٦ (ناشر: انتشارات صلاح الدین ایوبی) ١٣٦٤ تهران. ص ٩٧.

(٦) الیادە. مرسیا: المقدس والدنیوی. ص ٣٩. هەروەها: اسطوره بازگشت جاودانە- ترجمه بهمن سرکاراتی: چاپ اول ١٣٦٥. ص ٢٧- و بەرەودوا.

(٧) لەم بارەیەوە بڕوانە: سەرچاوەکانی کۆتایی ئەم باسە: بەتایبەت سەرچاوەی ٦,٣

(٨) معنی المدینة(عدد من الموالفون) ترجمة عادل العوا، دمشق ١٩٧٨.ص: ٣٠.

(٩) دیوانی نالی: ل.ل: ١٨٨-١٩٨ پەراوێزی ژمارە(٢٩).

## پەراوێز و سەرچاوەی بەشی چوارەم:

١- عەلائەدین سەجادی: مێژووی ئەدەبی کوردی،١٩٥٢، ل: ٢١٧

٢- دیوانی نالی..، ل: ٤١/ هەروەها بڕوانە: پێشەکی «چەپکێک لە گوڵزاری نالی» مامۆستا مەسعود محمد، بەغدا ١٩٧٦، لە بڵاوکراوەکانی کۆڕی زانیاری کورد.

٣- سالم دەفەرموێ:

میحنەت ئەوەندە زۆرە، دڵم هێندە تەنگ بووە

دوودی هەناسەی سەحەرم هەوری گرتە بەر،

سەیوان پڕە لە شەخصی ستەم دیدە خوار و ژوور

هەر قەبری پڕغەمانە لەهەر لا دەکەم نەضەر

تا دەڵێ:

توخوا بلێ بە حەزرەتی نالی دەخیلی بم

بەم نەوعە قەت نەکا بە سولەیمانیا گوزەر

بڕوانە: دیوانی نالی، ل: ١٩٩-٢٠١

٤- ئەم داخستنەوەی بازنەیە بە سەر خۆدا کە شێوەیەکی خۆ دفن کردنیشە، سۆزی گەڕانەوەشی تێدایە بۆ نێو نیعمەتی ڕەحمی دایک. ئەم بیرە لە مەقامەکانی (حەریری)دا بە شێوەیەکی دی داڕێژراوە: لەوێدا باس لە «نەهاتنە دنیاوە» دەکرێ، دنیا روخساری دژی ڕەحمی دایکە و پێویستە خۆی لێ بپارێزرێ. کەچی نالی پێچەوانەی ئەمە هەڵدەبژێرێ: واتە لە ئەنجامی ڕەفزکردنەوەی دنیاوە، پەنا بۆ ڕەحمی (دایک/ نیشتمان) دەباتەوە. واتە خۆی دفن دەکات و بەمەش جیهانی دەرەوەی خۆی جێدەهێڵێ. بڕوانە:کیلیطو، عبدالفتاح: الغائب، دراسة في مقامة للحريري: ط١/١٩٨٧ هەروەها: مسالة القراء: ط١٩٨٦ ص ٣٠.

٥- بڕوانە: مەلا کەریم، محەمەدی: نالی لە کلاوڕۆژنەی شیعرەکانیەوە: بەغداد ١٩٧٩،ل٥١

٦- حكيم، هلكوت: ابعاد ظهور الطريقة النقشبندية في كردستان في أوائل القرن التاسع عشر، مجلة دراسات كردية باريس،١ كانون الثاني ١٩٨٤

٧- سەرچاوەی بێشووتر : ل ٥٨، ٥٩

٨- دیارە ئەو نیشتمانەی لە سەردەمی حوکمی بابانەکاندا (بەهەشت) بوو. ئەو بەهەشتەش کە تەنیا لە ژێر سایەی حوکمی بەبەدا دەهاتە دی!

## تێبینیەک:

جگە لەو سەرچاوانەی لەهەر بەشێکی ئەم لێکۆڵینەوەیەدا ناویان هاتووە، کەم و زۆر سوود لەم چەند سەرچاوەیەش وەرگیراوە.


(١) فراي، نورثروب: نظرية الاساطير في النقد الادبي. ت.: حنا عبود، گ ١/١٩٨٧.

(٢) كدكنى ، شفيعى: صور خيال در شعر فارسى. چ: ٣، ١٣٦٦.

(٣) مفهوم شهر : گروه مطالعات شهرى و منطقه‌اى، تهران- ١٣٦٢.

(٤) الكرمل ٣٣، ص،ص ٢٢-٤٧.

(5) Lacan,J:
Det Obevidste sprog 1973.
(6) Kritik nr.(71) 1985 S. 61-69.
٧- العرب و الفكر العالمي : (٤) ، خريف ١٩٨٨-ص ص ١٣٩-١٥١.

# پەراوێز و سەرچاوەکانی مەستوورە لە روانگەیەکی ترەوە

## پەراوێز و سەرچاوەی بەشی یەکەم:

١- ئەمە هێماکردنێکی راگوزارییە و مەبەستیشم لەمە، تەنیا هێماکردنە بۆ بەرهەمی شیعریی شاعیرانی بە نێو بانگ، نەک ئەدەبیاتی میللی-ی میللەتانی جیاواز، بەڵام ئەگەر بمانەوێت هێماکردنەکە لە بۆتەی شیعر بکەینە دەرێ و لە بواری بەرهەمی بە پەخشان نووسراوی ئەو گەلانەدا بۆ باسی ئیرۆتیکای لەشی ئافرەت بگەڕێین، ئەوا تووشی چەندین بەرهەمی گرنگ دەبین، بە تایبەتی لای گەلی «هیندو چین» کە سوونەتێکی دێرینەیان لە بواری وێنەکێشانی ئیرۆتیکیانەدا هەیە.. لەلای نەتەوەی عەرەبیش هێندە بەسە ناوی کتێبە نایابەکەی (الشیخ النفزاوی: الروض العاطر فی نزهە الخاطر)، بهێنین کە سەرجەم تەرخانکراوە بۆ باسی ئیرۆتیکای ئیسلامی و چارەسەری شارەزایانی موسوڵمان بۆ کێشەکانی ئەم کایە گرنگەی ژیانی بەشەری.

٢- نصرالله پور جوادی: شیرین در چشمە (نشر دانش، ش، ٤ سال ١١/ ١٣٧٠ بەتایبەتی بڕوانە پەراوێزی ١٣ لاپەڕە: ٧ و ٩)

٣- مرتضی مطهری: نظام حقوق زن در اسلام (مسئلە حجاب) قم، ١٣٥٧، صص: ٢٤٣-٢٤٤.

٤- بڕوانە پەراوێزی (٢) ستوونی دووەم، لاپەڕە (٩).

٥- الکلینی: الاصول من الکافی، بەرگی دوو ط ٣، ص ١١٥، کە ئێمە لە (تێگەیشینە ئیسلامییەکان ((گرنگی وشە لە ئیسلامدا)): ص ١٩) وەرمان گرتووە؛ بەرهەمی بەشی کوردیی دامەزراوەی البلاغ.

٦- بۆیە ئەم کارەی نالی بە کارێکی ناخود ئاگایانە ناو دەبەم چونکە هیچ بەڵگەیەکمان بەدەستەوە نییە کە کارێک بوو بێت و شاعیر پێشتر نەخشەی ئاگایانەی بۆ دارشتبێ. «ناخود ئاگایی» لێرەدا بە پێی بەکارهێنانێکی (یونگ)ی بەکار هاتووە کە بریتییە لە مەخزەنی ئەسرار و زوو زوو پەیامەکانی بۆ بەشی ئاگاییمان دەنێرێ و ئاگاییمان کۆنترۆڵ دەکات.

٧- «پێدەچێت هەنگوین بێ دەرد و ساخ بێت و لەوەیشە ژاراوی بێت. بەهەمان شێوەش ئافرەت لە حاڵەتی ئاساییدا هەنگوینە، بەڵام لەکاتی بیماریدا، ژاری لێ دەتکێ: لوی شتراوس، منطق اساطیر، ص ٣٤٠ له (لوی استروس، نوشتەء ادموند لیچ ص: ١١١ و١٢ وەرگیراوە/ ت: دکتر حمید عنایت چ ٢، ١٣٥٨ تهران)

٨- لێرەدا بەهۆی بەکارهێنانی وشەی «شاعیر»وە دەمەوێ ئەو جوداییە پێشان بدەم کە من بۆ «نالی شاعیر» و «نالی-ی نێو خەونەکە»م لەبەرچاو گرتووە، بۆیە هەرکات لە بەشی یەکەمی ئەم باسەدا وشەی «شاعیر» بەکار دەهێنم، مەبەستم لە «نووسەرە» کە ئەویش دیارە مەلا خدرە و دەکەوێتە دەرەوەی رووداوە شیعرییەکانەوە و دەوری ریوایەتکردنیان دەبینێ، پاشان ئەم مەبەستە زیاتر روونکراوەتەوە.

٩- دەکرێ ئەم دێرە بە جۆرێکی تریش بخوێندرێتەوە و بگوترێ مەبەستی مەستوورە رەنگە ئەوە بێت کە نالی زانایەکی خۆمانەیە و بێگانە نییە، جا ئەگەر ئەو عوقدەکەم حەل بکات چ پێویستە پەنا بەرم بۆ زانایانی چین و خەتا و خوتەن کە بێگانەن.

١٠- د. محمد مفتاح: دینامیة النص (تنظیر و انجاز) ط ١٩٨٧ ص ٢٢ مرکز الثقافي العربي. بیروت.

١١- بڕوانە پێشەکیی ئەم کتێبە:

Annikki K. Bregenhøj: Drømme gennem tusinde år. Hernovs forlag, København 1986.

١٢- دیوانی نالی: لێکۆڵینەوە و لێکدانەوەی مەلا عەبدولکەریمی مودەریس و فاتیح عەبدولکەریم- محەمەدی مەلا کەریم پیاچۆتەوە. بەغدا ١٩٧٦، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد (انتشارات صلاح الدینی ایوبی ١٣٤٦). لەمەودوا تەنیا دەنووسرێ (دیوانی نالی).

١٣- بێگومان ئێمە چەند نموونەیەکمان پێشانداوە، خوێنەر خۆی دەتوانێ لە قەسیدەکەیدا نموونەی دی بدۆزێتەوە.

١٤- ئەم باسە بۆ خۆی هەڵدەگرێ لێکۆڵینەوەیەکی تایبەتی لەسەر بنووسرێ، بەڵام لێرەدا هەوڵ دەدەین بە نموونەیەکی خێرا و بە بێ قووڵبوونەوە لە هەموو لایەنەکانی مەبەستی خۆمان روون بکەینەوە.

کاتێک مەحوی دەفەرموێ:

فەلەک هەر گا کەسێکی هەڵبڕی، وەقتی هیلاکەتیە

کە سەر بۆ گەینە پەت بێ، پێ لە کورسی و ئەسکەمل چ بکا؟

ئێمە ناتوانین بەهۆی بەرجەستەکردنی وێنە شیعرییەکانی ئەم بەیتەوە لە نێوەرۆکەکەی حاڵی بین. واتە ناتوانین بەو هۆیەوە کە بێین لە خەیاڵی خۆماندا ئینسانێک دروست بکەین و ئەم ئینسانەش، یان ئەم کەسەش لە ساتەوەختی هەڵبڕینیدا بەدەستی فەلەک وێنە بگرین و پاشانیش ئەم دیمەنە بەدیمەنی «هەلاکەت»ی ئەو کەسە لێک بدەینەوە، یان بێین بیر لە سەروپەت و پێ و کورسی و هتد.. بکەینەوە و کۆتایی بە پرۆسەکە بهێنین. بەو مانایەی کە تەماشاکردنی دیمەنی شتەکان بۆ تێگەیشتن لەم بەیتە بەس نین، ئەگەر مانای کارکردی و رەهەندی عەقڵانیی ئەو وشانە نەهێنینە زەینی خۆمانەوە. یان کاتێک شاعیری هاوچەرخ حەسیب قەرەداخی دەڵێت:

دەڵێن: حەق وا بەسەر نووکی شمشێرەوە

دەڵێن: ئەگەر شمشێر نەبێ

ئەوا حەق وا لە ژێرەوە...

(فەرهەنگی خەم: ٣-ل ١٠)

خوێنەر بەوەی بێت و وشەی حەق لە وێنەی شتێکدا بکات بەسەر نووکی شمشێرەوە بە جۆرێ بە لابردنی شمشێرەکە حەقیش بکەوێتە ژێرەوە، کە وێنە شیعرییەکە فەرزی دەکات، راستە خەتای نەکردووە، بەڵام هیچ هەنگاوێکی بۆ تێگەیشتن لە ناوەرۆکی شیعرەکە نەناوە، چونکە وشەکانی وەک «حەق، شمشێر، سەر و ژێر»ی لە پەیوەندییەکی میکانیکییانەدا دیتووە، نەک ئەو کارکردەی شمشێر لەم کۆپلەیەدا هەیەتی. بۆ ئەوەی لەو پەیوەندی و لێکدانەوە میکانیکییەش دەرباز بین پێویستە «وێنەی شتەکان» تەفسیر بکەین بۆ «کارکردی شتەکان». بەو پێیەش، بۆ نموونە شمشێر دەبێتە هێز و ئیدی دێرەکانی تریش رەوتی عەقڵانی خۆیان وەردەگرن، بە کورتییەکەی لە کۆپلە شیعرێکی وەک ئەوەی سەرەوەدا خوێنەر ناتوانێت چێژ لە

بەرجەستەکردنی وێنەکان و پاشان تەماشا کردنیان وەربگرێت، ئەگەر دوا جار نەیەت ئەو وێنانە تەفسیر نەکاتەوە بۆ مانا.

١٥- دیوانی نالی، لاپەڕە ٦٢٩

## پەراوێز و سەرچاوەی بەشی دووەم

(١) بڕوانە: علاالدين سجادي: مێژووی ئەدەبی کوردی (ل ٢١٥)، دیوانی نالی(ل:٣٢) و(ل: ٥٩٦- پەراوێزی ١٠) هەروەها بڕوانە: محەمەدی مەلا کەریم: نالی لەکلاورۆژنەی شیعرەکانیەوە (ل: ٢٠تا ٣٢).

(٢) بڕوانە: التحليل النفسي من فرويد الى لاكان،(عدنان حب الله- ١٩٩٨ / مركز الانماء القومي ص ٢١).

(٣) بۆ ئاگاداری زیاتر لەم بوارەدا بڕوانە: سەرچاوەی پێشوو ل:١١٣، ١١٢ . هەروەها بڕوانە: کرامت موللی، مرد روانکاوی روانکاوی نامرد(دبیره، ش، ٢ زمستان ١٣٢٢ پاریس/ص ٧٥-٧٦ و لاپەڕەکانی تری ئەو باسە). پێویستە بڵێم زۆربەی ئەم زانیارییەم لەم سەرچاوەیەوە وەرگرتوون.

(٤) بڕوانە

Ole Thomsen: mandligt og Kvindeligt i grokerns Liv Kritik (65)/1983.

(٥) تەماشای موللی، لاپەڕە ٧٣-٧٤ بکە.

(٦) سيغموند فرويد: النظرية العامة للامراض العصابية(المحاضرة السادسة والعشرون «نظرية االلبيدو والنرجسية» ص ٢١١ -٢٣٣ /ت: جورج طرابيشي ط ١٩٨٦ . هەروەها هارکی ویلز: نقدی بر فرویدیسم از دیدەگا روانشناسی علمی(جلد ٢ ،ت: نصرلله کسرائیان/ چ دوم ١٣٢٦ .

(٧)و(٨) موللی: ٧٥.

(٩) هەمان سەرچاوە ل: ٧٥ و بەرەودوا. پاشان بڕوانە: مجله بيت الحكمه ،٨-ص :٦، ٩، ١٠، وص : ٦٠ و ٦٢ (تشكلات اللاوعى)

(١٠) موللی. ل: ٨٥

(*)(والماوي: هي التي بفرجها الماء الكثير): بڕوانة الشيخ النفزاوي: الروض العاطر في نزهة الخاطر، ص ١١٠(حققة و وضع هوامشه و علق عليه: جمال جمعة، ط١، ١٩٩٠ لندن).

(١١) دیوانی نالی ل:(٦٠٥ - ٦٠٦).

(١٢) ئەم رایەی پیرەمێرد لە رۆژنامەی(ژیان - ٢٩٣) رۆژی ١٦ ی ئەیلولی ١٩٣١، بڵاوکراوەتەوە. بڕوانە: دیوانی نالی ل: ٧٢١، دیوانی پیرەمێرد: بەرگی یەکەم(١٩٩٠) ل: ١٥٠(سوپاسی کاک فازیل کەریم ئەحمەد دەکەم، کە ئەم سەرچاوەیەی پێشکەش کردم).

(١٣) موللی. ل:٧٨

(١٤) هەر ئەوێ ل: ٨٨-٨٩ .

(١٥) محەمەدی مەلا کەریم: نالی لەکلاوڕۆژنەی شیعرەکانیەوە، ل:٨٨

## پەراوێزو سەرچاوەی بەشی سێهەم:

(١) محمەدی مەلا کەریم: نالی لە کلاوڕۆژنەی شیعرەکانیەوە، ل: ٣٦

(٢) دیوانی نالی، پێشەکی: (.. جا ئەگەر نالی لە سنە بووبێ و لەپاش شووکردنی مەستوورە ئەم قەسیدەیەی وتبێ، ئەوا بەپێی ئەو ساڵەی کە بۆ لەدایکبوونیان داناوە، واتە ١٢١٥ ی کۆچی ، ئەبێ ئەو دەمە «نالی» لەتەمەنی ٢٩- ٣٠ ساڵاندا بووبێ و لەوێ فەقێ بووبێ)، ل: ٧٢

(٣) مامۆستایانی لێکۆڵەرەوەی دیوانی نالی پشتیان بە(١٦) نوسخە لە دەستنووسەکانی دیوانی نالی بەستووە و لە سەرجەمی ئەو نوسخانەیشدا ئەم قەسیدەیەی نالی دووبارە بۆتەوە، کە ئەمەیش بەڵگەیەکی باشە بۆ بە ئاسایی بوونەکەی ئەم دەقە. سەیر لەوەدایە وەک لەلاپەڕە(٦٠٤) ی دیوانی نالی-دا هاتووە، دوو دانە لەو نوسخانە ئەم قەسیدەیان بە (قەسیدەی احتلامیە= قەسیدەی شەیتانی بوون) ناو بردووە.

(*) هەژار، هەمبانە بۆرینە. چ اول ١٣٦٨، ص:٣٣٥، تهران /سروش.

(٤) لەمبارەیەوە بڕوانە ئەو باسە پڕبایەخەی رۆژهەڵاتناسی ئەڵمانی بەنێوبانگ (هلموت ریتر: «نزاع دیوانگان باخدا»، نشر دانش: ٣، ١٣٦٦ ص: ٦-١٧).

## پەراوێزو سەرچاوەی بەشی چوارەم:

(١) بڕوانە: مەریوان و. قانع: «ڕۆشنبیریی کوردی و سیستەمی عیرفانی» گۆڤاری یەکگرتن، ژ. ١٦ی ١٩٩٦.

## سەرچاوەو پەراوێزی بەشی پاشکۆ و ئەنجام:

(١) سەرچاوەی سەرەکیی ئەم قسانەمان هەر ئەو لێکۆڵینەوەیەی مامۆستا جەمال بابانە، دڵنیام ئەگەر سەرچاوەکانی دیکەم لەبەر دەستا بوونایە، ئەم تێبینییانەیش روخسارێکی تریان بەخۆیانەوە دەگرت. هەر چۆنێک بێت، سەرەتای دروستبوونی شاری سلێمانی و پەیوەندی ئەم دروستبوونە بەناخودئاگای ئێمەوە مەسەلەیەکە دەبێت بەردەوام ئاوڕی شێلگیرانەی لێ بدرێتەوە.

(٢) ج، بابان : ل ٩٥

(٣) شێخ محەمەدی خاڵ: (الشیخ معروف النودهی البرزنجی، ل: ١٢) کە ئێمە لەسەرچاوەی پێشووەوە (ل: ٩٥) وەرمانگرتووە.

(٤) هەر ئەوێ ل: ٩٣

(٥) هەمان سەرچاوە، ل:٩٥.

## پەراوێز و سەرچاوەکانی عاقڵ و کەر:

(١) لەمبارەیەوە بڕوانە ئەم سێ سەرچاوەیەی خوارەوە:

Heiderose og Andreas fischer N: **Æsl- Liv**. Skarv Høst og -søn, s. 5, 1990.

- الموسوعة، المجلد الاول، ط. الاولى ١٩٨٥ صص: ١٥٤- ١٥٩

- مەحمود زامدار: کۆمیدیای کەرایەتی. لە بڵاوکراوەکانی کۆمەڵی هونەری کوردی لە سوید، ١٩٩٥؛ چ. یەکەم، ستۆکهۆڵم. ل: ٩ و بەرەو دوا.

(2) CHR.. Gorm Tortzen: **Æslet**. s. 26.

(3) Ibid, s. 26.

(٤)سەبارەت بە وێنەی کەر لە تەورات و ئینجیلدا بڕوانە **تەورات وئینجیل**: (ماتیۆس:

ئایەتی ۲۱، ۲ و لەوەدوا، یۆحەننا: ۱۲، ۱۵ و زەکەریبیا:۹، ۹)، هەروەها تەماشای ئەم سەرچاوەیە بکە:

CHR.. Gorm Tortzen: **Introduktion til Æslet** (En studie i den pseudolukianske roman Lucius eller Æslet). "Studier fra Sprog- og Oldtids forskning", København: 1988.

جگە لە تەورات و ئینجیل، قورئانی پیرۆزیش لە چوار شوێندا ناوی کەری هێناوە کە وا لە خوارەوە دەیاننووسمەوە:

یەکەم: لە سوورەتی (بەقەرە)دا ئایەتی (۲۵۹): « وانْظُرْ إلى حِمارِكَ وَلِنَجْعَلَك آية للناس و انظُر إلى العِظام كَيفَ» نَنْشِزُها ثُمَّ نَكْسوها لَحْماً فَلَما تَبَينَ لَهُ قالَ أعلم ان الله على كُل شيءٍ قَديرٌ».

دووەم: لە سوورەتی (نحل/ئایەتی ۸): «والخَيلَ والبِغالَ و الحَميرَ لتَرْكبوها وزينةً وَيخلُقُ مالا تعلمون».

سێهەم: لە سوورەتی (لوقمان/ئایەتی ۱۹): «واقصِدْ في مَشْيكَ و اغْضُضْ مِنْ صَوتِكَ إنَّ أنْكرَ الاصواتِ لَصَوتُ الحَميرِ».

چوارەم: لە سوورەتی(جمعە/ ئایەتی ۵):«مَثَلُ الذينَ حُمِلوا التوراتة ثُمَّ لَمْ يَحْمِلوها كَمَثل الحِمارِ يَحْمِلُ أسْفارا بِئْسَ مَثَلُ القَومِ الذين كَذَبوا بآيتِ اللهِ واللهُ لايَهْدى القَومَ االظالمين».

پێنجەم: لە سوورەتی (المدثر/ئایەتی ۵۰ و ۵۱): «كَأنَهُم حُمُرٌ مستَنفرةٌ. فَرت من قسورة».

بۆ دەرهێنانی سوورەتە قورئانییەکان، سوپاسی (سوهام خان) دەکەم کە لە رەمەزاندا قورئانی دەور کردەوەو ئایەتەکانی بۆ دەرهێنام.

(5) **Æsl- Liv**, s. 5.

(6) Nick Cave: **Da æslet så engelen** (And the Ass saw the Angel). Nordisk Bogprduktion, Denmark, 1991, s. 1.

(7) Anna Spphie Seidelin: **Genfortæller Det Gamle testemente**. Sesam 1981, s. 158- 160.

(8) **Æsop. fabler**: gendigtet af Vagn Lundbye, Hernov: 1996, s. 7- 8 og 109.

(9) CHR. Gorm Tortzen: **Introduktion til Æslet**,s. 29 ...

(10) Apuleus: **Det gyldne Æsel**. Oversat fra Latin af Otto Gelsted, Sant Ansgars Forlag, København, 1997. s. 9.

(11) CHR.. Gorm Tortzen: **Æslet**...

(12) **La Fontaine. Fabler**: Komplet udgave Gendigtet af Johannes Møllehave, Hernv, 1986, (Fabel 4, 10, 11, 14, 15, 17 and 21).

(١٣) لەناو ئەو دەقانەدا کە بەتایبەتی بۆ کەر تەرخانکراون، من ئەوەی مامۆستا قانع بە نزیکترین دەق دەزانم لە کەری واقیعی و راستەقینەوە. رەنگە هۆی ئەمەش بگەڕێتەوە بۆ ژیانی قانع و شارەزایی تەواوی لە وردەکارییەکانی ژیانی لادێنشینەکانی کوردستان و ئاگاداریی ئەو لەو تێکەڵییەی نێوان ژیانی مرۆڤ و حەیواندا، کە بێگومان ئەو جۆرە ژیانە دەیسەپێنێ. قانع بەپێچەوانەی نالییەوە، وەک لە پاشاندا دێمەوە سەری، بەش و ئەندامەکانی ئەناتۆمیی کەر ناسڕێتەوە و لە ژماردنی سیفاتە حەیوانییەکانیشیدا تیژبین ترە. بۆ دەقی شیعرەکانی قانع بگەڕێوە بۆ:

- دیوانی قانع: کۆکردنەوە و لەچاپدانی، بەهەشتی: مامۆستا بورهان قانع، چ. یەکەم ١٩٧٩، چاپخانەی زانکۆی سلێمانی. ل:٩٣-٩٤ و ١٤٨-١٤٩

(١٤) ئاماژەیە بەم بەیتەی نالی، کە تیایدا ئاگایی شاعیر وەک کەسێ کە بیر لە شیعر وەک داهێنان دەکاتەوە و دەتوانم بڵێم بەچاوێکی رەخنەگرانەوە تەماشای شیعر دەکات، رەنگیداوەتەوە:

«نالی» عەجەب بە قووەتی حیکمەت ئەدا دەکا

مەعنایی زۆر و گەورە بە لەفظی کەم بچووک

بروانە: **دیوانی نالی**، لێکۆڵینەوە و لێکدانەوەی: مەلا عەبدالکریمی مدرس و فاتح عبدالكريم. محمدی مەلاکەریم پیاچۆتەوە. چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد، بەغداد: ١٩٧٦، ل: ٢٦٠

(١٥) مامۆستایانی مودەریس زۆر بە وردی و تیژبینانە ئاماژەیان بەم هاوئاوازییە کردووە. بڕوانە دیوانی نالی، ل: ٢٢٥

(16) Henrik DAHL: Kommunikation og massemedier. in: Sosiologi, 1999, s. 203.

(١٧) «**شیعر وەک ڕووداو، شیعر وەک بەرهەم**» ناونیشانی بەشێکە لە لێکۆڵینەوەیەکی بڵاونەکراوەم بەناوی (شیعرییەتی بوون) کە تیایدا هەوڵمداوە ئەم دوو چەمکە شیببکەمەوە.

(١٨) لەمبارەیەوە بڕوانە **پێشەکیی دیوانی نالی**، ل ٥٣ و بەرەو دوا لە نووسینی مامۆستای کۆچکردوو فاتح عبدالکریم.

(١٩) بۆ نموونە بڕوانە: مەحمود زامدار: کۆمیدیای کەرایەتی، سەرچاوەی پێشوو، بەتایبەتی لە لاپەڕە: ٧٠ - ٧٥.

(٢٠) بڕوانە وتاری «شیعرییەتی بوون»، کە لە پەراوێزی ژمارە: (١٧)دا باسیکراوە.

(21) Peter Kemp: Tid og fortæling. intoduktin til Paul Ricæur. s. 17-18.

(22) P Kemp: ibid, 19

٢٣) دیوانی نالی، ل: ١٨

٢٤) لەمبارەیەوە بڕوانە ئەم سەرچاوەیەی خوارەوە کە ئیلهامبەخشی یەکەمی باسەکەم بووە:

- Carsten B. Pedersen: Naturen og teknikken. 1994, s. 242-247.

پێویستە بڵێم لە بواری مێژووی فەلسەفەدا باس لە چەند تێڕوانین دەکرێ لەسەر سروشت کە گرنگترینیان ئەمانەن: «تێگەیشتنی میتۆلۆژی لەبەرامبەر عەقلانیدا بۆ سروشت، تێگەیشتنی عەفەوی، تێگەیشتنی رۆژانەی ئاسایی، تێگەیشتنی گشتگیر بۆ سروشت، واتە تێگەیشتن لە سروشت وەک یەکەیەکی لێکدانەبڕاو، پاشانیش تێگەیشتنی ئامرازگەرایانە لە سروشت».

٢٥) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل:٢٤٧

(٢٦) د. لوبروتون: انتروبولوجیا الجسد، الفصل الثانی، ص: ٢٧-٦٠.

(27) Descartes Metafysiske meditationer. s. 179- 195.

(28) Kant: Grundlæggelse af moralens metafysik. s. 189- 220.

## پەراوێزەکانی شاعیرێک لەنێوان دوو تێکشکاندا

(١) سی. جی. جی ئەدمۆنز: کردها، ترکها، عربها. ت: ابراهیم یونسی، تهران ١٣٦٧

(٢) والتر برونو هینینگ: زەرتشت، سیاستمدار یا جادوگر. ت: کامران فانی، تهران ١٣٦٥

# سەرچاوەکانی ئەم کتێبە بە گشتی

- دیوانی نالی(لێکۆڵینەوەو لێکدانەوەی ، مەلا عبدالکریمی مدرس و فاتح عبدالکریم) پیاچوونەوەی محەمەدی مەلا کەریم. بەغدا ١٩٧٨ .

- مێژووی ئەدەبی کوردی (علاالدین سجادی) بەغدا ١٩٥٢ .

- دیوانی پیرەمێرد (کۆکردنەوە و ساخ کردنەوەی لیژنەیەکی شەش کەسی) بەرگی یەکەم، بەغدا ١٩٨٦ .

- دیوانی مەحوی لێکدانەوە و لێکۆڵینەوەی (مەلا عبدالکریمی مدرس و محەمەدی مەلا کەریم) بەغدا، ١٩٨٦

- نالی لەکلاو رۆژنەی شیعرەکانیەوە (محمد مەلا کەریم) بەغدا، ١٩٧٩ .

- رۆشنبیری کوردی و سیستەمی عیرفانی(مەریوان وریا قانع) دەسنووسی لێکۆڵینەوەیەکە، سلێمانی ١٩٩١

- فەرهەنگی خەم: ٣ (شیعر، حەسیب قەرەداخی) بەغدا ١٩٧٩

- گرنگیی وشە لە ئیسلامدا (لیژنەیەک نووسەر) تاران ١٦٠٨ ک.

- هەنبانە بۆرینە(هەژار) تهران، ١٩٨٩-١٣٦٨ / سروش.

- قامووسی زبانی کوردی (عەبدورەحمانی زەبیحی) ، نوێکردنەوەی چاپ ١٣٦٧ ، ورمێ

- شاری سلێمانی(ئەکرەمی مەحموودی ساڵحی رەشە، ٢ بەرگ) پێداچوونەوە پێشەکی: د. عێزەدین مستەفا رەسووڵ . بەغدا ١٩٨٩

- نەخشەی شاری سلێمانی لە سەردەمی بابانەکاندا لەگەڵ ناوی حاکم و موتەسەریفەکان (جەمال بابان، گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق- دەستەی کورد)، ل: ١٣٠-٩٠ ، بەرگی ١٦-١٧ بەغدا ١٩٧٨

- چەند وتارێکی کوردناسی (و. ئەنوەر قادر محمد) ١٩٨٩ ، سوێد: لەبلاوکراوەکانی کۆمەڵی هونەری کوردی لەسوێد :(٣٧-٥٢)

- نقدی بر فرویدیسم از دیدگاه روانشناسی علمی (هاری کی ولز) ت. نصرالله کسرائیان

.ج:۲:ج:۲ / تهران ۱۳۶۳
- رمز و مثل در روانکاوی(جلال ستاری) ترجمه وتالیف، ج"۱ / تهران ۳۶۶
- تعبیر خواب و بیماریهای روانی(فروید) ت: ایرج پور باقر / تهران ۱۳۶۱
- لوی استروس(ادموندلیج) ت: حمید عنایت، ج ۲ /تهران ۱۳۵۸ .
- اسلام شناسی(علی میر فطروس) ج: ۱۱ ، فرانسه - کانادا / ۱۹۸۹ .- نظام حقوق زن در اسلام - مسئله حجاب( مرتضی مطهری) قم ، ۱۳۵۷
- فرهنگ سه جلدی عمید (حسن عمید) چ: ۲ ، تهران / ۱۳۶۵
- مرد روانکاوی روانکاوی نامرد (کرامت موللی) دبیره:۲ پاریس ۱۳۶۶
شیرین در چشمه (نصرالله پور جوادی) نشر دانش ٦ تهران / ۱۳۷۰
- نزاع دیوانگان باخدا (هلموت ریتر) ت:ن. پور جوادی نشر دانش: سال ۷
- رسالهت زیگموند فروید(اریش فروم)ت: فرید جواهر کلام، سال: ؟-چ: شرکت سهامی کتابهای جیبی.
- روانکاری زن (کرامت موللی) دبیره: ۵ بهار ۱۳۶۸ پاریس، ص: ۱۰۶- ۳۲
- تصویر زن در قران (پرویز دستمالچی) کتاب جمعهها: ۱۳، پائیز ۱۳۶۷
- بابک احمدی، م. مهاجر، م. نبوی: هرمنوتیک مدرن. گزینهء جستارها. مرکز، تهران: ۱۳۷۷.
- مدخل الی میادین علم النفس و مناهجه (د. کمال بکداش و د. رالف رزق الله ط: ۲، ۱۹۸۵-بیروت.
- دینامیه النص (د، محمد مفتاح): ۱، بیروت- دار البیضاء/ ۱۹۸۷
- الروض العاطر فی نزهه الخاطر (الشیخ النفزاو) تحقیق النسخه العربیه جمال جمعه، اسکندناڤیا، لندن/ ۱۹۹۰
- التحلیل النفسی من فروید الی لاکان (عدنان حب الله) بیروت، ۱۹۸۸
- بیت الحکمه (السنه الثانیه) العدد: ۸، مغرب/ ۱۹۸۸
- القران الکریم. ط: السعودیه. ۱٤۰۷
- بنیه اللغه الشعریه (جان کوهن)ت: محمد الوالی ومحمدالعمریط:۱، مغرب/ دار التوبقال. ۱۹۸٦

- A. Bregenhøj: Drømme gennem tusinde år. Hernovs forlag: København 1986.
- K. Yamanar: Sex i følge Islam. Cupido, nr. 2. 1992.
- Ove. B & P. Henningsen: Erotikkens historie. 1986.
- N. Koch: Kvindernes nye verden. København 1975.
- J. Lacan: Det ubevidste sprog. København, 1973.
- Jesper G & Martin M. : Hermeneutik. En antologi om forståelse. Gyldendal, København: 1999.
- Poul Lubcke (red.): Vor tids filosofi II. Politikens Forlag, København: 1988.
- Hans Fink: Menneske, Samfund, Natur. Gyldendal, København: 1993.

# پاشکۆی یەکەم

(بۆ یارمـــەتیـــدانی خـــوێنەر بە چاکم زانی دەقی قەسـیـدەکـان لە دیوانی گـەورەی (نالی)یەوە بە لێکدانەوەی مامۆستایانی مودەڕیس وەکو خۆیان و لە پاشکۆدا بڵاو بکەمەوە)

قوربانی تۆزی ڕێگەتم ئەی بادی خۆش مرۆر !
ئەی پەیکی شارەزا بە هەمۆ شاری ( شارەزۆر ) ! (١)

سارد بۆنەوە ، بەهۆی گەرماکەیەوە پرژێکی زۆر بە سەر و ڕۆی چەکوشە پۆلاکەدا ئەپرژێنێ .

مەعنا پەنهانەکەشی ئەوەیە پیاو بە ( چاو )ی ، دلۆپی ( ئاو )ی وەك مرواریێ سپێ و ، بە ( سەر )ەکەی سۆرایی وەك لەعل ئەبا بۆ ئافرەت ، کەچێ ئەو لەپاداشا ئەوەندە ( تف ) بە (دیاری)یەکەیدا هەڵئەدا ، وەك پلۆسکە شکاوی تافگەی لێ ئەکا .

دوڕڕ و (عب) و (من) : دەڕوا . لەعلی هەدییە (چر) و (ت) و (ك) و (عب) و (من) : لەعل و هەدییەی . (کم) و (گم) : لەعلی هەدییەی . دەیکا بە (من) : دەیکاتە .

٤) خەفێ : نهێنێ . ئاشکار : دیاری .
واتە : شیعری ( نالێ ) وەك ئاو و ئاوێنە وایە ڕەنگی نییە ، دۆ ڕووە ، بەر و پشتی هەیە . لە ڕۆیەکیا بنیادەم ، وەك چۆن لە ئاو و ئاوێنەدا خۆی ئەبینێ ، مەعنای ئاشکرای بـۆ دەرئەکەوێ و ، لەو ڕووەکەشیا کە یا وەك بنی جام یا وەك جیوەی ئەودیوی ئاوێنە وایە هیچ دەرناکەوێ ، کەچێ مەعنایەکیتریش هەیە .

ئاو و ئاوێنە (عم) و (ت) و (عب) و (من) : ئاو و ئاینە . (ك) : ئاوە ، وێنەوو . (اح) : ئاوە ، وێنەیی .

شاعیر و نۆسەر کاك عبدالرزاق محمد بیمار بەشدارییەکی باشـی لە لێکدانەوەی ئەم پارچە شـیعرەدا لەگـەڵ کردین . قـەدر و سوپاسی ناخەینە پشت گوێ .

— ٢ —

١) باد : با . مرۆر : گوزەر ، تێپەڕین . پەیك : فروستادە ، کەسێ بە کاریێ نێررابێ بۆ شوێنێك . شارەزۆر : ئیستا ناوچەیەکی بچۆکە لە پارێزگای سولەیمانێ ، ( خاكوخۆڵ )ی زێدی نالێ یەکێکە لە گوندەکانی . بەپێی دابەش‌بۆنی بەڕێوەبەرێتیی ئەو سەردەمەی نالێ ئەم پارچە شیعرەی تیا

ئەی لوطفەکەت خەفییو هەوا خواه و هەمدەمە !

وەی سروەکەت بەشارەتی سەرگۆشەیی حوضور ! (۲)

---

وتووە ، بەشی زۆری کوردستانی ئیستای عێراقی گرتووەتەوە . بەڵام بە نیشانەی ئەوەدا کە نالی خۆی لەمەوپاش لە باسی سولەیمانیدا ئەڵێ :

**بۆ دەفعی چاوەزارە ئەڵێن شاری شارەزوور**

دیارە مەبەستی لێی ، تەنها شاری سولەیمانی و دەور و پشتیەتی .

نالی ، کوردی کەوتووە وڵاتان ، شاعیری خاوەن هەستی ناسك ، پاش ئەوەی لەئەنجامی تێکچوونی حوکمڕانیی بابانەکانا کوردستان بەجێئەهێڵێ و سەری خۆی هەڵئەگرێ و ڕوو ئەکاتە شام و ماوەیەك لە نامۆییدا ئەمێنێتەوە ، هەوای نیشتمان ئەداتەوە لە کەللەی ، ژانێکی قووڵ لە دەروونیا گینگڵ ئەخوا ، ئەنجامەکەی ئەم شاکارە هونەرییە ، ئەم تابلۆ پڕواتایە ئەبێ کەوا لەوێوە بۆ هاودەردێکی خۆی ، بۆ ( عبدالرحمن بەگی سالم )ی ناردووە و ، ئەویش لە سولەیمانییەوە بە شاکارێکی تری لەم چەشنە وەڵامی ئەداتەوە ، کە پیاو هەردوکیان بەراورد ئەکا ، وائەزانێ دوو کەون خراونەتە قەفەز ، قەفەزێکی دەربەدەری و یەکێکی دەستبەسەری ، لە بەرابەری یەکدا ئەخوێنن و بۆ یەکدیی ئەستێننەوە .

لەو ڕۆژەوە کە شیعر هەیە ، تەرازوی جیاکردنەوەی شیعری ڕاستەقینە لە شیعری تەنها بەدیسەن ، هەر ئەوە بووە ، شاعیر تا چئەندازەیەك لەگەڵ خۆیدا ڕاستی کردووە و ، شیعرەکەی چەند لە ناخیەوە هەڵقوڵاوە ، ئاخۆ دەنگدانەوەی ژانی دەروونی خۆیەتی ، یا بۆنە و پێویستی و باری ژیان زۆری لێ کردووە بیڵێ . وابزانین تاقە شتێ لە هەرچێ باشتر وەڵامی ئەم پرسیارەمان بداتەوە و ، ئەم ڕاستییەمان بۆ دەرخا ، ڕادەی لەگەڵدا گونجان و بە دڵا چوونی کۆمەڵی خوێندەوارانە . بۆیە ، بێگومان ، ئەو پایەیەی ئەم پارچە شیعرە لە مێژووی ئەدەبی کورددا دەستی خستووە ، نیشانەی ڕاستیی شاعیرە لەگەڵ خۆی و ، بەڵگەی ئەوەیە شیعرەکەی لە قووڵایی دەروونیەوە سەری کردووە .

نالی لەم پارچە شیعرەیدا بای تیژڕەو ئەکا بە نامەبەری خۆی و، دەست ئەکا بە بەری پشتێنیا و ، پێی ئەڵێ : خوا بمکا بە قوربانی تۆزی ئەو ڕێگایەی تۆ بەسەریا ئەڕۆی ، تۆ شارەزای هەموو کون و کەلەبەرێکی شاری شارەزوری و ڕێت لێ ون نابێ ، بڕۆ ئەم نامەیەم بۆ بگەیەنە و هەواڵم بۆ بپرسە و بزانە ...

ئەی ــ ی دووهەم ــ (اح) : وەی .

(۲) خەفی : نهێنی . بەشارەت : مژدە . گۆشە : سووچ .

ئەی هەم میزاجی ئەشکی تەڕ و گەرمی عاشقان :
طۆفانی دیدەوو شەرەری قەلبی وەك تەنـور ! (٣)

گاهێ دەبێ بە ڕەوح و دەکەی باوەشێنی دڵ
گاهێ دەبێ بە دەم دەدەمێنی دەمی غورور (٤)

---

واتە : ئەی ئەو بایەی کە نەوازش و دڵدانەوەت ، یاخود ناسکیت ، پەنهانە و کەس پێی‌نـازانێ ، چـونکە با وەختێ بە بایـەکی خـۆش دائەنرێ کە بەئاسـتەم ، وەك بەدزییەوە ، بـوەزێ . هەوایەکی ئەوێ بیجوڵێنـێ .. هاوڕێی بنیادەمـە ، چونکە ئەگەر نەبێ بنیـادەم خەفە ئەبێ .. ئـەی ئەو بایەی کە بەئاستەم هەڵکـردنت ، مژدەیە بۆ دڵ و دەروونی ئەوانەی لەسەر سوچی بەرماڵی بە دڵ ئامادەبێ و دوورنەکەوتنەوە دانیشتوون .

مەبەستی گفتوگۆکە پاش چەند شیعرێکی‌تر دێ .

هەمدەمە (اح) : هەمدەمم .

(٣) هەم‌میزاج : هاوسروشت .

مەبەستی لەوەیە با لەوەدا کە جاروبار ساردە ، هاوسروشتی تۆفانی چاوی دلدارانە کە فرمێسکی تەڕیانە . لەوەشا کە جاروباریش گەرمە ، هاوسروشتی بڵێسەی دڵەی وەك تەنور گەرمیانە کە لە شێوەی فرمێسکی گەرمدا دێتە دەرەوە .

(٤) گاهێ : جارێـکیان . ڕەوح : فێنکێ . دەم ـ ی یـەکەم ـ : دەمەی ئاسنگەر ، مۆشەدەمە .

مەعنای ئەم شیعرە وەك لێکدانەوەی ئەو شوبهاندنەیە کە لە شیعری پێشوودا هەبو . واتە : لەوکاتانەدا کە ساردی ، ئەبێ بە مایەی فێنکێ و باوەشێنی دڵ ئـەکەی . لەوکاتانەشدا کـە گەرمی ، ئەبێ بـە دەمەی ئاسـنگەر و خوێنی ، یاخود دەمـی ، لەخۆبایی‌بوون ئەبزوێـنی ، وەك مەشهوورە بنیادەم لە کاتی گەرمادا تووڕەیە و ئاگای لە خۆی نامێنێ چی ئەکا و چی ئەڵێ ..

لە کردنی (با)دا جارێك بە سروە و باوەشێن‌کەری دڵ و ، جارێکیش بە دەمەی ئاسنگەر ، طیباقێکی جوان هەیە ، سەرەڕای ئەو جوانییەی لە کۆکردنەوەی طۆفانی دیدە و ئاگـری تەنوری دڵدا هەیە لە شیعری پێشوودا ، کە ئیشارەتێکیشی تیا کردووە بە ئایەتی ( وَ فارَ التَّنُّورُ ) لە باسی تۆفانەکەی حەزرەتی نوحدا .

دڵ (ت) : ڕۆح .

مەحوی قەبوولی خاطری عاطر شەمیمتە
گەردی شیمال و گیژی جەنووب و کزەی دەبوور (٥)

سووتا ڕەواقی خانەیی صەبرم ، دڵ و دەروون
نەیماوە غەیری گۆشەیی ذیکرێکی یا صەبوور (٦)

هەم هەمعەنانی ئاهم و ، هەم هەمڕیکابی ئەشك
ڕەحمێ بەم ئاهـ و ئەشکە بکە ، هەستە بێ قوصوور (٧)

---

(٥) عاطر شەمیم : بۆنخۆش . شیمال : بای شەماڵ . جەنووب : بای گەرمی باشوور . دەبوور : ڕەشەبا .

واتە : ئەو تۆزەی بای شەماڵ ئەیجوڵێنێ و ، ئەو گێژەڵووکەی بای باشـوور هەڵیئەکا و ، ئەو کزە ساردەی ڕەشـەبا ئەیبزوێنێ ، هەموو ئەوتاو و سەرگەردانی گەڕان بەدوای ئـەوەدان کە دڵی بۆن و بەرامە خۆشی تۆ پەسەندیان بکا .

عاطر شەمیمتە (چن) و (ك) : پڕ فەیض و عاطیرە .

(٦) ڕەواق : هەیوان . خانە : خانوو .

واتە : هەیوانی ماڵی خۆڕاگرتن و بوردەباریم سووتا ، سەبر جێگەیەکی نەمـا خۆی تیـا حەشار بـدا ، کەوتە دەشـت . دڵ و دەروونـم تەنها سووچێکیان بۆ ماوەتەوە دوعای ( یا صەبوور )ی تیا بخوێنن ، بەڵکو خوا دەرووەیەکی خێریان لێ بکاتەوە .

دڵ و («پەراوێزی» چن) و (ت) و (ك) و (مز) و (اح) : دەر و . بەپێی ئەم نوسخانە مەعنای شیعرەکە وای لێدێتەوە : دەر و ناوی هەیوانی ماڵی سەبرم ئاگری تێبەربـوو .. (عم) : وەکو . بەمپێیـەش مەعناکەی وای لێدێتـەوە : هەیوانی خانـوی سەبرم ، هـەروەك ناوەوەی ، ئاگـری تێبەربوو . گۆشەیی ذیکرێکی (چر) : گۆشەیی ذیکرێکە . (ت) گۆشەیی ذیکرێك کە .

(٧) هەمعەنان : هاوجڵەو . هەمڕیکاب : هاوڕکێف ، هاوئاوزەنگی .

واتە : کە خانووی سـەبرم ڕووخا و جێگەم نەما ئۆقـرەی تیا بگرم ، هیچم بۆ نەمایەوە ئەوە نەبێ هەمیشە پێبەپێی ئاخهەڵکێشان و فرمێسك ڕشتن بڕۆم ، کەواتە ئەگەر بەزەییشت بە مندا نایێتەوە، با بەزەییەکت

وەك ئاهەكەم دەوان بە هەتا خاكی كۆیی یار
وەك ئەشكەكەم ڕەوان بە هەتا ئاوی ( شیوەسوٚر ) (٨)

بەو ئاوە خوت بشۆ لە كودوٚراتی سەرزەمین
شاد بن بە وەصلی یەكدی : كە توٚی طاهیر ، ئەو طەهوٚر (٩)

ئەمجا مەوەستە تا دەگەییە عەینی ( سەرچنار )
ئاوێكە پڕ لە نار و چنار و گوڵ و چنوٚر (١٠)

---

بەواندا بێتــەوە . هەڵسە ، تۆ وەك ئــەوان نیت ، ڕێت لێ ون نابێ ، بكەوەرە ڕێ بڕۆ ...

ئاه و ئەشكە ( « پەراوێزی » چر ) : ئاهە وشكە . ئەگونجێ ئەمیش هەر ( ئاهە و ئەشكە ) بێ وا نوٚسرابێ .

(٨) دەوان : ئەوەی بە ڕاكردن بڕوا . كۆ : بەردەرگای ماڵ . ڕەوان : جارێ . شیوەسوٚر : شیوێكە لەنزیك چەمچەماڵەوە .

واتە : وەك هەناسـەی ساردی درێژم بە پەلە بڕۆ تا ئەگەیتە بەردەرگای ماڵی دۆست و ، وەك فرمێسكم جارێ ببە تا ئەگەیتە ئاوی شێوە سوٚر .

لــە كۆكردنــەوەی (ڕەوان) و (دەوان)دا جیناســی لاحیــق و ، لە كۆكردنەوەی (ئاه) و (ئەشك) و، (خاك) و (ئاو) و (شیو)دا تەناسوب هەیە. لە هێنانی ناوی (شیوە سوٚر)یشدا ئیشارەت بەوە كراوە كە فرمێسكی شاعیریش خوێناوە و سوٚرە . ئەوەش گونجانێكی جوانی تیایە .

ئاوی شیوە سوٚر ( « پەراوێزی » چر ) و (كم) و (گم) و (اح) : ئاوی پردە سوٚر . ( « دیسانەوە پەراوێزی » چر ) : شیوی پردە سوٚر .

(٩) كودوٚرات : توٚز و خۆڵ . طاهیر : پاك . طەهوٚر : پاك كەرەوە .

واتە : كــە گەیشتیتە ســەر ( شیوە ســوٚر ) و نزیكی ســولەیمانێ بوٚیتەوە ، لادە ، كەمێك بحەسێرەوە ، بەو ئاوە خــوٚت بشۆ ، هەرچی توٚز و خۆڵی ڕوٚی زەویت لەو ڕێگەیەدا لێنیشتووە ، هەموٚی دابشۆ . تۆ خوٚت پاك و ئاوەكەش پاكەوەكەر ، بە دیتنی یەك شاد ببن .
( طــاهیر ) و ( طەهوٚر ) لە زاراوەكانی فیقهن .

كە توٚی (كم) : ئەتۆ .

(١٠) عەین : كانێ . ســەرچنار : كانێ و سەراوێكە حــەوت كیلۆمەترێك لە سولەیمانییەوە دوٚرە . جێگای ڕابواردنی خەڵكی شارە . نار : هەنار .

چەشمێکە میثلی خۆر کە لە صەد جێ ، بە ڕۆشنێ
فەورانی ، نوری صافە لەسەر بەردی وەك بلور (١١)

یا عەکسی ئاسمانە لە ئاوێنەدا کەوا
ئەستێرەکانی ڕابکشێن وەك شەهابی نور (١٢)

---

چنور : گیایەکی بۆن‌خۆشی کێوییە ، بەلام لە شوێنی وەك سەرچنار نارۆێ ، وادیارە نالی هەر بۆ وەزنی شیعر هێناوێتی . دووریش نییە مەبەستی هەنار و چنار و چنوری ڕاستەقینە نەبێ ، بەلکو کینایە بێ لە کچی بالا بەرز و بۆن خۆش و مەمکی خڕ ، چونکە سەرچنار لەمێژە سەیرانگای خەلکی سولەیمانییە و شۆخەکانی شار هەمیشە تیا کۆئەبنەوە .

لە وشەی (عەینی)دا لەطافەت هەیە چونکە هەم مەعنای (کانێ) و هەم مەعنای (خۆی)یش ئەگەیەنێ . لەنێوان (نار) و (چنار)دا جیناسی ناقیص و ، لەنێوان (چنور) و (چنار)دا جیناسی لاحیق هەیە .

ئاوێکە پڕ لە نار و چنار و (کم) و (گم) و (من) : ئاوێکی صافە پڕ لە چنار و . (عب) : ئاوێکە پڕ لە دار و چنار و . گوڵ و چنور (ت) و (مز) : گوڵی چو نور . واتە گوڵی وەك نور .

(١١) چەشمێکە : چەشمەیەکە ، کانییەکە . فەوران : فەوەران ، هەلقولان .

واتە : سەرچنار کانییەکە وەك خۆر وایە ، وەك چۆن خۆر بەسەر پارچە بلوری ئاسمانەوە لە صەد لاوە تیشك بلاو ئەکاتەوە ، ئەمیش پاك و ڕۆشن و بێ‌گەرد لە صەد لاوە هەلئەقولێ و بەسەر بەردی خاوێنی وەك بلور سپیی ناو کانیدا ئەڕوا ..

ڕۆشنێ (چن) : رۆشنێ و .

(١٢) واتە : یاخود سەرچنار کانیاو نییە،ئاوێنەیەکە دانراوە ، دیمەنی ئاسمانی بە ئەستێرەکانیەوە تیا دیارە . ( وردە بەردەکانی بنی ئاوەکە ، جێگەی ئەستێرەکان ئەگرنەوە لە شوبهاندنەکەدا ) . بەلام چونکە وێنەی ئەستێرەکان لە ئاوەکەدا ئەجولێنەوە ( مەبەست ئەوەیە کە ئاوەکە بەسەر وردە بەردەکانا ئەڕوا ، وا دێتە پێش چاو بجولێنەوە و بکشێن ) ، وەك ڕاکشابن و درێژ کشابن وایە و ، لەوەدا لەوە ئەکەون کە لە ئەستێرەی عادەتی بچن و ، وەك ئەو ئەستێرانەیان لێ دێ کە بەدوای شەیتانە بۆ ئاسمان ڕۆیشتووەکاندا ئەکشێن . *

ڕابکشێن (چر) و (ك) و (مز) و (تۆ) و (عب) و (اح) : ڕابکشێ .

* پێم وایە مەبەستی نالی لە پێشدا ئەستێرەی زەوی بێ‌ئەستێرە بە کوردی بەو گۆلە دەلێن کە دەیگرنەوە و خۆ ئاوی تێدا رادەگرن بۆ ئەوەی شەواو بە خۆڕایی نەچێ . بە فارسی پێی دەلێن ( استخر ) بەو حالەوە مەعنای ئەستێرەی ئاسمانیش هەر دەدا ،

یا چەشمەساری خاطری پڕ فەیضی عاریفە
یەنبوعی نورە دابڕژێنێ لە کێوی طور (١٣)

دەموت دو چاوی خۆمە ئەگەر ( بەکرەجۆ )یی ئەشك
نەبوایە تیژ و بێ ثەمەر و گەرم و سوێر و سور (١٤)

---

(١٣) چەشمەسار : سەرچاوە . عاریف : خواناس . یەنبوع : کانێ . کێوی طور : ئەو کێوەی خوا قسەی لەگەڵ حەزرەتی موسا تیا کرد و نوری خۆی تیا پیشان دا .

واتە : یا هیچیان نییە ، سەرچاوەی پڕ بەرەکەتی خواناسانە ، سەرچاوەی ڕوناکییە ، لە کێوی تورەوە دابڕژێتە خوارەوە .

پڕ فەیضی عاریفە (عم)و (ت) و (مز)و (عب)و (من) : پڕ فەیض‌و عاطیرە. (تو) پڕ فەیضی عاطیرە . یەنبوعی نورە دابڕژێنێ (کم) و (گم) و (من) : یا ئاوی ڕۆح بەخشە کەوا دێ . (چر) و (عم) و (ت) : ... دادەڕژێنێ . (چن) : ... دابڕێژنێ یا دابڕێژێنێ .

(١٤) بەکرەجۆ : شوێنێکە دە کیلۆمەترێك لە سولەیمانییەوە دورە ، جۆگایەکی لە سەرچنارەوە بۆ دێ .

واتە : ئەگەر فرمێسکی چاوەکانم تیژ و بێبەرهەم و گەرم و سوێر و سور نەبونایە ، بە ئاوی بەکرەجۆم ئەوت فرمێسکی منە ، بەڵام ناتوانم وابڵێم چونکە هەرچەند فرمێسکی منیش وەك ئاوی بەکرەجۆ زۆرە ، بەڵام ئەو خاسیەتانەی باسم کردن و لە فرمێسکی چاومدا هەن ، لە ئاوی بەکرەجۆدا نین .

نالی ، لە دانانی ئەم خاسیەتانەدا بۆ فرمێسکی چاوی خۆی و ، دژەکانیان بۆ ئاوی بەکرەجۆ ، مەعنا ئاراییەکی زۆر جوانی کردووە ، سەرەڕای ئەو زیادە ڕەوییەش کە چاوی خۆی بە یەکێك لە جۆگاکانی سەرچنار داناوە .

وشەی (بەکرەجۆ) لەم شیعرەدا بەگوێرەی زانستی نەحوی کوردێ ( متنازع فیە )یە لەنێوان ( دەموت ) و ( نەبوایە )دا و ڕاستکردنەوەی ڕستەکە بەمجۆرە ئەبێ : ئەگەر بەکرەجۆی ئەشك تیژ و بێ ثەمەر و گەرم و سوێر و سور نەبوایە،ئەموت جۆگەی بەکرەجۆ دو چاوی خۆمە.

دو (چن) و (من) : کە .

داخڵ نەبی بە عەنبەری سارایی ( خاڵوخۆڵ )
هەتا نەکەی بە خاکی ( سولەیمانی )یا عوبوور (١٥)

یەعنی ڕیاضی ڕەوضە کە تێدا بە چەن دەمێ
موشکین دەبێ بە کاکۆڵی غیلمان و زوڵفی حوور (١٦)

---

(١٥) سارا : صەحرا ، دەشت . خاڵوخۆڵ : دێیەکە لە نزیکی چەمی تانجەڕۆوە ، لە ناوچەی ( عەربەت ) ، ٢٤ کیلۆمەترێك لە ڕۆژهەڵاتی سولەیمانییەوەیە . سولەیمانێ : یەکێکە لە بەناوبانگترین شارەکانی کوردستان ، ئیبراهیم پاشای بابان لە ساڵی ١٧٨٤دا دروستی کردووە و ، پێتەختی میرنشینیی بابانی لە ( قەڵا چوالان )ەوە بۆ گواستووەتەوە .

ناڵی کە لە شیعرەکانی پێشوویدا ( با )ی تیژڕەوی لەجیاتیی خۆی نارد و بەسەر کوردستانا ڕەواندی ، تا گەیاندیە ( شیوە سوور ) و ، دەم و چاوێکی لەوێ پێ شۆری و ، لەوێیشەوە بردی بۆ ( سەرچنار ) و ، ئەو هەموو تەعریفەی سەرچناری بۆ کرد ، نەیهێشت لەوێ داکەوێ . لەوێیشەوە ناردی بۆ ( خاڵوخۆڵ ) . بەڵام مەبەستی سەردان لە ( خاڵوخۆڵ ) نەبو ، تەنها بۆئەوەی بە بێوەفا دەرنەچێ ناوێکی ئەوێیشی هێنا .. سولەیمانیی ئەویست ، ئەو سولەیمانییەی بیرەوەرییەکانی لە تەختی دڵی هەڵکەنرابوون و ، خۆشترین ساڵەکانی ژیانی تیا بردبوە سەر . ئەوەتە بۆی دێ بە پیا هەڵدانی سولەیمانیدا و یەکە یەکە بیرەوەرییەکانی خۆی بۆ باس ئەکا و ئەڵێ : نەکەی بەر لەوەی بە سولەیمانیدا تێپەڕی،بچێتە دەشتی وەك عەنبەر بۆنخۆشی (خاڵوخۆڵ). سولەیمانێ لەپێش هەر کوێیەکەوەیە .

نەبی (عم) و (کم) و (گم) و (من) : مەبە . هەتا (چن) و (ك) : حەتتا . (عم) و (ت) و (مز) : هەرتا .

(١٦) ڕیاض : جەمعی (ڕەوضە)یە هەم بەمەعنا باخچە و هەم بەمەعنا بەهەشت بەکاردێ . لێرەدا هەردو مەعناکە مەبەستە . موشکین : موشکاوێ ، بۆنخۆش وەك کەسێك موشکی لە باخەڵدا بێ . کاکۆڵ : قژی درێژی پشتسەر . غیلمان : جەمعی ( غولام )ە واتە کوڕی تازە پێگەیشتوو .

واتە : مەبەستم لە سولەیمانێ ئەو باخچەی بەهەشتەیە کە هەر لەوێ ئەتوانی بە ماوەیەکی کەم بۆنی خۆشی کاکۆڵی کوڕە لاو و زوڵفی حۆرییە نازدارەکان هەڵبگری . دیارە سولەیمانێ کە بۆ بە باخچەی بەهەشت ،

خاکی میزاجی عەنبەر و ، داری ڕەواجی عوّد
بەردی خەراجی گەوهەر و ، جۆباری عەینی نوّر (١٧)

شامی هەموّ نەهار و ، فوصوّلی هەموّ بەهار
توّزی هەموّ عەبیر و ، بوخاری هەموّ بوخوّر (١٨)

---

ئەبێ پڕیش بێ لە (غیلمان)ی کاکوّڵ درێژ و بوّن خۆش و ، لە (حوّر)ی زوڵف وەك موشك خۆش بەرامە .

تێدا بە (چن) و (من) : تێیدایە . موشکین (اح) : زەلیف .

(١٧) میزاج : تێکەڵ . سروشت . جۆبار : جۆگە .

واتە : ئەو سولەیمانییەی کە بێبایەخترین شتی بەبایەخە .. خاکی سروشتی عەنبەری بوّنخۆشی هەیە یا لەگەڵ عەنبەردا تێکەڵە و ، داری وەك داری بوّنخوشی عوّد بەڕەواجە و ، گەوهەر لە خەرج و باجی بەردیا ئەدرێ و ، جۆگەی ئاوی وەك نوّر وایە یا سەرچاوەی نوّرە .

لە کۆکردنەوەی ( میزاج ) و ( ڕەواج ) و ( خەراج )دا هەرچەند جیناس نییە ، بەڵام وشەئارایییەکی جوان هەیە کە لە زوّر شوێنیتریشدا نالی شتیوای هەیە . لە کۆکردنەوەی ( خاك ) و (دار) و (بەرد) و ( عوّد )یشدا تەناسوب هەیە . لە ( عەین )یشدا لەطافەت هەیە .

میزاجی (کم) و (گم) و (من) : ڕەواجی . (مز) : خەراجی . عەنبەر و (چن) و (گم) و (ك) و (تۆ) : عەنبەرە . گەوهەر و ( چن ) و (گم) و (ك) و (تۆ) و (عب) : گەوهەرە .

(١٨) شام : ئێوارە . نەهار : ڕۆژ . فوصوّل : وەرزەکانی ساڵ . بوخار : هەڵم .

لە کۆکردنەوەی ( شام ) و ( نەهار )دا طیباق و ، لە کۆکردنەوەی ( نەهار ) و ( بەهار ) و ، ( بوخار ) و ( بوخوّر )دا جیناسی لاحیق و، لە کۆکردنەوەی ( توّز ) و ( بوخار ) و ، ( عەبیر ) و ( بوخوّر )دا تەناسوب هەیە . سەرەڕای جۆرە طیباقێکیش کە لەنێوان ( توّز ) و (عەبیر) و ، (بوخار)و (بوخوّر)دا هەیە لەوڕووەوە کە (توّز) و (بوخار) بێبایەخ و بەڵکو خراپن ، بەپێچەوانەی (عەبیر) و (بوخوّر)ەوە .

شارێکه عەدل و گەرمە ، لە جێگێکە خۆش و نەرم
بۆ دەفعی چاوەزارە دەڵێن شاری شارەزۆر (١٩)

---

(١٩) واتە : شارێکی بەداد یاخود شارێکی تەخت و ، گەرمە و لە شوێنێکی خۆش و نەرماندا دروست کراوە . کە پێیشی ئەڵێن شاری شارەزۆرە ، لەبەرئەوە نییە ڕاستە شاری شارەزۆرە ، بەڵکو بۆ چاوەزار و لێ لادانی چاوی پیس ، وای پێ ئەڵێن . مەبەست لە خراپیی دانە پاڵی سولەیمانێ بۆ شارەزۆر یا ئەوەیە کە شارەزۆری ئەو سەردەمە دواکەوتوو و پڕ لە دەرد و ئازار بووە و ئاو و هەوایەکی ناخۆشی بووە ، یا ئەوەیە کە وشەی ( شارەزۆر ) مەعنای شاری جەور و ستەم ، یا شاری درۆ و بوختان، یا شاری زۆری کوژی ئەژدەهاك ئەگەیەنێ ، وەك لە کتێبە مێژوویيە کۆنەکاندا نووسراوە . عادەتێکی میللییش هەیە منداڵی خۆشەویست بۆ دەفعی چاوی پیس ناوی ناشیرینی لێ ئەنێن ، گوایە بۆیەش بە شارێکی جوان و خۆشەویستی وەك سولەیمانێ وتراوە شاری شارەزۆر .

نالی ئەوەشی لەم شیعرەدا مەبەست بووە کە لە بەرابەری وشەی ( عەدل )دا کە هەم مەعنای دادپەروەری و هەم مەعنای ڕێك و تەختیش ئەگەیەنێ ، وشەی ( شارەزۆر ) دانێ کە وەك مەعنای ( شاری درۆ و بوختان ) ئەگەیەنێ ، وەك وتمان ، مەعنای ( شاری شیو )یش ئەگەیەنێ ، چونکە ( زۆر ) لە عەرەبیدا بەمەعنا شیویش هاتووە .

نیوەی یەکەمی ئەم شیعرە جیاوازییەکی زۆری لە نوسخە دەسنوس و چاپەکانی بەردەستمانا تیا هەیە . ئێمە پشتمان بە نوسخەی (چر) بەست . لەبەر بایەخی جیاوازییەکانیان و ، بۆ یارمەتیدانی لێکۆڵینەوەی پتری دوارۆژیش ، تێکستی نوسخەکانیتریش لێرەدا ئەنووسینەوە .

(چن) و (اح) : **شارێکە عەدل و گەرم لە جێگێکی خۆش و نەرم**
( عم ) : **شارێکە پڕ لە عەدل لە جێگای خۆش و نەرم**
( کم ) : **شارێکە پڕ لە عەدل و گەرەم ، جێیەکی خۆشێ و بەزم**
( گم ) : **شارێکی عەدل و گەرم لە جێگەیکی خۆش و نەرم**
( ت ) : **شارێکی عەدل و گەرمە لە جێگێکی خۆش و نەرم**
( ك ) : **شارێکە عەدل و گەرمە لە جێگێکی خۆش و نەرم**
( تۆ ) : **شارێکە عەدل و گەرم و لە جێگەیێکە خۆش و نەرم**
( مز ) : **شارێکە عەدل و گەرم جێگەییە ذەوق و بەزم**
( عب ) : **شارێکە عەدل و گەرم و لە جێگێکی خۆش و نەرم**

ئەهلێکی‌وای هەیە کە هەمۆ ئەهلی دانشن
هەم ناظیمی عوقوودن و هەم ناظیری ئومۆر (٢٠)

سەیرێ بکە لە بەرد و لە داری مەحەللەکان
دەورێ بدە بە پرسش و تەفتیش و خوار و ژوور (٢١)

داخۆ دەروونی شەق نەبووە (پردی سەرشەقام) ؟ !
پیر و فوتادە تەن نەبووە (داری پیرمەسوور) ؟ ! (٢٢)

---

(٢٠) دانش : زانین . ناظم : هۆنەرەوە . عوقوود : جەمعی ( عەقد )ە بەمەعنا ملوانکە .

واتە : سولەیمانی وەنەبێ تەنها شوێنەکەی خۆش بێ،دانیشتووانیشی مرۆی زیرەك و زانا و خاوەن بیرن . ئەدیب و شاعیری‌وایان تیایە شیعری جوانی‌وا ئەڵێن وەك ملوانکەی مرواری هۆنرابێتەوە و ، کاروباری دنیایش ڕائەپەڕێنن و لێ‌هاتوون .

لەنێوان ( ناظم ) و ( ناظیر )دا جیناسی لاحیق هەیە .

نیوەی دوهەمی ئەم شیعرە لە نوسخەی ( چن )دا بەم‌جۆرەیە :

**ئەهلێکن ئەهلی دانش و نێکن بوزورگ و خورد**

لە نوسخەی ( ك )یشدا بەم‌جۆرەیە :

**ئەهلێ کە ئەهلی هونەر ، نێکن بوزورگ و خورد**

بەپێی ئەم نوسخەیە ئەبێ ( ن )یێك لە ( هونەر )ەکە پەڕیبێ و ( هونەرن ) بێ ، ئەگینا مەعناکەشی نایەت و سەنگەکەشی لەنگ ئەبێ .

(٢١) مەحەللە : گەڕەك . دەور : خول . پرسش : پرسیار .

لەم شیعرەوە نالی ( بـا ) ئەخاتە ناو شار بۆ زانینی هەواڵی شوێن بیرەوەرییەکانی و یەك‌بەیەکیان باس ئەکا بۆی . پێی‌ئەڵێ سەرێ لە دار و بەردی گەڕەکەکانی شار بدا بزانێ کامیان لە جێی خۆیان ماون و کامیان تێکچوون و ، خوار و ژووری شار بکەڕێ و خولی پیا بخوا و لەم و لەو بپرسێ .

لە بەرد و لە داری (چـر) و (عـم) و (ت) و (مـز) : لـە دار و لـە بەردی . تەفتیش و (عـم) و (کـم) و (گـم) : تەفتیشی .

(٢٢) سەرشەقام : گەرەکێکە لە گەڕەکەکانی بەشی خوارووی سولەیمانی . پردی سەرشەقام : پردێك بووە لە نزیکی مزگەوتی مامۆستا مەلا

ئێستەش بە بەرگ و بارە عەلەمداری ( شێخ هەباس ) ،
یا بێنەواوو بەرگە گەڕاوە بە شەخسی عوّر ؟! (٢٣)

---

حوسەینی پیسکەندییەوە . فوتادە : ئوفتادە ، کەوتوّ . تەن : لەش .
پیر مەسوّر : پیر مەنصوّر ، پیاو چاکێك بووە شەخسەکەی لە داوێنی گەڕەکی مەلکەندییەوەیە،ئیستا بەو دەوروبەرە ئەڵێن گەڕەکی پیر مەسوّر. شوێنەواری گوّڕستانی دەوروبەری شەخسەکە خەریکە کوێر ئەبێتەوە و هەموّی کراوە بە خانوّ ، بەڵام شەخسەکە خوّی ماوە و دارێکیشی بە سەرەوەیە ، دیوارێکی بە دەورا کراوە . وادیارە دارەکەی پیر مەسوّر لە سەردەمی نالیدا دارێکی گەورە بووە و وەك هەموّ شەخسەکانی کوردستان ئاڵا و پەڕوّیەکی زوّری پێوە بووە و بەهاران جێگای کوّبوّنەوەی کوڕ و کچی شوّخی شار بووە ، بوّیە نالی وا بەسوّزەوە ناوی ئەبا .

ئەم دوّ شوێنە ( سەرشەقام ) و ( پیر مەسوّر ) کە نالی ناویان ئەهێنێ سەر و خواری شار بوون . مەبەستی نالییش ئەوەیە ( با ) هەموّ لایەکی شاری بوّ بپشکنێ .

پیر و (تق) و (عب) : پیری .

(٢٣) بە بەرگ و بار : پوّشتە و پەرداخ . عەلەمدار : داری ئاڵایێ و پەڕوّ پیا هەڵواسراو ، یا مروّی ئاڵا هەڵگر . شێخ هەباس : شێخ عەبباس ، یەکێك بووە لە سەیدەکانی بەرزنجە ، قەبرەکەی زیارەتگای خەڵکە ، کەوتووەتە داوێنی سولەیمانییەوە . جاران بەو دەور و پشتەیان ئەوت گەڕەکی جوّلەکەکان . ئیستا پێی‌ئەڵێن گەڕەکی شێخەباس . بێنەوا : هەژار و ڕوّت و قوّت . شەخس : بنیادەم ، یاخود قەبری پیاوچاك . عوّر : عوریان ، ڕوّت .

واتە : سەرێ لە شەخسەکەی شێخەباسیش بدە ، بزانە وەك جاران زیارەتگا و سەیرانگای خەڵکە و ، دارەکەی سەری کە ئەوەندەی ئاڵایێ پیا کرابو بوّبوّ بە دار ئاڵایێ ، یا ئەتوت ئاڵایێ هەڵگری شێخەباسە ، وەك جاران بە پارچە پەڕوّی ئاڵا و واڵا ڕازاوەتەوە ، یان هیچی پێوە نەماوە و وەك پیاوی ڕوّت و قوّتی لێ هاتووە ، یاخود بووە بە شەخسێکی بێ پەڕوّ و پالە ؟ هەرچەند ( دار ) و ( شەخس ) جیان لە یەك ، بەڵام چونکە ( شەخس ) بە ( دار )دا ئەناسرێتەوە ، نالی دارەکەی کردووە بە شەخس .

عەلەمداری (چن) و (ت) و (ك) و (مز) و (اح) و (من) : عەلەمدارە .

ئایا بە جەمع و دائیرەیە دەوری ( کانی با ) ،
یاخۆ بووە بە تەفریقەیی شۆڕش و نوشتور ؟! (٢٤)

( سەیوان ) نەظیری گونبەدی کەیوانە سەبز و صاف ،
یاخۆ بووە بە دائیرەیی ئەنجومی قوبتور ؟! (٢٥)

---

بەپێی ئەم نوسخانە مەعنای شیعرەکە ئاژادەیەك ئەگۆڕێ و ( شێخ هەباس ) ئەبێ بە ( موبتەدا ) و ( عەلەمدار ) کە بەپێی نوسخەکانیتر موبتەدا بو ، ئەبێ بە خەبەری دوهەم . هەباس (کم) و (گم) و (ت) و ( مز ) : عەباس . گەڕاوە ( عم ) و (کم) و ( گم ) و (من) : کراوە .

(٢٤) کانێ با : کانێ و سەراوێکە لەودیوی گردی سەیوانەوە سەیرانگای بەهارانی خەڵکی سولەیمانییە . نەزەرگەی شەخسێکیشە ئەڵێن چاك کردنەوەی باداریی گرتووەتە خۆی . شۆڕش : هەرا و هوریا . نوشتور : ڕۆژی قیامەت کە هەمو زیندووان ئەمرن .

واتە : ئاخۆ ئێستاش دەوری کانێ با خەڵکی تیا کۆئەبنەوە و بە دەوری کانییەکەدا ئەڵقە ئەبەستن بۆ شایێ و ڕابواردن و هەڵپەڕکێ ، یاخود خەلکەکەی بڵاوەیان لێ کردووە و وەك ڕۆژی قیامەتی لێ هاتووە کە هەرچی گیانلەبەر هەیە ئەمرن ؟

بە جەمع و ( عم ) و ( ت ) : بە جەمعی : تەفریقەیی شۆڕش و (عم) و (گم) و (ت) و (مز) : تەفریقەیی شۆڕشی . (کم) و (من) : تەفریقەوو شۆڕشی . (ك) و (تۆ) و (عب) : تەفریقەوو شۆڕش و .

(٢٥) سەیوان : گردی سەیوان : گردێکە لە بەری ڕۆژهەڵاتی سولەیمانییەوە ، ناوبانگی بە گۆڕستانەکەیەوە دەرچووە . وەك لە پارچە شیعرێکی (شێخ ڕەزا)وە دەرئەکەوێ لە سەردەمی بابانەکاندا جێگای ڕابواردنی میرەکان بووە. لەم شیعرەی نالیی خۆیشیەوە دەرئەکەوێ لە سەردەمی ئەویشدا هێشتا تاك‌وتەرا گۆڕی تیابووە. یەکەمجار هەر بابانەکان خۆیان،بە یادی سەردەمی زیندوێتیەتی ، کردیان بە گۆڕستان بۆ خۆیان و ئەوانەی لێیانەوە نزیك بوون و پاشان وردە وردە بوو بە گۆڕستانی خەڵکیش .. کەیوان : ئەستێرەی ( زوحەل ) کە بازنەیەکی زۆر ڕوناکی بە دەورایە و بووە بە نمونەی شتی زۆر ڕۆشن . ئەنجوم : جەمعی ( نەجم )ە واتە ئەستێرە .
واتە : وەك چۆن گومەزی شینی ئاسمان کە ئەستێرەی زوحەلی پێوە دیار بێ ، ئەستێرەیتری پێوە بێنمونە ، ئاخۆ گردی سەیوانیش هەروا

ئێستەش مەکانی ئاسکەیە ( کانیی ئاسکان ) ،
یاخۆ بووە بە مەلعەبەیی گورگ و لورەلور ؟! (٢٦)

---

سەوز و سافە وەك جاران و گۆڕی کەسی ـ دیارە لەبەر کەمیی گۆڕەکان ـ پێوە دیار نییە ، یاخود گۆڕی زۆری تیا هەڵکەنراوە و وەك ئاسمانی تاریکە شەوی لێ هاتووە کە ئەستێرەی زۆری پێوەبێ ؟

ڕەنگبێ مەبەستی نالی لەم شوبهاندنە ئەوە بوبێ جاران سەیوان گۆڕی تەنها چەند کەسێکی ناوداری تیا بووە وەك ئەستێرەی زوحەل بە ئاسمانەوە ، بەڵام پاشان بووە بە گۆڕستانێکی گشتی و خەڵکێکی زۆری لە زانایان و شاعیر و ئەدیب و پیاوچاکان تیا نێژراوە کە هەریەکەیان ، بەش بە حاڵی خۆیان ، لە مەیدانی خۆیانا ئەستێرەیەك بوون .

سەبز و ( عم ) و ( کم ) و ( گم ) : سەوز و .

(٢٦) مەکان : شوێن . کانی ئاسکان : کانی و سەراوێك بووە لە ڕۆژاوای سولەیمانییەوە ، ئێستا گەڕەکێکە . لە سەردەمی بابانەکاندا ، وەك لە شیعرێکی شێخ ڕەزاوە دەرئەکەوێ ، مەیدانی ڕمبازێ و پێشبڕکەی سوارێ بووە . مەلعەبە : گاڵتەجاڕ .

دوور نییە مەبەست لە ئاسکان کچانی شۆخی چاو جوانی شار بوبێ کە وەختی خۆی چوبنە سەر ئەو کانی و ئاوە و ، هەر بەو بۆنەیەشەوە شوێنەکە وا ناو نرابێ و کوڕانیش ئەو ناوەیان کردبێ بە مەیدانی گەڕان و ڕابواردنی خۆیان و ، هەر لەوەشەوە بابانەکان کردبێتیان بە مەیدانی ڕمبازیان. دیارە لاوانی پێشبڕکەکەر کە ببینن کچانی شۆخ لە نزیکیانەوە لەسەر ئاوەکە دانیشتوون ، گەرمتر ئەبن و ئارەزوی سەرکەوتنیان زیاتر ئەبێ .. جا لەوڕووەوە نالییش ئەپرسێ : ئاخۆ کانی ئاسکان هەروەك جاران جێگای کچە وەك ئاسك چاو جوانەکانە کەئەهاتنە سەر ئاو ، یا جێگای پێشبڕکەکەرەکانە کە وەك ئاسك تیژ ئەڕۆیشتن ، یاخود نەخەیر ، بە ڕۆژ بووە بە گاڵتەجاڕی ئەوانەی مەگەر تەنها لاسایی شۆڕە سوارانی بابانیان پێ بکرێتەوە و ، بە شەویش چۆڵ و هۆڵە و سەگ و گورگ تیا ئەلورێنێ . دووریش نییە مەبەستی لە گورگ سوپای داگیرکەری عوسمانی و لە لورەلور دەنگی بە گوێ ناسازی ئەوان بێ ..

ئەم شیعرە تەنها لە نوسخەی ( چر ) و (عم) و (کم ) و (گم)دا هەیە .
ئاسکەیە : ( عم ) و ( کم ) و ( گم ) : ئاسکە .

ئێستەش سوورشکی عیشقی هەیە ( شیوی ئاودار ) ،
یاخۆ بووە بە صۆفییی وشکی لە حەق بە دوور ؟! (٢٧)

داخو دەروونی صافە ، گوزەی ماوە ( تانجەرۆ ) ،
یاخۆ ئەسیری خاکە بە لێڵی دەکا عوبوور ؟ ! (٢٨)

سەیرێکی خۆش لە چیمەنی ناو ( خانەقا ) بکە
ئایا ڕەبیعی ئاهووە ، یا چایری ستوور ؟! (٢٩)

---

(٢٧) شیوی ئاودار : شیوێکە لە ڕۆژاوای باکووری سولەیمانییەوە بەلای سەرچناردا .

واتە : شیوی ( ئاودار ) وەك جاران فرمێسکی دڵداریی لە چاو ئەڕژێ ، واتە ئاوی پیا ئەڕوا ، یان وشکی کردووە وەك چاوی وشکە سۆفییە خوا نەناسەکان کە دڵۆپێ فرمێسکیان لە ترسی خوا لە چاو ناڕوا ؟ یاخود وەك وشکێ و بێدڵیی سۆفییە لە ڕاستێ دوورەکان وشکە ؟ بەگوێرەی مەعنای دوهەم ، شوبهاندنەکە شوبهاندنی مەحسوسە بە مەعقوول کە یەکێکە لە شێوە ناسکەکانی شوبهاندن .

عیشقی ( چر ) : ئەشکی :

(٢٨) تانجەرۆ : چەمێکە لە سەرچاوەکانی سەرچنارەوە پەیدا ئەبێ و ، لە داوێنی سولەیمانییەوە بە بناری چیای گلەزەردەدا بەرەو شارەزوور مل ئەنێ و لە ( دواوان )دا ئەڕژێتە سیروانەوە .

واتە : ئاخۆ تانجەرۆ کەسی هەیە گوێی بداتێ و هەمۆ ساڵێ جۆماڵی بکا و ، بە هێز و گوڕەکەی جارانیەوە ئەڕوا ، یا پڕ بووەتەوە و قوڕ و لیتە بەری گرتووە و لیخن بووە ؟

گوزەی ( عم ) : گوزی .

(٢٩) خانەقا : خانەقای مەولانا خالیدی نەقشبەندێ ، لە گەڕەکی (دەرگەزێن) کە مەحموود پاشای بابان دروستی کردووە . ڕەبیع : بەهار . گژ و گیای بەهار . ئاهوو : ئاسك : چایر : بەهاربەند . ستوور : چوارپێ .

نالی لەم پارچە شیعرە پڕ سۆزەیدا ، تا دێ میگناتیزی هەستی زیاتر بە شوێنێکی تایبەتییەوە گیر ئەبێ . وەك دیمان ( شارەزوور ) و ( شیوە سوور ) و ( سەرچنار ) و ئەنجا خوار و ژووری سولەیمانێ و پاشان سەیرانگاکانی دەور و پشتی و ڕووبارەکانی ، هیچ کامی لە هەستی بیر و

سەبزە لە دەوری گوڵ تەڕە وەك خەططی ڕۆیی یار
یا پۆشی وشك و زورە وەکو ڕیشی ( کاکە سوور ) ؟ (٣٠)

---

یادی خۆی بێبەش نەکرد . بەڵام بنیادەم هەرچەند بازنەی خۆشەویستییشی بەدەرەتان و گوشاد بێ و کەسان و جێ و شوێنێکی زۆر بگرێتەوە ، شتێك یا کەسێکی هەیە لە هەر شتێك یا لە هەر کەسێکی زیاتر هەڵاوێرێ و جێگای لای سەرۆی لە دڵیا بۆ ئەو تەرخان کردبێ . ئەگەر ئەو جێگایە بەش‌بەحاڵی نالی لە جیهانا کوردستان و لە کوردستانا سولەیمانی بۆبێ ، کە وایشە ، لە سولەیمانییشا خانەقای مەولانایە و وەك پاشتر دەرئەکەوێ ، لە خانەقایشدا بەتایبەتی ژوورەکەی خۆیەتی . بەم‌جۆرە وا ئەبینین نالی ئیتر قورسایی سۆز و پرسیار ئەخاتە سەر خانەقا و دوایی پرسیاری بە هەواڵ پرسینی ژوورەکەی خۆی دێنێ . لە خۆڕایی نییە لەم قەسیدە ٤٣ بەیتییەدا ١١ بەیتی بۆ خانەقا تەرخان کردووە و لە هەمو دیمەنێکی باری ئاوەدانی و کۆمەڵایەتی و سروشتی و خوێندەواریی ناو خانەقای پرسیوە ، لەگەڵ ئەوەشدا کە خانەقا لە بناخەدا شوێنی سۆفیگەرییە و نالییش هەرگیز دانوڵەی لەگەڵ سۆفیگەریدا پێکەوە نەکوڵاوە .

نالی لە سەرەتای پرسیاریا لە وەزعی خانەقا ، بە بای خۆش گوزەر ئەڵێ کە یەکەم جار سەرت کرد بە دەرگای‌حەوشی خانەقادا چیمەنەکەت ئەکەوێتە بەرچاو . دەسا جوان جوان لێی ورد ببەرەوە ، بزانە وەك جاران شوێنی گەشت و ڕابواردنی ئاسکە کە مایەی جوانییە بۆ چیمەن، یاخود هێستری چوار پەل قەویی تێ‌بەردراوە تیا ئەلەوەڕێن . . مەبەستی لەوەیە مەلا و خوێندەوار و ڕۆشنبیر و خواناسی ڕاستی تیایە ، یان پڕە لە کەسانی نەفام و تێ‌نەگەیشتو و لە ڕاستی دوور ، لەوانەی خوا پێیان ئەفەرموێت « اولئك کالانعام ، بل هم اضل » کە داگیرکەرانی ڕۆمن .
ناو (اح) : نێو .

(٣٠) زۆر : زبر . کاکە سوور : پیاوێکی پیری بەساڵاچو بووە لەو سەردەمەدا لە سولەیمانی . خۆی سوور بووە و ئەڵێن ناوی عەوڵا بووە ، ڕیشێکی تۆزێ درێژی هەبووە ، ڕیشی پیاوی سوور زەردکارە ، با سپییش بێ ئەو بەڵگەیە تیا هەر ئەمێنێتەوە* .

---

* علاءالدین سجادی ، دو چامەکەی نالی و سالم ، بەغدا ، ١٩٧٣ ، چاپخانەی مەعاریف ، ل ٥٤ .

قەلبی مونەووەرە لە حەبیبانی نازەنین ،
یا وەك سەقەر پڕە لە ڕەقیبانی لەندەهۆر ؟ (٣١)

---

واتە : سەرنجی گوڵەکانی حەوشی خانەقا بدە بزانە گیای سەوزی تەڕیان بەدەورایە وەك گوڵی ڕۆمەتی یار و مۆی زوڵفی بەدەوریا ، یاخود هەمۆی هەر پۆشی وشکی زەرد هەڵگەڕاوە وەك ڕیشە زەرد هەڵگەڕاوەکەی کاکە سۆر ؟

ڕێیشی تێئەچێ ( کاکە سۆر ) ئیشارەت بێ بە سەربازی عوسمانێ کە دەم و چاویان سۆر و مۆیان زەرد بووە .

سەبزە (عم) و (کم) و (گم) و (من) : سەوزە . تەڕە (مز) : پڕە . خەططی ( من ) : زوڵفی . زۆرە ( عم ) : زەردە .

(٣١) قەلب : دڵ . دەرۆن . ناوەوە . مونەووەر : نۆرانێ ، ڕۆناك . سەقەر : دۆزەخ . لەندەهۆر : چوارشانە و کەڵەگەت ، مەبەست لە کەسانیوایە ئەوەندە زەبەللاح بن خەڵك لێیان بترسێ .

واتە : ئاخۆ ناوەوەی خانەقا کەسانی خۆشەویستی نازداری تیایە کە ئەبن بە مایەی ڕۆناکێ بۆی ، وەك چۆن دڵی ئادەمیزاد بە یادی خوا ڕۆناك ئەبێتەوە ، یاخود پڕە لە کەسانی بەدکار و بەدفەساڵ و سیاچارە ، وەك دۆزەخ کە پڕە لە گوناهبار و پیاو خراپیوا ڕێگای چاکەیان لە خەڵك ئەگرت .

لە نوسخەکەی ( عم )دا ئەم شیعرە لەپاش شیعری ژمارە (٢٧)ەوەیە، بەڵام دیارە ئەوە هەڵەیە . سەرەڕای ئەوە کە لە هەمۆ نوسخەکانیترا بەمجۆرەیە کە ئێمە دامانناوە ، هەر ئەمەش لەگەل ڕێچکەی شیعرەکانا ئەگونجێ، چونکە ئەم شیعرە بۆ ئەوە دەسنادا باسی (شیوی ئاودار)بکا و، لەگەڵ باسی ( خانەقا )دا جۆرە .

لە وشەی ( قەلب ) و ( مونەووەر )دا لەطافەت هەیە ، چونکە باس باسی خانەقایە و دڵی نۆرانییش زیاتر پەیوەندی بە خانەقاوە هەیە . هەروا لە بەراورد کردنیشیا لەگەڵ (سەقەر) وردەکارییەکی جوان هەیە، چونکە خانەقا کە جێی خواناسییە ئەبێ وەك بەهەشت بێ و پڕ بێ لە حۆریی جوان ، نەك وەك دۆزەخ کەسانی گوناهبار و سیا چارە و خوێن تاڵی تیا بێ .

نازەنین ( « پەراوێزی » چر ) و (کم) و (گم) و (ك) و (عب) و (من) : نازدار .

دەس‌بەندیانە دێن و دەچن سەرو و نارەوەن ،
یا حەڵقەیانە صۆفییی مل‌خوار و مەندەبۆر ؟ (٣٢)

مەیلێ بکە لە سەبزە درەختانی مەدرەسە :
ئەوراقیان موقەددیمەیی شینە یا نە سوور ؟ (٣٣)

---

(٣٢) دەست‌بەند : دەستی یەك گرتن . نارەوەن : درەختێکی بەرز و گەورەی لق و پۆپ چڕی گەڵا وردە ، لە حەوشی زۆر لە تەکیە و خانەقاکانا هەیە بۆ سێبەر، بەری نییە . حەڵقە : کۆبونەوەی سۆفییەکان بۆ یادی خوا و پیرانی تەریقەت و بیرکردنەوە لـە مەرگ و قـەبر و قیامـەت ، لەگەڵ بەکارهێنانی وردە بەردی گـوێ چەمدا لەجیاتیی تەزبێح . مەندەبۆر : بەدبەخت .

واتە : ئاخۆ سەرو و نارەوەنەکانی حەوشی خانەقا لـە خۆشیدان و وەك لاوانی هەڵپەڕکێ‌کەر دەسـتیان گرتووە دێن و دەچن و لەسـەر ئاوازی شنە با سەما ئەکەن ، یاخود وەك سۆفییە کوڵۆڵەکان پەیوەندیان بە خۆشـیی ژیانـەوە نەمـاوە ، سـەریان کز کردووە و ملیـان خوار کردووەتەوە و بێ‌دەنگ و سەنگن ؟

مەندەبۆر ( مز ) و ( من ) : مەندەمۆر . ئەمیش هەر دەسکاریێ کراوی مەندەبۆرە .

(٣٣) ئەوراق : گەڵا . موقەددیمە . لای پێشەوە . قەراخ . سەرەتا .

واتە : لایەك بـە لای درەختە سـەوزەکانی لای حوجرەی فەقێکاندا بکەرەوە بزانە قەراخی گەڵاکانیان شینە یا سوور هەڵگەڕاوە . مەبەستی لەوەیە بزانێ درەختەکان خزمەتیان هەیە و ئاویان ئەدرێ یانە ، چونکە ئەگەر قەراخی گەڵاکانیان شین بێ، ئەوە واتە گەش و پاراون و نیشانەی خزمەت کرانیانە و ، ئەگەر سـوور هەڵگەڕابێ ، ئەوە سـەرەتای زەرد بونیانە و وائەگەیەنێ کەس گوێیان ناداتێ .

ئەشگونجێ مەبەستی لە درەختەکان مەلا و فەقێکانی مەدرەسە بێ و، مەبەستیشی لە ئەوراق ڕواڵەتیان بێ چونکە وشکێ و تەڕیی درەخت ، بەر لە هەرچی بە ڕەنگـی گەڵایدا دیـارە و ، مەبەستیشی لـە شـین خەفەتبارێ و لە سوور شایێ و خۆشێ بێ . بەم‌پێیـە مەعنای شـین و سوور لە هەرکام لە دوو مـەعناکەدا پێچەوانـەی ئەوی‌تریانـە و ئەمەش نیشانەی دەسەڵاتی شیعریی نالییە کە لە یەك شیعردا دوو وشە هەر یەکێ بە دوو مەعنای دژی یەکتر بەکاردێنێ .

حەوزی پڕی کە نائیبی دیدەی منە لەوێ ،
لێڵاوی دانەهاتووە وەك سەیلی ( شیوەسوور ) ؟ (٣٤)

ئێستەش کەناری حەوشەکە جێی باز و کەوشەکە ،
یاریی تیایە ، یا بووەتە مەعرەضی نوفوور ؟ (٣٥)

---

ئەوانەی شارەزای کتێبە دەستنووسەکانی جارانی حوجرەکان بن ، ئەزانن وشەی (مقدمه) و سەرباسەکان لە زۆر لەو کتێبانەدا بە مەرەکەبی سوور یا شین ئەنووسران . هەرچەند پەیوەندێك لەنێوان ئەم بە شین و سوور نووسینە و خۆشێ و ناخۆشیدا نییە ، نالێ هەر ویستوویەتی ئیشارەتێکیش بۆ ئەوە بکا . لە کۆکردنەوەی ( مەدرەسە ) و (ئەوراق) و ( موقەددیمە )شدا گەیاندنی جۆرە لەطافەتێکی مەبەست بووە .

بکە لە (چر) و (عم) و (مز) و (عب) و (من) : بکە بە . سەبزە (من) : سەوزە . (ك) و (تۆ) : دەکەی بە .

(٣٤) نائیب : جێنشین . سەیل : لافاو . شیوە سوور : یا شیوە سوورەکەیە کە پێشان باسمان کرد ، یا هەر شیوێکی کاتێ لافاو هاتنە کە قوڕاوی سووری پیا سەربکا .

واتە : حەوزە پڕەکەی خانەقا جێنشینی چاوە پڕ لە فرمێسکەکانی منە کە پڕن لە فرمێسکی ساف و ڕۆشن . جا ئاخۆ ئەویش ئاوی پاك و ڕۆشنی تیایە ، یا کەس گوێی ناداتێ و وەك ئاوی شیوە سوور قوڕاو و لێڵی تیایە ؟

لێڵاوی (مز) : لێشاوی .

(٣٥) کەنار : قەراخ . کەوشەك . باز : یاخود سێ باز : یارییەکە جاران فەقێ ، بەهاران و پایزان ، بە ڕۆژانی سێشەممە و جومعەدا ئەیانکرد . یارییەکە بەمجۆرەیە : کۆمەڵە هەرزەکارێك لە شوێنێکی نەرماندا سەرە ئەبەستن و ، شوێنی یەکەم پێدانان دیارێ ئەکەن و ، هەرکامیان بە گوڕ دێن ، لەو شوێن پێیەوە بەولا ، سێ بازی بەگوژم ئەبەن و ، بەوجۆرە بەردەوام ئەبن تا دەرئەکەوێ کێ لە هەموان زۆرتری بڕیوە و کێ لە هەموان کەمتری بڕیوە . ئەمەیان کە لە هەموان کەمتری بڕیوە ، دائەبێ و پشت دائەکا و ، ئەوانەی کە زۆریان بڕیوە بازی بەسەرا ئەبەن . پێشەنگەکەیان کە لە هەمویان زۆرتری بڕیوە و پێی ئەڵێن ئیمام، لە هەر بازێکی تازەیدا ، بگاتە هەر کوێ ، دابووەکە ئەگوێزێتەوە بۆ

چاوێ بخە لەسەبزەوو سێرابی دائیرە
جێ جیلوەگاهی چاوەکەمە نەرمە یا نە زۆر ؟ (٣٦)

---

ئەوێ ، تا یەکێکی‌تریان تواناى نامێنێ بە بازێك بگاتە لای دابووەکە و ، خۆی دائەبێ و ، دابووەکە ئەبێ بە ئیمام . کەوشەك : یاریەکی‌ترە یەك بازی تیا ئەبرێ و ، لەدوا شوێنی بازدا کەوشێك دائەنرێ . لەمیشا کێ لە هەموان کورت‌تری بڕێ دائەبێ و ، کێ لە هەمـوان زۆرتری بڕێ ، ئەبێ بە ئیمام و بەر لە هەموان بازی بەسەرا ئەبا . لەگەڵ هەر بازێکی ئیمامدا دابووەکە بە ئەندازەی کەوشێك ئەچێتە پێشەوە . بازدەر نابێ قاچی لە کەوشەکە بکەوێ . ئەگەر لێی‌کەوت خۆی دائەبێ . بازدانی کەوشەك لە هیی سێ‌باز گرانترە ، چونکە بە سینگە و باز ئەیبا و ، ئەبێ یەکسەر لەو شوێنەوە کە بۆ سەرەتای باز دیـارێ کراوە ، خۆی فڕێ بدا و ، تەنها دەستی لە پشتی دابووەکە بکەوێ و خۆی بەسەریا فڕێ بداتە ئەودیویەوە .

واتە : ئاخۆ ئیستاش قەراخی حەوشەکەی خانەقا وەك جاران جێگای سێ‌باز و کەوشەکی فەقێیانە و یاریی تیا ئەکرێ ، یا بووە بە پیشانگای دڵ لێ بێزران و حەز لێ نەکران و ، کەس ڕۆی تێ ناکا ؟ بەم شیعرەدا دەرئەکەوێ ئەو سەردەمە حەوشی خانەقا ئەوەندە گەورە بووە ، جێی تایبەتیی سێ‌باز و کەوشەکی تیا بووە و ، لەوانەشە مەبەست ئەوە بۆبێ فەقێکان هەرکاتێ ئارەزوی یارییان بۆ ، پێویست نەکا بچن بۆ دەرەوەی شار و هەر لە حەوشی خانەقادا ( وەرزش )ی خۆیان بکەن .

لە کۆکردنەوەی (حەوشەکە) و (کەوشەکە)دا جیناسی ناقیص هەیە .
باز و (کم) : بازی .
ئەم شیعرە و شیعری پێشەوەی لە نوسخەی ( من )دا بەر و دوان .

(٣٦) سێراب : تێراو . بەو چیمەنە ئەڵێن کە ئـاوی زۆری ئەدرێ بۆئەوەی هەمیشە گەش و تێراو بێ . دائیرە : بازنە ، دەوروبەر . جیلوەگـاه : جێگای دەرکەوتن و ورشەدانەوە . زۆر : زبر .

واتە : تەماشایەکی سەوزە و چیمەنەکەی دەور و پشتی حوجرەی فەقێکانی خانەقا بکە ، بزانە ئیستاش نەرم و سەوز و پاراوە و ئازیزانی تیا کۆئەبنەوە ، یاخود کەس گوێی نەداتێ و وشك بووە و بووە بە پۆشی زبر .

ئەم شیعرە و شیعری پێشەوەی لە نوسخەی (عب)دا بەر و دوان .
لە کۆکردنەوەی (چاوێ) و (چاوەکەم)دا لەطافەت و ، لە کۆکردنەوەی (نەرم) و (زۆر)دا طیباق هەیە .

توخوا فەضایی دەشتی فەقێکان ئەمێستەکەش
مەحشەر میثالە یا بووەتە ( چۆلی سەلم و تور ) ؟ (٣٧)

---

لە سەبزەوو (عم) : بە سەوزەوو . (کم) و (گم) و (تۆ) : لە سەوزەوو . ( ك ) و (ت) : لە سەبزەیی . ( مز ) : بە سەبزەوو . سێرابی ( عم ) : سێراوی . (کم) : سەیرابی . دائیرە (چر) : دائیرەی .

(٣٧) نەضا : تەختان . دەشتی فەقێکان : تەختانێك بووە لە سەرکارێز لە بەر گردی سەیواندا و تۆزێ بە لای گردی حاجێ ئەولاوە ، کەوتووەتە ڕۆژهەڵاتی شاری سولەیمانییەوە ، پردێکی بچکۆلەی دار هەبو لە شیوەکەی سەرقەبران ئەپەڕیتەوە ئەچۆیتە ناو دەشتی فەقێیانەوە . ئێستە شوێنەکەی هەمێ بووە بە خانێ . تا ساڵانی ١٩٤٠ ئەو باوە و ئەو ناوە هەبوە ، پاش ئەوە وردە وردە خانێ شوێنەکەی داگیر کرد * . فەقێ : کەسانێك بێن لە تەمەنی ١٠ ـ ١٢ ساڵانەوە حوجرەی تایبەتییان لە مزگەوتەکاندا هەبو ، زانستەکانی ئاینی ئیسلام و زمانی عەرەبی و هەندێ بابەتی فەلسەفە و ماتماتیك و ئاسمان شوناسییشیان ئەخوێند . تا پاش جەنگی یەکەمی جیهانیش بناخەی خوێندن و خوێندەوارێ لە کوردستانا ئەوان بێن. کە لە خوێندن ئەبێنەوە ، ئەبێن بە مەلا. لەناو ئەم مەلایانەدا زانای گەورە گەورە هەڵکەوتووە . دەوری گەورەی پەیدا بێن و گەشە پێدان و پاراستنی ئەدەبی کورد ئەم مەلا و فەقێیانە دیویانە . ئێستاش لە زۆر لای کوردستانا فەقێیەتی ماوە ، بەڵام زۆر ڕوی کردۆتە کزێ . سەلم و تور : دۆ کوڕی فەرەیدونی پادشای پێشدادێ بوون ، لەنێوانی خۆیانا بووە بە شەڕیان و لەو شوێنەدا کە شەڕەکەیان تیا کردووە کوشتارێکی گەورەیان لە یەکترێ کردووە و قەلاچۆیان خستووەتە یەك . ئێستا بە هەر شوێنێ وێران و چۆڵ بێ ، ئەڵێن بووە بە چۆلی سەلم و تور .

واتە : ئاخۆ ئێستاش دەشتی فەقێکان لەبەر زۆریی فەقێی یارێکەر و خەڵکی تەماشاکەر وەك دەشتی مەحشەر وایە و پڕە لە عەشامات ، یاخود نە یارێکەری تیا ماوە و نە تەماشاکەر و وەك چۆلی جێ شەڕی سەلم و توری لێهاتووە ؟ .

توخوا (عم) و (گم) : داخۆ . (ت) و (ك) : توخودا . فەقێکان (ت) و (ك) و (تۆ) و (مز) : فەقێیان . ئەمێستەکەش (عم) و (مز) : ئێستەکەیش .

---

* علاءالدين سجادی ، دۆ چامەکەی نالی و سالم ، بەغدا ، ١٩٧٣ ، چاپخانەی مەعاریف ، ل ٦٤ .

واصیل بکە عەبیری سەلامم بە حوجرەکەم
چیی ماوە ، چیی نەماوە ، لە هەیوان و تاق و ژوور ؟ (٣٨)

ئەو غاری یارە ئیستە پڕ ئەغیارە ، یا نە خۆ
هەر غاری یارە ، یا بووەتە غاری مار و مۆر ؟ (٣٩)

---

(٣٨) واتە : بۆنی خۆشی سەلام و هەواڵپرسیم لەگەڵ خۆت هەلگرە و بیبە و بیگەیەنە بە حوجرەکەم کە تیادا ئەژیام و ، بزانە هەیوان و تاق و ژووری چیی ماوە و چیی نەماوە ؟

وەك لە سۆزی شیعرەکانی پێشەوەی نالییەوە بۆ خانەقا ، دەرکەوت کەوا لەویٚ خوێندوٚیە و ڕەنگبیٚ هەر لەوێیش خوێندنی تەواو کردبیٚ ، لەم شیعرە و ( لە تێکڕای شیعرەکانیشەوە ) دەرئەکەویٚ کە پاش بۆن بە مەلایش خانەقای بەجیٚنەهێشتووە و نەچووەتە هیچ کوێیتر و ڕێ و شوێنێکی دیاریشی لەویٚ بووە،بەڵکو تا سولەیمانییشی بەجیٚهێشتووە هەر لەویٚ بووە و ، لەوانەیە ئەوەش بکەیەنن کە ژنی نەهێناوە.بەڵکەمان بۆ ئەم بۆچۆنانەمان ئەوەیە فەقیٚ تا فەقیٚ بیٚ ژووری تایبەتیی نییە و لەگەڵ فەقێکانیتردا پێکەوە ئەژین . نالییش هەواڵی ژوور و هەیوانی ژوور و تاقەکەی ئەپرسیٚ . کەواتە دیارە ئەم ژوورە ئەو ژوورە نییە لەگەڵ فەقێکانا تیا ژیاوە . هەروەها فەقیٚ کە بۆ بە مەلا ئەو مزگەوتە بەجیٚدێلیٚ کە تیا خوێندووە و ئەچێتە شوێنێکیکە و ژیانێکی نویٚ دەست پیٚدەکا ، کەچی نالیٚ سۆزێکی تەنانەت کەمیشی بۆ هەوارگەیٚ نوێی پاش خانەقای ، ئەگەر بۆبیٚ ، دەرنەبڕیوە . دۆریشە بڵێین پاش بۆن بە مەلا بووە بە مەلای خانەقا ، چونکە ئەو پرسیارەمان لیٚ ڕاست ئەبێتەوە : ئاخۆ مەلاکەی خانەقا چیی لیٚ هات ؟ هەروەها ئەگەر نالیٚ پاش بۆن بە مەلا و بەر لە چۆنە دەرەوەی لە کوردستان ، خانەقای بەجیٚهێشتبایە ، بەو هەمۆ سۆزەوە باسی لیٚ نەئەکرد ، ئەو هەمۆ سۆزە نیشانەی زامی نوێی لەبیرنەچووەیە .

هەیوان و (اح) : ئەیوان و .

(٣٩) غار : ئەشکەوت . ئەغیار : بێگانە . مۆر : مێرۆلە .

واتە : حوجرەکەم کە ئەوسا بۆ من و هاوڕێکانم وەك ئەشکەوتەکەی ( ثەور ) بو بۆ پێغەمبەر (د.خ) و ئەبۆبەکری هاوڕێیی ، ئیستا پڕ بووە لە بێگانە و کەسانی نەناس ، یا هەروەك جاران دۆست و برادەری

زارم وەکو هیلال و نەحیفم وەکو خەیاڵ !
ئایا دەکەومە زار و بە دڵدا دەکەم خوطوور ؟! (٤٠)

---

تیایە ، یاخود کەسی تیا نییە ، چۆڵ و هۆڵە و مەگەر مار و مێروولەی تیابێ ؟

نالی لەم پرسیارەیدا ئیقتیباسی لە بەسەرهاتی کۆچکردنی پێغەمبەرەوە کردووە لە مەککەوە بۆ مەدینە ، کە چۆن لەگەڵ ئەبوبەکردا ماوەیەک خۆیان لە ئەشکەوتی ( ئەور )دا شاردەوە تا کافرەکان دوور کەوتنەوە . هەروەها وشەی ( غاری مار )یش ئیشارەتە بەوە کە مارێک لەو ئەشکەوتی ئەورەدا پەنجەی ئەبوبەکری گەست .

لەنێوان (غار) و (یار) و (مار) و ، (مار) و (مۆر)دا جیناسی لاحیق و ، لەنێوان (ئەغیار) و (یار)دا طیباق هەیە . لە کۆکردنەوەی (غار) و (مار) و (یار)یشدا تەناسوب هەیە .

ئیستە (ك) : داخۆ .

(٤٠) زار : لاواز : دەم . هیلال : مانگی یەکشەوە . نەحیف : لەڕ . خەیاڵ : خەیاڵ کردنەوە . سێبەر . خوطوور : تێپەڕین .

واتە : لاواز بووم وەک مانگی یەک شەوە و ، وەک خەیاڵ یا وەک سێبەر لەڕ بووم . بشێ بەم لەڕ و لاوازییەشەوە کە نابم بە باری مەینەت بۆ سەرشانی کەس ، جێگەم لە دەمی کەسێکا نەبێتەوە ناوێکم بێنێ ، یا لە دڵی کەسێکا بیرێکم لێ بکاتەوە . ئەم بەیتەی نالی لە ڕیزی پێشەوەی شابەیتەکانی ئەم قەسیدەیەوەیەتی . شوبهاندنێکی بەرز و باڵای تیادا بەکارهێناوە . خۆی لەلایەکەوە تیا شوبهاندووە بە مانگی یەکشەوە لە زەردێ و بارێکی و چەماوەییدا . لە لایەکیکەشەوە خۆی تیا شوبهاندووە بە خەیاڵ واتە ماددەی نەماوە و ، لەم شوبهاندنەوە داوا ئەکا کە باسی بکەن و بیری لێ بکەنەوە ، چونکە باس کردن و بیر لێ کردنەوەی لەڕ و لاوازێکی وەک ئەو هیچی تێناچێ نە بۆ دەم و نە بۆ دڵ . *

هیلال (چر) و (ك) : خیلال . خیلال جەمعی خەللە ، گەلێ مەعنای هەیە . ئەوەیان بۆ ئێرە: دەس بدا پۆشێکی تایبەتییە بندداني پێ خاوێن ئەکەنەوە . ( تۆ ) و ( عب ) : ظیلال . ظیلال جەمعی ظیللە بەمەعنا سێبەر . زار ( تۆ ) : ڕاز .

* کاتێ بە کاکە حەمە و کاك فاتیحم سەلماند کە خیلال راستەو هیلال هەڵەیە ئەم لاپەڕە چاپ کرابوو،بەڵام لەسەرەتاکەدا راست کراوەتەوە بخیلال بە شتێ دەگوترێ کە ددانی پێ دا ژەنەوە و لە زار دەنرێ بەم جۆرە شیعرەکە هەم لە باری شکل و هەم لە باری محتواوە جوانتر دەبێ .

لەم شەرحی دەردی غوربەتە ، لەم سۆزی هیجرەتە
دڵ ڕەنگە بێ بە ئاو و بە چاوا بکا عوبوور ! (٤١)

ئایا مەقامی ڕوخصەتە لەم بەینە بێمەوە ،
یا مەصڵەحەت تەوەققوفە تا یەومی نەفخی صوور ؟ (٤٢)

حاڵێ بکە بە خوفیە : کە ئەی یاری سەنگ دڵ
« نالی » لە شەوقی تۆیە دەنێرێ سەلامی دوور ... (٤٣)

---

(٤١) هەرچی ژان و تلانەوە و سوێی نالی هەیە لـەم قەسیدەیەدا ، هەمووی گوشێنراوەتە پیاڵەی ئەم بەیتەوە . وا نەبێ ، زۆر زەحمەتە هونەرمەند بیر لەوە بکاتەوە دڵی ببێ بە ئاو و سەرکەوێ ، کە ئاو سەرناکەوێ ، و بە چاویا تێپەڕێ و بێتەوە بۆ نیشتمان ..

غوربەتە (کم) و (گم) و (من) : میحنەتـە . هیجرەتـە (گم) و (من) : غوربەتە . (ت) : دوور وەطەن . (مز) : حەسرەتە . ڕەنگە (کم) و (گم) و (من) : وەختە . (ت) و (مز) : وەقتە .

چاوا : لە هەمو نوسخەکانی بەردەستمانا ، نوسخەکەی ( من ) نەبێ ، (چاوما) بو . ئێمە ئەممان لا پەسەندتر بو .

(٤٢) ڕوخصەت : ڕێگادان . تەوەققوف : وەسـتان . چاوەڕوانێ . یەوم : ڕۆژ . نەفخ : فوو کردن . صوور : شاخێکە لە ڕۆژی قیامەتدا ئیسرافیلی فریشتەی مراندن و ژیاندنەوە دوو جار فووی پیا ئەکا . بە فووی یەکەم هەموو زیندووان ئەمـرێنێ و ، بە فووی دووهەم هەموو مـردووان زیندوو ئەکاتەوە .

واتە : ئاخۆ هەلی ئەوە هەیە لەم ماوەیەدا بێمەوە بۆ سولەیمانێ ، یا باشتر وایە لێی‌ڕاوەستین تا ڕۆژی قیامەت کە هەموو زیندەوەر لە سارای مەحشـەردا خڕ ئەبنەوە و ئێمەش لەوێ بە دیداری یەکتر شاد ئەبین و خوایش تۆڵەی لەیەك‌کردنمان لە بەدکار ئەستێنێ .

مەقامی ڕوخصـەتە : (عم) و (گم) : مەجالی هاتنە .

(٤٣) خوفیە : نهێنێ . سەنگ‌دڵ : دڵڕەق وەك بەرد .

واتە : بەدزییشەوە بە یاری دڵڕەق بڵێ : لە ئارەزوی دیداری تووەیە نالی لە دوورەوە سەلام ئەنێرێ .

ڕەنگبێ مەبەستی نالی لەم بە نهێنی هەواڵ و سـەلام بۆ یار ناردنە ئەوەبێ بیەوێ بڵێ ئەم پارچە شیعرەم بۆ مەسەلەیەکی گەلێ گشتی تەرخان کردووە کە سۆزی نیشتمانە و ، نامەوێ کاروباری تایبەتیی تێکەڵ ببێ .. خۆ ناشکرێ هەر بە یەکجارێ یارەکەی پشت گوێ بخا ، بۆیە وا بە ( با ) ئەڵێ بە دزییەوە وای پێ بڵێ ..

یاری (تۆ) و (عب) و (اح) و (« پەراوێزی » من ) : داری .

★ ★ ★

لە خوێندنەوەی ئەم نامەی نالییەوە بۆ سالم،بەئاشکرا بۆمان دەرئەکەوێ کەوا مەبەستی نالی تەنیا هەواڵپرسینێکی عادەتی و دەربڕینی سۆزی نامۆیەك نییە بۆ وڵاتەکەی . شـیعرەکەی شیـعرێکی سیاسییـە و ، لەبەرئەوەش کە بۆ وڵاتێکی ژێردەستەی ناردووە ، شێوەی (ڕەمز)ی تیا بەکارهێناوە . نالی لە هەر شیعرێکیا دوو پرسیار ئەکا.لە پرسیارێکیاندا باری ڕابوردوو دێنێتەوە پێش چاو و ئەپرسێ ئاخۆ وەك خۆی ماوە و،لە پرسیاری دووهەمیشدا بەرامبەرەکەی دائەنێ ، بەڵام بە لای خراپترا ، نەك بەرەو باشتر بوون ، چونکە ئەزانێ (باشتر) لە داگیرکەر چاوەڕوانی ناکرێ . ڕابوردوو لـەم شیعرانەدا سەردەمی حـوکمی (بەبە) و ، کاتی پرسیاریش سـەردەمی ڕۆمییەکانە . کەواتـە نالی لایەنگریی خۆی بۆ سەردەمی بابانەکان دەرئەبڕێ و ، ڕێ‌تێ‌چوونی خراپتربونی باری ژیانیش بۆ سەردەمی ڕۆمییەکان دائەنێ . ئەوەندەی کە بیری خۆشیی سـەردەمی پێشوو ئەکاتەوە ، ڕێ‌تێ‌چوونی ناخۆشییەکی گەلێ زیاتریش بۆ سـەردەمی ڕۆمییەکان ئەخاتە پێش چاو . تەنانەت پرسیار لە گۆڕانی گەلێ شتی‌وا ئەکا کە زۆر دوورە بە گۆڕانی ڕژێمی سیاسی بگۆڕێن .

وەك هەر ڕۆشنبیرێکی وریا و دووربین ، هەست بە پەیوەندی نێوان باری دەروونیی خەڵك و ڕژێمی سیاسی ئەکا. ئەمەش بەوەدا دەرئەکەوێ کە ئەپرسێ ئاخـۆ خەڵك زەوقەکەی جارانیان مـاوە و ، ڕابواردن و گەڕان و سـەیرانەکەی ئەوسایان هەر ئەکەن یا نە ؟ فـەقێ ئەچن بۆ یاریکردن و ، ڕمبازێ و غارغارێنی لاوان بـەردەوامە ، یا لە سایەی ڕژێمی ڕەشی ڕۆمییەکانەوە :هەموو شتێ سڕراوەتەوە ؟! شێوەی ڕەمز بەکارهێنانەکەشی ، وەك هۆیەك بۆ توانای دەربڕینی مەبەست لەگەڵ خۆ دەرباز کردنیشا لە چاوی زەق و گوێی قیتی خەفیە و جلخوارەکان، بە سەرەتایەکی زیرەکانەی دانانی جۆرێکی نوێی ئەدەب دائەنرێ لە زمانی کوردیدا . *

## قەسیدەی «مەستوورە»

**مەستورە کە حەسناوو ئەدیبە بە حیسابێ**
**هاتە خەوم ئەمشەو بە چ نازێك و عیتابێ ! (١)**

---

سەمع : گوێ لێ گرتن .

لۆلۆ : لوءلوء . لالا : لەءلاء ، تیشك‌دەرەوە .

واتە : دڵۆپە فرمێسکەکانی نالی بێ‌کەسن ، کەس (گوێ)یان ناداتێ و لێیان‌ناپرسێتەوە ، وەك دانەی مرواری لە چاوی دائەوەرێن و بەناو خاکا ڕۆئەچن . مەگەر گوێی پەسەند کردنی تۆ ، ئازیزەکەم ، گوێی لە گریانم بێ و بەزەیی پیاما بێتەوە و دەستێ بە چاوما بێنێ و دانەیەك لەو مرواریە گەشانەی فرمێسکم بەدەستتەوە بچێ و (بیکرێ) لێم . . .

**- ٢ -**

لەم پارچە شیعرەی نالیدا سەرەتای ئەدەبی ڕۆهەڵماڵراوی کوردێ بەدێ ئەکرێ کە تائێستاش داب و نەریتی کۆمەڵایەتی نەیهێشتووە جێگای خۆی لە ئەدەبیاتماندا بکاتەوە و ، شێخ ڕەزای تاڵەبانیی لێ دەرکەی کەسی‌تر ئەم ڕێگەیەی نەگرتووەتەبەر. هەروەها هەرچەند ناشتوانرێ ئەم پارچە بە پارچەیەکی (هەجو) دابنرێ، چونکە تێکڕا لە چوارچێوەی پیا هەڵوتن و شان و شکۆ پێدانا دارێژراوە، لە دیمەنێکی بەدناو کردن و ئابڕۆ بردنیش بێ‌بەش نییە ، نەخوازەلا کە بەرابەر بە یەکێ لە میرکچەکانی ئەردەلان وتراوە و ، ئەویش لەو کەم‌کەسانەیە ناویان بە شیعر و ئەدەبەوە دەرکردووە . بۆیە لەم ڕووەشەوە هەر بە پارچەیەکی ڕچەشکێن دائەنرێ و ، شێخ ڕەزا لەم مەیدانەشا بە قوتابیی قوتابخانەی نالی ئەدرێتە قەڵەم .

وتنی شیعریوا لەلایەن خوێندەوارێکی مزگەوتەوە و ، پتر لە ١٥٠ ساڵ بەر لە ئەمڕۆ و ، لە شارێکی لەڕادەبەدەر داب و نەریت ڕاگر و سەرپۆش لەسەری وەك سنەدا و ، بەرابەر بە میرکچێك ، نیشانەی چاونەترسان و بزێوێ و جەسارەتێکی بێ‌سنوورە لە نالییەوە و ، بەڵگەی ئەو ئاگری یاخی‌گەرییەیە لە سینەیدا کلپەی سەندبوو . بۆیە ، بە ڕای ئێمە ، ئەبێ لەم ڕووەوە بە چاوی ڕێز لێ‌گرتن و قەدر زانینەوە سەیری بکرێ و ، وادابنرێ شتێکی نوێ و گرانبەهای خستووەتە سەر گەنجینەی ئەدەبی کورد .

ڕازی بوونی نالی لە سنەدا و ، چی لەنێوان ئەو و ( مەستورە خانم )دا

ڕۆی‌داوە و ، ئەم قەسیدەیەی بۆ وتووە و ، چ‌ئەنجامێکی لێ وەشاوەتەوە، دیار نییە . ئەوەی لێمان ئاشکرایە تەنها ئەوەندەیە مەستوورە ناوی ( ماە شەرەف خانم ) و کچی ( ابو الحسن بەگ ) نـاوی لەلـەی شازادەکانی ئەردەلانە و لە ١٢٤٤ ی . ك ( ١٨٢٨ ـ ١٨٢٩ی . ز )دا خوسـرەو خان بە نیازی دڵدانەوەی ئەبولحەســەن بەگی باوکی مـارەی کردووە (*) . ئافرەتێکی شاعیر و ئەدەب پەروەر بووە .

جگە لە نوســخەکانی بەردەســتمان ، ئـەم پارچـە شـیعرەمان لـە کەشکۆڵێکی‌تریشا دیبەوە ، دۆستی خۆشەویستمان شـێخ موحەممەد عەلی قەرەداغی بە کۆڕی زانیاری کوردی فرۆشتبۆ . بۆ ئەم نوسخەیەش ئیشارەتی (کش)مان داناوە . ئەو کەشکۆڵە تەنها ئەم قەسیدەیەی نالیی تێدابۆ .

(چر) لەسەر ئەم قەسیدەیەی نۆسیوە : « جواب و سوئالی حەزرەتی نالی لەگەڵ مەستوورەی ژنی والی » . (گم)یش لەسەری نۆسیوە : « نالی لەو بەندی خوارەوەیدا پەلامارێکی زۆر ناشیرین و نازەوایانەی بردۆتەسەر بوێژی ناودار و وێژەوانی پایەبەرز کە ماە شەرەف خانم ( مەستوورە )ی کوردســتانیی خێزانی والیی سـنەیە (**) » . (ك)یش بە « قصیدەء احتلامیة » واتە : قەسیدەی شەیتانی بۆن ناوی هێناوە . لـە (تو)یشدا لەسەری نۆسراوە : « قصیدەء در تمدح مستورە حرم والی سنندج در زمان فقیهی درآنجا بخواب دیدەاســت ، این‌اســت فرمودە » . واتە : قەسیدەیەك لە پیاهەڵدانی مەستوورەی حەرمی والیی سنەدا لە سەردەمی فەقێیەتیدا لەوێ لە خەودا دیویە ، ئەمەتە فەرمۆیەتی » . لە (عب)یشدا لەسەری نۆسراوە: «قصیدەء کە در تمدح مستورە زن والی گفتەاست». واتە : ئەو قەسیدەیەی لە پیاهەڵدانی مەستوورەی ژنی والیدا وتۆیەتی . لە (اح)یشدا لەسەری نۆسراوە : « در خواب دیدن نالی رحمه الله احتلام بدختر شاە سنە ، بچە نوع گفتگو کردەاند » . واتە : لە خـەوا بینینی شەیتانی بۆنی نالی ، بەڕەحمەت بێ ، بە کچی شای سنــەوە ، چـۆنیان گفتوگۆ کردووە . (خا)یش لەسەر بەشی یەکەمی نۆسیویە « سوئال » و لەسەر بەشی دۆهەمی نۆسیویە « جواب » .

---

(*) آیت الله آقای شیخ محمد مردوخ کردستانی ، تاریخ مردوخ ، جلد دوم، صفحە ١٦١ ، بدون سال و محل طبع .

(**) بگەڕێرەوە بۆ ل ٦٨ ـ ٧٣ی ئەم کتێبە .

